# تەئریخی جاف

دانراوی

## کەریم بەگی فەتاح بەگی جاف

لێکۆڵینەوەی

**دوکتۆر حەسەن جاف**

پێشەکیی

**محەمەدی مەلا کەریم**

چاپی یەکەم

١٤١٦ ك – ١٩٩٥ ز

## سەرەتایەك

ئەو کەسەی بیەوێ شتێك دەربارەی مێژووی گەلی کوردو کوردستان بزانێت ، لە یەکەم هەنگاودا یەکەم کۆسپ کە پێی لێی هەڵدەکەوێ نەبوونی سەرچاوەی باشە دەربارەی ئەو مەبەستەی ، چ بە زمانی کوردی بێت یان زمانانی دیکە ، هەر لەبەر ئەمەیشە هەندێ نووسەری پشووقوول ، کە دەیانەوێ شتێك بۆ مێژووی کۆنی کورد بکەن بە ناو کتێبە مێژوویی یە گەورەکاندا دەگەڕێن و ، چییان دەربارەی باسەکە دەست بکەوێت کۆی دەکەنەوە .

ئەم دەردە سەختو کوشندە تا ماوەیەکی درێژ هەروا بەردەوام دەبێت و ، زانایانو لێکۆڵەرەوانمان بەدەستیەوە دەناڵێنن . خوالێخۆشبوو کەریم بەگی فەتاح بەگیش کە بیری لەوە کردوەتەوە شتێك دەربارەی مێژووی جاف بنووسێت ، ئەو تەگەرە گەورەی لەرێگەدا بووەو ، خەمبارانە دوای ئەوەی پێی هەڵکەوتوەو خەریکبوە نووچبدات ئاوا دەردی دڵی خۆی دەربڕیوە :

« بۆ موحافەظەی تێکنەچوونی ئیستیقلالی بابان زۆر بەگزادە لە بەگزادەکانی جافو پیاوی چاکی جاف کوژراونو ، بەم رەنگە رۆییونو ، خۆیان فیدای وەطەنی کورد کردوەو ناویشیان نیە ، ئەمەش بە واسیطەی ئەمەوەیە کە ئومەراو پاشاکانی کورد موبالاتیان بە تەئریخی کورد

نەکردوەو ، تیکرار ئەینووسمو بەیانی دڵگیریی ئەکەم کە رابوردووی هەموو میللەتێ ئەچێتە عەوری تەئریخەوە ، ئەمما رابوردووی کوردی بێچارە چۆتە ژێر خاكو خۆی بێ تەئریخیوە • ئەکەنا ئەتوانم بنووسم بۆ موحافەظەکردنی ئەم خاکە ئەمەی بابانە نیوەی میللەتەکەی خوێنی خۆی رژاندوەو ناویشیان نیە ! » •

کەریم بەگ بەم پێزانینەوە کە خاوەنی ئەو هەستو سۆزەیش بوە ویستوویەتی هەستەکەی بە هەناسەهەڵکیشانی رووتو دەستەوسانیو دەستەوئەژنۆ دانیشتنەوە نەباتەسەرو ، بەوەی پێیدەکرێ شتێك بکات • ئەوەتا هاتوە - با کەمو بچووکیش بێت - گەوهەرێکی گرانبەهاو ملوانکەیەکی مرواریی دوای خۆی بە یادگارێکی زیندەو نەمر بۆ بەجێهێشتووین • یادگارێك ، ئەگەر لە صەدانو هەزارانی زاناو رۆشنبیرانی پێشوومان یەکێکیان - هەرکەسەو لەبواری خۆیدا - کارێکی وای بکردایە ئێستە شتێکی دی دەبووینو ، ئێمەیش وەك گەلانی خوداپێداوی جیهان خاوەنی سەروکلاوی خۆمان دەبووین •

خوالێخۆش بوو کەریم بەگی جاف هاتوە نووسینی مێژووی جافی هەڵبژاردوە بۆ ئەوەی وەك یادگارێکی شاداری بابەتی خۆی بمێنێتەوەو ، پشتاوپشت یادی بکرێتەوەو ، ریزی زیاتر ببێت •

ئەگەر بمانەوێ بەکورتیی لە بایەخی ئەم کارە شاکارە بدوێین بایەخی سەرەکیی لەوەدایە پیاوێکی شارەزای کارامەی بەتەنگاوەهاتوو لە بوارێكدا، کە خۆی شاسوار بوە تێیدا ، ئەسپی بیرو قەڵەمی ژێری لنگدا وەو ، ئەنجامەکەی (تەئریخی جاف) بوە ، تەئریخێك کە نووسراوی دەستی پیاوێکی قاڵبووی ناو دیوەخانو رەشدەواری جافو ، گەڕیدەو دنیادیدەی بەهارو پایزو گەرمیانو کوێستانکەری ئێرانو عێراقەو ، هەرچی نووسیوە یان خۆی دیویەتیو تیا ژیاوە ، یان وەك تەواتور دەماودەم چەندین جار لە کۆڕو دیوەخاناندا بۆی گێڕراوەتەوەو بوە بە بەشێکی بیرو هۆشو هەستی •

ئەوەتا دەبینی کە گەرمیانو کوێستانت پێدەکات هەر ئەوەندەی لە تۆ دەوێ کە شوێن فەلەمەلەی بکەویو بەس ، ئیتر ئەو لە قەرەتەپەوە بیگرە بە دەشتی لرکو کاکیی بەکاکیی گەرمیاندا دەت باو خال بە خالو نوختە بەنوختە ، وارگەبویری ناکات تا لەلەلی پەیکولیی ، یان سەگرمە ، یان هەر نوختەیەکی دیکەوە ئاوات دەکاتو ، رێگەی خێلەکانت یەکە-یەکە نیشاندەداتو ، گشتیان دەباتە ئێرانو ئەردەلانو وارگەو لەوەرگەو بەهارخۆریو هەوارەو هەواری ئەویشت بۆ دەنووسێ !

یان کە دێتە سەر هەلدانی ناوی سەرەك هۆزو خێلەکان بە ناوی خۆیانو باوباپیرو بنەچەیانەوە ناوی ئەو صەدانو هەزارانەی لەبیر ناچێت ..

هەروەها هەر فەصلێك لەو سیازدە فەصلەی کە نووسیویەتی ئەوەندە وردو شارەزایانە نووسیویەتی لەوە چاکترو باشتر نانووسرێت . ئەمانەیش هەمووی بێ ئەوەی کتێبێکی لەو بابەتەدا خوێندبێتەوە ، یان کەسێك پێش ئەو شتێکی وای نووسیبێ .

ئەمە بە تەنها بەسە بۆ ئەوە ئەم کتێبە لە بواری خۆیدا وەك شاکارێك بچێتە ناو مێژووی کوردەوەو ، بەردی بناغەی ئەم لایەنەی مێژووی گەلی کورد بێتو نەوەکانی دوای ئەو لێی زیاد بکەن .

خۆ ئەگەر لە کاتی خوێندنەوەیدا هەست بە هەندێ لاوازیی لە رووی دارشتنو رستەسازییەوە بکرێت ، ئەوە تێروتەسەلیی ناوەرۆکو ، پوختو دروستیی زانیارییەکانیو ، بەبرشتییو بەپێزیی تۆمارکردنی رووداوەکانی ئەو لاوازییە لەبیری خوێنەر دەبەنەوە .

لەگەل ئەوەدا ـ وەك گوتوومە ـ کە ئەم کتێبە لەسەرنووسینی زۆر هەلدەگرێتو ، لەمەوولا دەمەتەقێی لەسەردەکرێت ، ئێستە ئەوەندە دەلێم: ئەگەر بە وردیی سەرنجی ناوی تیرەکانی کۆنو نوێی جاف بدرێت لەوانەیە چەند تیرەیەك ناویان لەم کتێبەدا نەبێت ، وەك تیرەکانی : گورگ کوشو ،

قەڵخانچكو ، ئیلیاسییو ، گاخۆرییو ، داراو ، بیبانییو ، خێڵی صۆفیو ، گشکیو ، یوسف یارئەحمەدیی (یوسوور ئەحمەدیی) ، هورمزیارو ، زەهاوییو ، دارخۆرو ، کافرۆشییو ، چنگنییو ..

منیش کە ئەم کتێبەم دۆزی‌یەوە چیم‌کرد ؟ بێ‌گومان نووسەری ئەم کتێبە کە خاوەنی ئەو بیرو هەستە پیرۆزو دڵسۆزی‌یە کەم وێنەیە بوویێت ، ئاواتی گەورەیشی ئەوە بوە رۆژێ لە رۆژان کتێبەکەی بگاتە دەست خوێنەرانی کوردو ، وەك دەڵێن : (ماڵو پیاوی شارەزوور) تا (ماڵو پیاوی کورد) دانەیەکی لە کتێبەی هەبێتو ، مێشکیان بە زانیاری‌یەکانی زاخاو بدەنەوەو ، شتێك لە رابوردووی بەشێك لە گەلەکەیان بزانن . جا بۆ هێنانەدیی ئەم‌ئاواتەو ، خزمەتێك بە مێژووی گەلی کورد لەم دەرفەتەدا ئەم کتێبە ـوەك خۆی ـ وەك بەڵگەنامەیەکی مێژوویی ، دوای ئەوەی بە رێنووسی باوی ئەمرۆی کوردی نووسیمەوە .. پێشکەشی کتێبخانەی کوردیی ئەکەم .

گومان لەوەدا نیە ئەم کتێبە کەلێنێکی گەورە لە کتێبخانەی کوردی‌دا پڕدەکاتەوەو ، لەمەولا سوودی باشی لێ‌وەردەگیرێو ، سەرچاوەیەکی دروستو جێگەی متمانەی کاری ئەمەولای ئەو کەسانە دەبێت دەیانەوێ شتێك بۆ مێژووی گەلی کورد بکەن . جگە لەوەیش ئەم کتێبە جێگەی دەمەتەقێو قسەوباس دەبێتو ، لە فرە لاوە لەسەر نووسین هەڵدەگرێت . بەڵام ئێمە لەم دەرفەتەدا تەنها کتێبەکە دەبووژێنینەوەو گیانی پاکی نووسەرە دڵسۆزە بەرێزەکەی لە ئارامگای هەمیشەیی‌دا بەوە شاد دەکەین کە بەرهەمەکەی لە چنگی مۆتەکەی لەناوچوون رزگار دەکەینو بڵاوی‌دەکەینەوە .

لێرەدا ئەوەندە نابوێرم کە دۆزینەوەی کتێبێکی ئاوا بەڵگەی زیانی قەرەبوونەکراوەیە لەگەڵەکەمان ، چونکە پیاوێکی وەکوو کەریمبەگ کە ماوەیەکی زۆر نییە ماڵئاوایی لە جیهان کردوەو ، لە ژیانی خۆیدا بەدەستەڵاتو دەستڕۆیشتوو بوەو ، مەبەستیشی بوە رەنجەکەی بەفیڕۆ نەڕواتو ، دوای خۆیشی ماڵو شوێنەواری پارێزراوەو ، نەوەکانیشی خوێندەوارو رۆشنبیر بوون ، کەچی ئەم کتێبە بەنرخەی ، کە یادگاری گەورەی بوە بۆ گەلەکەی ، بەو دەردە چوە کە تا ئێستە سەرو سۆراخی نەکراوەو ، لەوانەیش بوو بۆ یەکجاریی سەری تێدابچێت ئەگەر ئەو رێکەوتە نەبوایەت کە ئەم دەستخەتەم تێدا دۆزییەوە ! جا ئەمە حاڵی ئەم کتێبە بێت دەبێ مەلایەکی هەژاری بێدەرامەت کە ٢٠٠ـ٣٠٠ ساڵ یا زیاتر لەمەوپێش لە کوێرەدێیەکی چەپەکی دوور لە ئاوەدانیی کوردستاندا ژیابێت ، هاتبێ بەرهەمێکی باشی بەسوودی بۆ گەلو وڵاتەکەی نووسیبێ ، کە بەهەزار ناری عەلی کاغەزو مەرەکەبی نووسینەوەی نوسخەیەکی دەستکەوتبێتو ، نوسخەکەیش لەژیانیخۆیدا بڵاونەبووبێتەوەو ، دوای خۆیشی دەست بێوەژنێکو دوو سێ زەڕنەقووتەی سەلکەوپێچکە کەوتبێت •• دەبێ چی لێچاوەڕوان بکرێت ؟ گومانیش لەوەدا نیە لەم بابەتانەمان زۆر بوە •

**ئەم دەستخەتە چۆن دۆزرایەوە ؟**

ئەم پیاوە ـخوالێخۆشبوو کەریمبەگ ـ پیاوێکی وردبینو دووربین بوەو ، بەپارێزەوە بۆ شتی روانیوە ، هەر ئەو پارێزو دووربینییەیشی ئەم کتێبەی لە چنگی لەناوچوون ـکە دەیانو صەدان بەرهەمی کۆنو نوێی زانایانی کورد بەقوڕگیدا چوون ـ پارازتوە • چونکە ـوەك دەحەسەنی کوڕی دەڵێت ـ کاتی خۆی کە ئەم کتێبەی داناوە چوار نوسخەی لێ نووسیوەتەوەو ، بۆ لای پیاوانی رێزلێگری ئەم جۆرە شتانەی ناردوون ،

کەچی هێشتا لەم ماوە کەمەدا خەریك بوە ئەمانیش تێدابچنو ، تەنها ئــەم دانەیان ـ کە تا ئێستە زانرابێت ـ بە پەلەقاژە قوتاربوە •

خوالێخـۆشبــوو نوسخەیــەك لــەو چوارەی بـۆ لای مێژوونووسی بەناوبانگ خوالێخۆشبوو عەباس عەزاویی ناردوە • ئەمیش بـەداخەوەـکە خۆی نەخۆشیی کەنەفتی کردوەـهێشتا لە ژیانداو لە سەر نوینی نەخۆشیو پەککەوتەیی‌و سەرەمەرگ بوە، نەوەکانی دەستیان خستوەتە لیبجانەلەیی‌و پرژوبلاویان کردوەتەوە ، لە پاشماوەی ئەو کتێبانەو ـدیارە دوای چەنــد کەوو بێژنگێك‌ـکۆمەڵێ شڕەوپڕە ماونەتەوە راجیحەخانی کچی‌ـکاری راست بێت ـ لە باتی ئەوەی بیاندا بە دەمی گڕی ئاگرەوە هێناونی بۆ (دار صدام للمخطوطات )و ،لە ناو ئەوانەیش‌دا (تەئریخی جافی کەریم بـەگ) بـوو ؛ بەڵام کە هاتبوە ئەوێ بێ‌ناوونیشانو بێ‌نازو ناو لە سـەری نووسرابــوو (مخطوط ترکی •••)و ئەگەر ئەم گەشت‌وگێڵەی من نەبوایـە لەوانە بـوو ـهەر هیچ نەبێ‌ـ تا ماوەیەکی دوورو درێژ هەواڵێك لەم یادگارە نەبوایەت •

ئەم نوسخەی بەردەستیشمان پەڕەی یەکەمی کەوتوەو هەندێـك لـە پێشەکی‌یەکەی دانەر تێداچوە •

دوایی کە بەڕێز حەمەسەعیدبەگی جاف نموونەی ئەم دەستخەتەی بینی ئاگاداری کردمەوە کە ئەمە خەتی رەزابەگی جافەو ، ئەم پیاوەیش ساڵی ١٩٤٠ کۆچی دوایی کردوە • واتە دەبێ ئەم دەستخەتە پێش ئەو مێژووە نووسرابێتەوە •

ئەم دەستخەتە لە(دارصدام للمخطوطات)دا بە ژمـارە ( ١٤٢٧٠ ) پارێـزراوە •

دەمێنێتەوە ئەوە بڵێم ـکەزووتریش ئیشارەم بۆ کرد ـ دانەری ئـەم کتێبە مێژووی گێڕاوەتەوەو ، شێوازی ئەدەبیی لە گێڕانەوەکەدا بەکـار ـ

نەهێناوەو ، جارجاریش دووچاری ئاڵۆزیی‌و لاوازیی لە دارشتن‌دا بوەو ، کەم‌کەمیش لەبیرچوونی هەیە • ئەوانەم وەك خۆیان نووسیوەو چەند جارێك، لە پەراوێزەوە ـبۆ نموونەـ هەندێك لەو کەم‌وکووڕییانەم دیاریی کردوەو ، ئەوانی دیکەیشیم داوەتە دەست هەست‌و بیرو شارەزایی خوێنەر •

دەبێ ئەوەیشم لەبیرنەچێت کە دانەری ئەم کتێبە ناوی دەیان گوندو شاخ‌و کانیاوو ملەو هەڵەت‌و ••• هێناوە ، ئەو ناوانەیش گەرمیان‌و کوێستانی ئێران‌و عێراقیان گرتوەتەوە ، خۆشبەختانە لەگەڵ بەشێکی زۆری ناوی ئەو شوێنانەی گەرمیان‌و سەنگاوو قەرەداغ‌و شارەزوور ، شارەزا بووم‌و ، هەندێکیشیانم لە شارەزایان پرسی‌و ، بە تایبەتیی حاجی ئیبراهیمی شاتریی گەلێ شوێنی پێ‌وتم‌و ، یارمەتیی‌دام لەوەدا ناوەکان بە گوێرەی رێنووسی ئێستە بە دروستیی بنووسم ، خودا لەشی ساغ‌و تەمەنی درێژی پێ ببەخشێت • هەرچەند هێشتا چەند ناوێکیشم وەك پێویست بۆ ساغ نەکراوەتەوە •

**محەمەدعەلی قەرەداغی**

# لێکۆڵینەوەیەکی « تەئریخی جاف »

ئـەم کـوردە کـە لە لاپەڕەی مێژووی دێرینیـدا بـەو ناوەوە کـە نەتەوەیەکە ناسراوە • بێگومان کورد لە چەند هۆزو ، تیرەو ، خێڵو بنەماڵەو خێزان پێکهاتوە ، بەمانەو بە مەرجەکانی تری نەتەوە ، وەك بوونی مێژووی هاوبەشو ، سەرزەمینێکی ناسراو کە ولاتیان بێو ، ئابووریی هاوبەشو ، هاوقازانجییو ،•• چەند مەرجێکی تریش •• بنچینەی بوونی نەتەوایەتیی بۆ خۆی چەسپاندوە کە پێی‌دەڵێن ( نەتەوەی کورد ) •

بۆ زیاتر شارەزابوون لە نەتەوەی کـوردو ، زانینی مێژووی گـەلی کورد پێویستمان بە شارەزابوون لە تیرەکانی کورد هەیەو ، هۆزێك لـە هۆزەکانی گەلی کوردیش هۆزی ناسراوی جافە ، کە یەکێکـە لە هـۆزە سەرەکییەکانی میللەتی کورد ، کە مێژووی پڕ لەشانازیی ئەم میللەتەیـان پێکهێناوە •

ئاشکرایە زانینی مێژووی هۆزی جاف دەبێتە بەڵگەنامەیەکی شایان کە مێژوونووسان لە داهاتوودا سوودێکی باشی لێوەربگرن بۆ نووسینی مێژووی میللەتی کورد ؛ چونکە ئەوانەی ئەیانەوێ دەربارەی گەلی کـورد شتێ بزانن‌و تۆماری بکەن لە یەکەم‌هەنگاودا یەکەم کۆسپ کە پێیان لێی هەڵدەکەوێ نەبوونی سەرچاوەیەکی باشە دەربارەی گەلەکەیـان • ئـەم

دەردە سەختە کوشندە تا ماوەیەکی درێـژ هـەروا بـەردەوام دەبێـتو ، نووسەرانو لێکۆڵەرەوانو رۆشنبیران بەدەستیەوە دەناڵێنن •

بێگومان یارمەتیدەری نووسەران بۆ زاڵبوون بەسەر ئەو کۆسپانەدا یاداشتو نووسینی پیاوەناسراوەکانی میللەتی کوردە کە لە قۆناغێکـــی تایبەتیی مێژووی گەلەکەمـاندا نووسـراون • ئەم جـۆرە نووسراوانـە یارمەتیەکی شایانـی رۆشنبیرانو زانایانـی میللـەتی کـورد ئـەدەن بـۆ باشترلێکۆڵینەوەی مێژووی کۆمەڵایەتیو سیاسییو ئابووریی میللەتەکەیان، چونکە نووسین لەسەر هەر بابەتێکی سیاسییو کـۆمەڵایەتییو زانسـتیی پێویستیی بە چەند گەڕانەوەیەك بەرەودواوە هەیە بۆ بنەوانی مەسئەلەکەو رای مێژوو بەڵگەی باوەڕپێکـراوی نووسراو ، یـان قسـەی ریشسپییو پیاوە بەتەمەنەکان ئەگەر رووداوەکە دوور نەبێت ، چونکە بەم جۆرە لـە حەقیقەتی مێژوویی نزیك ئەبینەوەو غایەی مێژوویش گەیشتن بەحەقیقەت بەولاوە شتێکی تری تێدا وەدەر ناکەوێ •

خوالێخۆشبوو کەریمبەگی جاف ١٨٨٥ ـ ١٩٤٩ یەکێ لەو پیـاوە ناسراوانەیە کە دەربارەی مێژووی هۆزی جاف نووسراوێکی بەنرخی بـۆ بەجێهێلاوین • ئەوەی شایانی باسە ئەم نووسراوو یاداشتانە بوونە مایەو کەرەسەی نووسراوی زۆربەی مێژوونووسەکانی وەك خوالێخوشبووان : محەمەد ئەمین زەکی بەگو ، عەلادین سەجادیو ، عەبـاس عەزاویـیو ، هەندێ لەمێژوونووسانی تر کە لەم دواییەدا لە مێژووی کورد دوواون •

کەریمبەگی جاف (تەئریخی جاف)ی بە چوار نوسخـە نووسیبـووەوە : یەکەمیان : لای مستەفابـەگی کـوڕی بـوو ، لە رووداوەکـانی ١٩٦١دا لەناو چوو •

دوەمیان : لای حەسەن فەهمیجاف بوو •

سێیەمان : لای مێژوونوسی کورد ئەمینزەکی بەگ بوو • کە باسی

جافی له کتێبەکانیدا نووسیوه پەنجەی بۆ نووسینەکەی کەریم بەگ ڕاکێشاوه •

نوسخەی چوارەم : لای خوالێخۆشبوو عەباس عەزاویی بوو •

بەنده له وتارێکدا به سەردێڕی دۆزینەوەی هەندێ یاداشتی ونبوو بەشێ لەو یاداشتانەم له کتێبخانەی حەسەن فەهمی جافدا وەچنگ کەوت و بڵاوم کردەوە[1] •

لەو وتارەدا هیوام دەربڕی که نوسخەیەکی تەواومان دەست کەوێت و له هەلێکا پێشکەشی خوێندەوارانی کوردی بکەین ، چونکه ئەو نووسراوه بەنرخه یادگارێکی گەورەی باوکم بۆ مێژووی گەلی کورد بوو •

له ڕاستیدا ئەگەر هیمەتی دۆستی بەڕێز مامۆستا شێخ محەمەدعەلی قەرەداغی نەبوایه لەوانەبوو هەتا هەتایه بەدەست نەکەوتایەو ، ئەم بەرهەمه له کیسی میللەتی کورد بچوایه • بێگومان دۆزینەوەی ئەم نووسراوه لەلایەن شێخ محەمەدعەلی قەرەداغییەوەو ، خستنه سەر ڕێنووسی باوی کوردی کارێکی بەنرخەو جێی سوپاس و پێزانینه •

شایانی باسه دانەری ئەم کتێبه مێژووی گێڕاوەتەوەو ، شێوازی ئەدەبیی له گێڕانەوەکەدا بەکارنەهێناوەو جارجاریش دووچاری ئاڵوزیی و لاوازیی له داڕشتنی نووسینەکانیدا بوەو ، کەم کەمیش هەڵەی مێژوویی تێدا دەبینرێ ، چونکه ناوبراو سەرچاوه فارسیی و تورکیەکانی چنگ نەکەوتوه بۆیه دووچاری ئەو هەڵانه هاتوه •

بەنده هەوڵ ئەدەم له لێکۆڵینەوەی ئەم کتێبەدا دەست بۆ ئەو هەڵانه ڕاکێشم و ، بەگوێرەی توانا تێبینیەکانم تۆمار بکەم ، بەهیوای ئەوەی

---

(١) بڕوانه : ڕۆژنامەی (العراق) ژماره ٢٧٦٧ چوارشەمه ٦ی ئازاری ١٩٨٥ •

سوودمەند بن • بێگومان ئەم هەڵانەو ئەو لاوازیە کەمانە لە رستەسازیدا نابنە هۆی کەمکردنەوەی نرخی بەرزی ئەم بەرهەمە ، چونکە تێرو تەسەلیی ناوەرۆکو ، پوختو دروستیی زانیاریەکانی ئەو لاوازییانە لە بیری خوێنەر دەبەنەوە •

کەریم‌بەگی نووسەری ئەم کتێبە دڵسۆزی هۆزو میللەتەکەی بوەو ، ئاواتی گەورەی ئەو بوە رۆژێ لە رۆژان کتێبەکەی بگاتە دەست خوێنەرانی کورد • جا بۆ هێنانەدیی ئەم ئاواتەو خزمەتێك بە مێژووی گەلی کورد ، لەم دەرفەتەدا ، بە یارمەتیی مامۆستا شێخ محەمەدعەلی قەرەداغی ئەم کتێبەمان بەرێکوپێکیی وەك بەڵگەنامەیەکی مێژوویی پێشکەش بە کتێبخانەی کوردی کرد •

گومان لەوەدا نیە ئەم کتێبە کەلێنێکی گەورە لە کتێبخانەی کوردیدا پڕدەکاتەوەو ، لەمەودوا سوودی باشی لێ وەردەگیرێو ، ئەبێتە سەرچاوەیەکی دروستو جێگەی متمانەی مێژوونووسانی کورد •

بێگومان ئەو نەتەوانەی مێژوویێکی هەژارو لاوازیان هەیە دەبێ رۆڵەکانیان هەوڵو تەقەلا بدەن مێژووی نەتەوەکەیان لە هەموو روویەکەوە تێروتەسەل بکەن • ئێمەی کورد ناڵێین مێژوەکەمان لاوازە ، بەلام زۆریش بەسامان نیەو ، پێویستمان بە کۆششو هەولێکی فراوانو بەربلاوە کە نەخشی هەر مرۆڤێکی هەڵکەوتووی کورد لەهەر چینێك بێ ، لەهەر رشتەیەکدا هەڵکەوتبێ ، بخەینە بەرچاوو پێیدا هەڵدەینو گەورەی بکەینو ، پتر رەنگو رووی ئاشکرا بکەین •

بەڵام بەداخەوە ، هەر وەك مامۆستای بەرێز مەسعوود محەمەد دەڵێ ، رۆشنبیری کوردی سەردەم وەها لەبەر زمانی خۆش‌دێت هەڵنانو رێزلێنان بۆ مرۆڤی بێ‌سامانو رووت‌وقووت بێ ، رقی لە شۆرەتی پیاوانی خاوەن‌سامانو دەسەڵات هەڵدەستێت ، حاڵ گەیشتۆتە ئەو بارەی رۆشنبیرە

نەوباوەکانمان بە نووسینی بێ پێچوپەنا هەموو سەرۆك شۆڕشەکانی لەمەوپێشی کورد سەرکوت‌و تاوانبار دەکەن ، ئاشکرایە ئەو کوردەی بە چاوێکی سووکەوە بڕوانێتە گەورەپیاوانی میللەتەکەی خۆی بەهەلەدا چوە ، چونکە ئەوەی ڕێز لە گەورەپیاوانی نەتەوەکەی نەگرێ بەهیچ جۆرێ نیشتمانپەروەر نیەو ، شۆڕشگێڕو خەباتگێڕانی میللەتانی تریشی خۆش ناوێ • ئەمجا برا سەیرێکی دڵو دەروونی خۆت بکەو ، خورتەی هەناوت بەعەیارە دابنێ بۆ بەرتەك ( رد فعل)ی ئەو خەبەرەی کە لە بارەی داخوازیی مەردایەتیی دەرەبەگێکی ۲۰۰-۳۰۰ساڵ لەمەوپێشت بۆ باس دەکرێ ، تا ئەگەر خەبەرەکە بەلای تەبیاتەوە تاڵو تفت بوو خێرا بڕۆ بۆ لای پزیشکێکی نەفسیی‌و لێی‌مەگوێزەوە هەتا ئەو بێژدۆکە دەمارەی هەناوت لە رەگەوە هەڵدەبڕێتەوە ، تۆ ئەگەر ئەو نەخۆشییە دەروونییەت چارەسەر نەکەیت هەمیشە ئامادەئەبیت لە بۆ بڕێ بەرژەوەندی‌خۆت بابدەیتەوە سەر دۆست‌و هاوڕێ‌و هاومەذهەب‌و هاوئامانجەکانت‌و تەپلی تۆپانیان پێ‌بکەیت‌و بۆیاخێکی درۆزنیی لە کارەکەت هەڵسوی‌و بیکەیت بە فەرمانی خەبات مێژوو چاکەی گەل چارەنووس(۲) •

میللەتی کورد بە درێژایی مێژوو قارەمانی لە هەموو چین‌و توێژاڵەکانی هەڵکەوتوەو هەڵیش دەکەوێ ، بێگومان نەتەوەی کورد لەم بارەوە نەزۆك نیە ، کەوابوو دانمان بە قەدیسیەتی کوردا نا بۆمان دەرئەکەوێ نەتەوەی کورد هەیەو ، نەتەوەیش هەبوو ئەبێ هەموو جۆرە کەسێکی تیدا هەبێ ، چونکی وەکوو بێشەلانی لێ دێ ، چۆن بێشە هەموو جۆرە دارێکی تێدایە لە : گەورە ، لە بچووك ، لە وەچ••• نەتەوەیش هەموو جۆرە

---

(۲) بڕوانە : حەمەئاغای گەورە ، مەسعوود محەمەد ، بەغدا ۱۹۸٦ ، ل : ۵ - ۱۰ •
هەروەها : شێخ مەحموودی قارەمان‌و دەوڵەتەکەی خوارەوەی کوردستان ، لەندەن ، ۱۹۹۰ ، ل : ۱۷ •

کەسێکی تێدایە ، کەوابوو ئێمەی کوردیش هەموو جۆرە کەسێکمان تێدا پەیدابوە چ لە خاوەن شیر یابیر ، بێجگە لەوانەش کەلێ لەو پیاوە غەیری کوردانە کە ئێستا لە بەرچاوی منو تۆدا بە دیمەن وەك کێوی هەڵگورد دێتە بەرچاومان ئەوە خاوەن قەڵەمەکانیان نەیانهێشتوە ئەو دیمەنانەیان ون بێ ، ئەگینا لە راستیدا وەنەبێ دیمەنی ئەوان زۆر لە دیمەنی پیاوەکانی ئێمە بەرزترو بەتەنو مەتتر بووبن •

ئەگەر پیاوانی ئێمەیش بنووسرایەنەوەو کردەوەکانیان بخرایەتە بەرچاو لەوان کەمتر نەئەبوون • جا بۆ ئەوەی زیاتر مێژووی میللەتەکەمان بە راستیی بنەخشێنینو بچەسپێنین پێویستمان بە لێکۆڵینەوەی بێپشووی زۆر هەیە ، بەڵام بێ ئەوەی لە رابوردوو و ئێستەمان بتۆقینو شەرم بمانگرێ •

دەبا بە راستەقینە کێ لە مێژووی پڕ لە شانازیی کوردەواریدا هەڵکەوتوە پیاهەڵدەین و ببوورن بەندە نەختێ زیاتر لەم رووەوە پێرادەکێشم دەڵێم : ئەگەر بۆرەقارەمانێکیشمان لێهەڵکەوتبێ بیکەینە قارەمان ساختە نیەو جێی خۆیەتی ، وابزانم هەر ئەمەیشە کە ئەرکی قسەڕاستەکانی سەرشانی رۆشنبیریو خوێندەوارانی کوردە لەم قۆناغەدا(۳) •

**لە بارەی وشەی جافەوە :**

بەشێ لە مێژوونووسان مێژووی هۆزی جاف ئەگێڕنەوە بۆ ۳۹٤۰ ساڵ لەمەوبەرو دەورەی ساسانیەکان(٤) • بەڵام ئەوی راستیی بێ هێچ

---

(۳) بڕوانە : نەخشی هۆزی جاف لە سایەی چەند سەرۆکێکیەوە لە مێژووی‌کوردا ، د. حەسەن جاف • گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ، دەستەی‌کورد ، ژ : ۲۱ ــ ۲۲ •

(٤) بڕوانە : جریدة العرب مێژووی ۱۹۹۰/٥/۲۹ •
هەروەها : رۆژنامەی ژیان ، ژمارە : ٤٥١ ساڵی ۱۰ ، ۱۹۳٥ •

جۆرە بەڵگەیەکی زانیاریی لەم رووەوە بەدەستەوە نیە قسە نەبێتو ، قسەی رووتیش ، وەکوو وتراوە ، نارِواتە گیرفانی مێژووەوە •

لە دەورەی فوتووحاتی ئیسلامدا ، بە تایبەت لە سەردەمی فەرمانرِەوایی خەلیفەی دووەمی ئیسلام عومەری کورِی خەتابدا ـخودا لێی رازیی بێ ـ ئەنصاریی لە سیروان ئەکەنە ئەوبەرەوەو ، لە شـەرِێکـدا عوبەیدیلـلای ئەنصاریی لە سیروان ئەکەنە ئە وبـەرەوەو ، لە شەرِێکـدا عوبەیدیلـلای ئەنصاریی ئەکوژرێو ، لە جێگایەکدا کە لە بناری چیای شنروێی نزیـك بە هەڵەبجە کە پێی دەڵێن : ( عەبابەیلێ) نێژراوە ، واتە رێکـەوتی سـاڵی ١٨کۆچیی کوردەکانی شارەزوور ، کە مەڵبەندی ئێلاتی جافە ، دێنە سـەر ئاینی ئیسلام • بەڵام هیچ سەرچاوەیەکی ئیسلامیی باسی ئێلی جافی لـەو ناوچەدا بەسەربەخۆیی نەکردوە •

وە لە سەردەمی دەوڵەتەکانی ئیسلامدا ئەمەوییەکانو عەباسییەکـانو ئەو دەوڵەتانە پاش رووخانی بەغدا لە لایەنی هۆلاکۆوە لە ئێرانو ناوچەکانی کوردستاندا فەرمانرِەواییان کرد ناوی ئێلاتی جافمان بەرچاو ناکەوێ •

مایەی سەرسامییـە خـوالێخۆشبـوو شەرەفخـانی بەدلیسـیی لـە شەرەفنامەکەیا کـە لـە سـەدەی یازدەهەمـی کۆچی (١٠٠٥ك ١٥٩٦ز)دا دایناوە ، باسی خێڵی جافی نەکردوە • وا دیارە ئەم خێڵە لـەو سەردەمـەدا دەسەڵاتێکی ئەوتۆی نەبووەو پەرەی نەسەندوە بێ بە شایانی ئەوەی ناوی بچێتە دووتوێیی مێژوویەکی وەك شەرەفنامەوە ، بۆیە ئەویش خـۆی لـە قەرەی نەداوەو باسی نەکردوە •

بەڵام ئەوەی راستیی بێ ناوی جاف پێش ئەو سەردەمەشو ، ئەگـەر بمانەوێ ورد مێژوو دەستنیشان بکەین ، لە سـەدەی حـەوتو هەشتـی کۆچیدا لە کتێبە دەسنووسەکانی تایفەی (یارسان)ی ئەهلی حەقدا بەروونیی بەرچاو ئەکەوێت • بۆ نموونە دایکی سولتـان سـاق (سۆلتـانئیسحـاق)

سوهاك[٥] تازەکەرەوەو گەشەپێدەری ئایینی یارسان ناوی (دایراکخاتوون)ی کچی حسەین بەگی جلەیجاف بوە[٦] بەڵکو ئاشکرایە هەندێ لە زانایانی یارسان خۆیشیان لە تایفەی جاف بوون ، وەك عێل بەگی جاف[٧] ، عابدینی جاف و ئیبراهیمی جاف . پاشتریش لە سەردەمی سەفەوییەکان و نادرشای ئەفشار ، (١١٦٠-٦٨٨/١٧٤٧)[٨]دا باسی جاف کراوە . میرزا مەهدی استرآبادی کە مونشی نادر بوە دوای کوشتنی نادر داوای یارمەتیی لە تیرەو هۆزەکانی کورد کە بریتیی بوون لە پەنجا طایفەی ناودار لە کرماشان و کوردستاندا کردوە . بەڵام لەو سەرەك هۆزانەدا جگە

---

(٥) لە بارەی مێژووی لەدایکبوونی سوڵتان ساقەوە کە لە بنەماڵەیەکی ئایینیی دانیشتووی بەرزنجە بوە ، جیاوازییەکی زۆر لە نێوان نووسەرەکاندا هەیە ، حاجی نیعمەتوڵلای جەیحوون‌ئابادیی ئەڵێ : لە ساڵی ٦١٢ی کۆچیدا لەدایك بوە . بەڵام لە دەستنووسێکی فەیضی کارکاردانی ، کە لە سەدەی نۆهەمی کۆچیدا نووسراوە ، وتراوە لە ساڵی ٤٤٥ی کۆچیدا لەدایك بوە . ماشائەڵلاسووریش ساڵی ٥٢٨ی نووسیوە . بڕوانە : شاهنامە حقیقت ، تهران ١٩٦٦ ، ل:٤٢٦ هەروەها سرودهای دینی یارسان ، تهران ، ١٣٤٤،ل:٩٥٨ .

(٦) بڕوانە : برهان‌الحق ، نور علی الهی ، تهران ، ١٣٢٤ ، ل٣٨ . هەروەها: بزرگان یارسان ، صدیق صفی‌زادە ، تاران ، ١٣٥٧ ، ل : ٦ .

(٧) عێل بەگی جاف (٨٩٨ - ٩٦١ )سۆفیەکی ناودار بوە،هاوچەرخی صەفەوییەکان بوە ، زوربەی مێژوو نووسان ئەیگێڕنەوە سەر طایفەی جاف و ، پێشگۆیەکانی بە شیعر ، بە ناوی ( هەروا بوەو هەروا دەبێ ) لەناو کوردا زۆر بەناوبانگە . بڕوانە : پێشبینییەکانی عێل‌بەگی جاف ، صدیق صفی‌زادە بۆرەکەیی ، تهران ، ١٣٦٠ ، ص : ٥ ـ ٦ .
هەروەها : حیات فرهنگی کورد در پرتوی ئیسلام پایان نامەدکتوراە ، د. حەسەن‌جاف ، سالی تحصیلی ٥٢ ـ ١٣٥٣ ، ص : ٢١٥ .
هەروەها : گۆڤاری کەلاوێژ ، ژ : ٣ ، ساڵی شەشەم ، ساڵی ١٩٤٥ .

(٨) بڕوانە : تاریخ نادرشاە ، مینورسکی ، ترجمە رشیدیاسمی ، تهران ، ١٣١٣ ، ص : ٨ .

له سەرۆکی هۆزی جافو هـۆزی مەنگـوڕ هۆزێکـی تر نەهاتـوە بـە دەنگیەوە[٩] •

وە لە سەردەمی دەسەلاتی زەندیەکانا ( ١١٦٦ هـ – ١٢٠٩هـ ١٧٥٣ – ١٧٩٤ م ) هۆزی جاف بەم ناوە ناسراوبوە[١٠] •

ئەمە لە بارەی خێلی جافەوە ، لە بارەی وشـەی جافیشـەوە ئـەوەی ئاشکرایە بۆچوونی زۆر بۆ ئەم وشەیە لە ئارادایە •. گومـان لەوەدا نیـە زوربەیان بەهەڵەدا چوون لەم روەوە • کەریم بەگی باوکم لەو بڕوایەدایـە کە ناوی جاف لە جەفاکێشەوە هاتوە • ناوبراو لەم بارەوە ئەڵێ : هۆزی جاف هۆزێکی ئازاو دلێر بوەو ، هەمیشە پێشتازی لەشکـری کاربەدەستـانو حوکمڕانانی کوردستان بوون ، لە پێناوی ئەو لەشکرانەدا دەردو جەفایان کێشاوە • بۆیە پێیان وتـوون جـەفاکێشو ، بە تێپـەڕینی سـاڵ وشـەی جەفاکێش گۆڕاوە بە جەفاو جەفا بە جاف[١١] • قانیعی شاعیریش هەر لـەو بڕوایەدایە کە عەشیرەتـی جـاف پاشمـاوەی سوارە جەفایی‌یەکانـە ، کـە طایفەیەکی هەڵبژاردەی شاەسوڵتانحسەین ، ئاخرینفەرمانڕەوای صەفەوین (١٦٩٤ – ١٧٢٢)کە پێیان سپێررابوو دەورو بەری ئەصفەهـان لە چەتـەو ڕێگر پاككەنەوە ، ئەم سوارانە خۆیان بوونە چەتەو ستەمێکی فراوانیان لە دانیشتوانی دێهاتی ئەو ناوچەیە ئەکردو بە سوارەی جەفایی ، واتە سوارەی زۆردارو بێ بەزەیی ، ناوبانگیان دەرچوو • ئەو سوارانە کە پێیان ئەوتـن

---

(٩) بڕوانە : خواجە تاجدار ، ژان‌گورە ، ترجمەذبیح اللە منصوری ، جلد ١ ، ص : ١١٠ •

(١٠) بڕوانە : مجمل التواریخ أفشاریە وزندیە ، ابوالحسن بن محمدامین گلستانە بە اهتمام مدرس رەضەوی ، تهران ١٣٤٤ ، ص : ٣٠٠ •

(١١) مێژووی ئێلی جاف ، دەستنووسی مستەفابەگی کەریم بەگ کە لای منە. خوالێخۆشبوو عەلادینسەجادی ئەم قسەی وەرگرتوەو ، باسی ئـەوەی نەکردوە لە کێی وەرگرتوەو ، بۆ خۆی تۆمارکردوە • بڕوانە : مێژووی ئەدەبی کوردی ص : ٤٧١ •

سوارەی جەفایی ، هەندێکیان ناویان ئاوابوو : هاروون ، شاتر ، میکائیل ، ئیسماعیل‌عوزەیر ، کەمال ... هتد ئێستایش بە خێلەکانی جاف ئەلێن : هاروونیی ، شاتریی ، میکائیلی ، ئیسماعیل عوزەیریی ، کەماڵەیی ...[12]

ماموستا مەلا عەبدولکەریمی مدرس لەو بڕوایەدایە کە جاف ئەسڵەکەی (ژاف)ە بە مەعنای تەڕە ، بەو مەعنایە عەشایری کۆچەریی جاف هەموو ساڵێ سەرکەوتوون بۆ کوێستانەکان بۆ سوودوەرگرتن لە گیاو خواردەمەنیی تەڕ بۆ خۆیان‌و حەیوانیان‌و ، وشەی (ژاف) بوە بە (جاف) .

خوالێخۆش‌بوو مامۆستا عەلادین سەجادیش لەو بڕوایەدایە کە باپیرەگەورەی جاف ناوی جەعفەر بوە ، جەعفەریش بە کوردی بوە بە (جافر) ئێستاش کورد بە (جافر) ئەلێن (جافە)و (جافە)یش بە درێژایی رۆژگار بوە بە جاف .

مامۆستا سەجادی لەم رووەوە بەڵگەش ئەهێنێتەوەو ئەڵێ : لە ناو کوردا (مەعرووف) ئەبێ بە (مارف)و (مەحموود) ئەبێ بە(خولە) و (موحەممەد) بە (حەمە)و (قادر) بە (قالە).. (جەعفەر)یش هەر بەو جۆرە بوە بە(جافە)و پاشان بوە بە (جاف)[13] .

وشەی (جاف) بە عەرەبیی بە مانای (وشك)ە ، ئیتر وشکی مادیی بێ یا وشکی مەعنەویی ، بە فارسیش بە پێی قامووسە باوەڕپێکراوەکانی وەك (برهان قاطع) واتایەکی ناپەسەندی هەیە . کە واتە ئەم وشە چ بەعەرەبیی لێکی‌بدەینەوەو چ بە فارسیی ، بۆ ئەوە ناشێ بکرێ بە ناوی عەشیرەتێکی ناسراوو بەناوبانگ .

بەپێی باوەڕی مامۆستا مەلا جەمیلی رۆژبەیانیی وشەی جاف لە ناوی هۆزی جاوانەوە وەرگیراوە . ناوبراو ئەڵێ : جاوانیەکان هۆزێکی کوردن ،

---

(١٢) بڕوانە : گۆڤاری هەتاو ، ژمارە : ١٨٦ ، ساڵی ١٩٦٠ .

(١٣) مێژووی ئەدەبی کوردی عەلادین سەجادی ، بەغدا ، ١٩٥٢ ، ل : ٤٧١ .

کانی خۆی لە ئێرانەوە کوچیان کردوە بۆ خوارەوەی عێراق‌و ، لەگەڵ هۆزی (بنی‌اسد) شاری حیسەیان دروست کردوە(١٤) پاشماوەی ئەم هۆزە ئێستا لە ناوچەی (دەماوەند)ی ئێرانا نیشتەجێن(١٥) وەك مامۆستای رۆژبەیانیی ئەیگێڕێتەوە • بەپێی نووسینی مێژوونووسی عەرەب (مەسعوودی) جاوانەکان لە ناوەڕاستەکانی چەرخی چواردەی گۆچیدا لە هۆزە هەرەبەناوبانگەکانی کورد بوون‌و(١٦) لە ناوچە شاخاویەکانەوە بەرەوخوار بوونەتەوە • ئەنجا مامۆستای رۆژبەیانیی ئەڵێ : (جاوان) لە پێشا(چاڤان)بوە • ئەمەش بە پێی شێوەی زمانی کرمانجیی سەروو کە لە جیاتیی هەموو پیتێکی (واو) (ڤێ) ئەخوێننەوەو ، شێوەکانی تری کوردی هەر (واو) ئەخوێننەوە • هەرچەند لە زمانی فارسیدا ئەم وشەیە بە(جابان)هاتوە • دوور نیە وشەی (جاڤان) عەرەبەکان بە (جافان)یان خوێندبێتەوە ، کە وشەیەکی دوانە (تثنیە)یەو بە درێژایی ساڵ بوویێتە (جاف)(١٧) •

مێژوونووسی بەناوبانگی رووس مینۆرسکی(*) باوەڕی وایە جاوانەکان لە ناوچە شاخاویەکانی ئێرانەوە بەرەوسنووری رۆژاوای ئێران‌و باشووری

---

(١٤) بڕوانە : هۆزی لەبیرکراوی گاوان ، د. مستەفا جەواد ، ترجمە هەژار ، بەغدا ، ١٩٧٣ ، ل : ١٩ •

(١٥) رەزمارا ئەڵێ : جابان دێیەکە لە ناوچەی ئەبرشیوی پشتکۆ ، ٢٧ کیلۆمەتر لە باشووری رۆژهەڵاتی دەماوەندەوە • بڕوانە : فرهنگ رزم‌آرا ، جغرافیای ایران ، ج : ١ ، ص : ٥٠ •

(١٦) مروج الذهب ، چاپی ئەورووپا ، ج : ٣ ، ل : ٢٥٤ •

(١٧) بڕوانە : محمد جمیل رۆژبیانی ، ایل جاوان‌و ناموران آن ، [وتارێکە لە کۆنگرەی ساڵی ١٣٥٥ی تەحقیقاتی ئیرانیدا خوێندوویەتەوە ] •

(*) The [illegible] By V. Minorsky [illegible], P. (1)

هەروەها بڕوانە : وتاری نووسەر بۆ گۆڤاری (بررسیهای تأریخی )لە ژێر نیشانەی ( تحقیق در مورد یك طائفەی ناشناختەی ایرانی) ، گۆڤاری ( بررسیهای تأریخی ، شمارە ٢ ، سال‌سیزدهم ) •

عێراق رۆیشتوون • دوور نیه هەر جاوانەکان بووبن کە نیشتەجێی ناوچەی سەرچەمی سیروان بوە هۆزی جوانڕۆی ئێمڕۆ بووبن • ناوی هۆزی (جوانڕۆ) لە راستیدا (جوانروود) بوەو ، لە ئێران بە هەموو جافو تیرەکانیان ئەڵێن (جافیجوانڕۆ) • واتە (جاوان) بوە بە (جوان)و (جاف)یش هەر لەم دوو ناوەوە وەر ئیراوە •

ئەوەی شایانی وتنە ئەوەیە لە قۆناغی سەدەی چوارەمو پێنجەمی کۆچیدا ناوی هەندێ لە تیرە ناسراوەکانی جاف وەکوو : (کەلالیی)و (هاروونیی) لە کتێبە مێژووییە عەرەبییەکانی زانا موسولمانەکاندا هاتوە • بۆ نموونە (قەلقەشەندیی) باسی تایفەی گەلاڵیی کردوە(١٨) •

لەم لێکدانەوەی سەرەوەوە بۆمان دەرئەکەوێ کە نزیکترین باوەڕێك لە راستیەوە ئەوەیە وشەی (جاف) لە (جاوان)ەوە هاتبێ‌و ، هۆزی (جاوان) بنەچەی هۆزی (جاف) بێ‌و بەتێپەڕینی زەمان ناوەکە گۆڕابێ‌و هۆزی تریش لەم‌لاو لەولاوە لە دەوری هۆزی جاف کۆبووبنەوەو ، بە هەموویانەوە ئەم عەشرەتی جافەی ئیستایان لێ پێکهاتبێ •

**ئەو ناوچانەی کە هۆزی جافیان تێدا نیشتەجێیە :** ئەم عەشیرەتە لە عێراقدا بە زۆریی لە قەزاکانی پێنجوێن‌و هەڵەبجەو کەلارو سەنگاو دائەنیشن ، بگرە شاری هەڵەبجەو کەلار بە مەڵبەندی سەرۆکەکانی عەشرەتی جاف دائەنرێن • جافی تەلانو سمایل عوزێریش لە ناوچەی دووکانو سووورداش‌و ، جافەڕەشکەیش لە ناوچەی پشدەر نیشتەجێن • جافەکانی ئێرانیش لە ناوچەی مایدەشتەوە تا دەورو بەری قەسری شیرین‌و ، بە تایبەتیی لە ناوچەی زەهاو ، نیشتەجێن‌و ، تا سەرحەدی چەمی سیروان

---

(١٨) بڕوانە : صبح‌الاعشی ، القلقشندی ، ج ٤ ، ص ٣٧٤ هەروا : تنبیه الاشراف ، المسعودي ، ترجمه فارسی ابوالقاسم پاپنیده ، ص : ٨٤.

درێژئەبنەوە • جافی جوانڕۆ ئەمڕۆ سەر بەفەرمانداریی پاوەن‌و لە ناوچەی قەڵای جوانڕۆو ناوچەی دڕۆڵەو مەڕەخێڵ‌و شمشێرو تا ناوچەی هەورامان نیشـــتەجێن •

## هۆزی جاف لە مێژوودا :

مێژووی نووسراوی جاف لە زاهیربەگی کوڕی یارئەحمەدبەگەوە[19] دەست‌پێ‌ئەکـا • لە پەیمانەکـەی نێوان سولتـان مـورادی چوارەم‌و[20] (١٦١٢ - ١٦٤٠ ز)شاه صەفیی[21] (١٦٢٩ - ١٦٤٢ز)صەفەویدا کـە لـە سالی (١٠٤٩ك ١٦٢٩ز)دا[22]••بەسترا ، ناوی عەشیرەتی ضیائەدین کـە بوە بە ضیائیی‌و بە کوردی بوە بە صەدانیی‌و ، هاروونیی‌و جاف هاتوەو ، ئەو دوو تیرەیە بە سەربەخۆیی لەگەڵ عەشیرەتی جافدا لەو پەیمانەدا باسیان

---

(١٩) یارئەحمەدبەگ چوار کوڕی بوە : زاهیربەگ ، تاهیربەگ میرەبـەگ ، خانەبەگ . بەگزادەی کەیخوسرەوبەگی‌و ، بارام‌بەگیی ، نەوەی زاهیـر بەگن ، تاهیر بەگ ، دوای کوشتنی زاهیربەگ چوە بۆ شـام‌و ئێسـتـا نەتەوەی لە گەڕەکی کوردەکانە لە صاڵحیـە لە دیمـەشق ، میرەبـەگ نەتەوەی ماوە لە سلێمانیی ئەویش بە کاسبیوە خەریکن . خانەبـەگیش باپیرەگەورەی بەگزادەی وەڵەدبەگییە (١٠١٨-١٠٤٩ ، ١٦١٢ - ١٦٤٠)•

(٢٠) سوڵتان مورادی چوارەم هەڤدەهەمین پاشای عوثمانیـە • لە تەمەنـی ١٤ساڵیدا بوە بە پاشا لە (١٠٤٨ - ١٦٣٨ك)دا بە یەکجاریی بەغدای گرت‌و لە دەستی ئێرانیەکانـی سەنـدەوەو بەستیـەوە بە ئیمپـراتۆریەتـی عوثمانیەوە •

(٢١) شاه صەفیی (١٦٢٩ - ١٦٤٢ك) کوڕەزای شاه عەباسی گەورەیە ، کوڕی صەفیی میرزایە کە شاه عەباسی باوکی کوشتی •

(٢٢) ئەم پەیمان‌نامە بە پەیمان‌نامەی زەهاو بە ناوبانگە ، کە دوای پەیمانەکانی ئاماسیا ساڵی ١٥٥٥و پەیمان‌نامەکانی ساڵانی (١٥٦٨ - ١٥٩٠-١٦١٣ ) یەکەمین پەیمان‌نامەی راستەقینەیە کە سنووری لە نێوان دەوڵەتـی عوسمانیی‌و ئێراندا دابین‌کـردوەو ، عەشیرەتـی جاف بـە هۆی ئـەم پەیمان‌نامەوە زوربەی تیرەکانی کەوتە بەشـی عوسمانیـەوەو ، ئـەم عەشیرەتە بوە هۆی هەڵگیرسانـی ئاشووب بۆ هەردوو دەوڵەتەکـە • بڕوانە : (تأریخ العراق في العهد العثماني ، علي شاكر علـي ، بغـداد ، ١٩٨٤ ، ص ٨١ ) •

کراوە[٢٣]. ئەمە ئەوە ئەگەیەنێ ئەو کاتە ئەم دوو تیرەیە سەربەخۆبوون ، بۆیە وا بە جیا لە جاف باس کراون . ئەم دوو تیرەیە تەنانەت ئەمڕۆش بە دوو تیرەی ناسراوی عەشیرەتی جاف دائەنرێن .

خوالێخۆش بوو حەسەن فەهمی جاف ( ١٣٢٣ - ١٩٠٤ / ١٣٩٣ - ١٩٧٣ ) لەم بارەوە ئەڵێ : وشەی ( جاف ) ناوە بۆ عەشیرەتێکی گەورە کە بریتیە لە سێ بەش : جافی مورادییو جافەڕەشکە ، جافی جوانڕۆ ، جافی گۆران . جافی مورادییو جافەڕەشکە لە عێراقدان ، بەشی جافەڕەشکە لە وڵاتی پشدەر ئەژینو هەزار ماڵێک ئەبن . جافی جوانڕۆیش کە بریتین لە ڕۆستەم بەگیی یا بەگزادەی وەکیلی ، قوبادیی ، باوەجانیی ، ئێناخیی ، ئیمامیی ، ساتیاریی ، زەردۆیی ، وەڵەدبەگییو ... چەند هۆزێکی تری بچووك . جافی گۆرانیش بریتین لە : تایشەیی ، قادرمیروەیسیی ، تێرژییو ، چەند هۆزێکی تری بچووك[٢٤] .

زوربەی سەرچاوە مێژووییەکان لەو باوەڕەدان کە عەشیرەتی جاف لە سەردەمی سوڵتان مورادی چوارەمی عوسمانیدا ( ١٦٢٣ - ١٦٤٠ ) بەسەرۆکایەتیی زاهیر بەگ لە جوانڕۆوە هاتوونەتە خاکی عێراقو[٢٥]

---

(٢٣) یەکێ لە خاڵەکانی پەیماننامەی زەهاو ئەمەیە شارەکانو ناوچەکانی خوارەوە ئەچنە بەشی دەوڵەتی عوسمانیەوە ، دەرەنەو ، جەسانو بەدرەو ، مەندەنیجو ، دەرەتەنگو ، جافو ، ضیائەدینو ، هارونییو ئەو دێهاتانەی هان لە ڕۆژاوای زنجیرەوە تا قەڵای سالم لە ناوچەی شارەزوورو ڕێگوزەرەکانی بەردەمی شارەزوورو قەڵای زەڵمو قزلجەو تابیعەکانی ... بڕوانە : ( العراق في العهد العثماني ، علی شاکر علی ، بغداد ، ١٩٨٤ ، ص : ٧٨ ) .

(٢٤) دەستنووسی یاداشتەکانی حەسەن فەهمی جاف . حەسەن فەهمی جاف لەکوڕ : مەحموودو هۆشمەندو ، لە کچیش : نازەنینو ، پەروینو ، بانوو ، پەریخانو ، نەسرینی بوە .

(٢٥) ئەم نووسەرانە بریتین لە مامۆستا عەلادین سەجادی ، مێجەرسۆن ، ئەدمۆندز ، باسیل نیکیتین ، ئەمین زەکی بەگ ، کەریم بەگی فەتاح بەگیش لەم تەئریخەدا هەر لەو بڕوادایە .

ناوچەی (دزیایش)یان کردوە بە هەواری خۆیان • زاهیربەگ بەرەنگاری خان ئەحمەدخانی ئەردەلان بوەو لە جەنگدا دیل کراوەو دراوە لە فەنارە • سولتان موراد ئەم دەسەیەی لەبەر شەڕوشۆڕیك لە نێوان ئەوانو شای ئێراندا رووی داوە ، گرتوەتەخۆیو ، لەمەوە پێیان وتراوە (جافی موڕادیی) کە لە کاتی فەتحی بەغدادا لە سالی (١٠٤٨)ی کۆچیی (١٦٣٨-١٦٣٦)دا یارمەتیی سۆلتان موڕادیان داوەو ، ئازایەتیو لێهاتووییان نیشان داوەو، ئەویش لەقەبی (موڕادیی)پێ بەخشیون[٢٦]• بەلام شاعیرەی بەناوبانگی کورد ماەشەرەفخانم ( مەستوورەی کوردستانی )و ، ئایەتوللا شێخ موحەممەدمەردۆخی کوردستانی ، کۆچی عەشایری جاف بە سەرۆکایەتیی زاهیربەگ ئەگێڕنەوە بۆ سەردەمی نادرشای ئەفشارو سالی ١١٥٥ی کۆچیی (١٧٤٢ - ١٧٤٣) بۆ ئەو رووداوە دەسنیشان ئەکەن[٢٧] •

به باوەڕی من بۆچوونی ئەم دوو نووسەرە لە راستییەوە نزیکترە • حەسەن فەهمی جافو ، مستەفابەگی جافیش لەگەل ئەمان هاودەنگو هاوبڕوانو ، لایان وایە ئەم مێژوەی مەستوورەو مەردۆخ دەسنیشانیان کردوە ، بە مێژووی لێشاوکردنی جاف بۆ عێراق دابنرێ • بەلگەشیان ئەوەیە لە خۆیانەوە بە هەشت پشت یا هەشت ئەلقە ئەگاتە زاهیر بەگ ، کە ئەگەر لە سەردەمی سوڵتان موڕادی چوارەمدا هاتبێ بۆ عێراق ئەکاتە ٣٣٥ سالو ، بە راستیش زۆر لە ئەقلەوە دوورە هەشت پشت توانیبێتی ٣٣٥سال ببینێ ، چونکە لە کەیخوسرەوبەگەوە تا زاهیربەگ چوار پشتە ، کەیخسرەوبەگ لە ١٨٢٠ی زاییندا چاوی بە مستەر کلۆدیۆس جەیمس ریچ

---

(٢٦) تأریخ سلیمانیو ولاتی محمدامین زکی بەغدا ، ١٩٣٩ ، ٧٩ •
(٢٧) مێژووی ئەردەلان ، ماەشەرەفخانم (مەستوورەی ئەردەلانیی)وەرگێرانی د. حەسەن جافو شکورمستەفا ، بەغدا ، ١٩٨٩ ، ل:٩٧ • هەروەها تەئریخی مەردۆخ ، بەرگی (٢) ل : ١٢٢ •

کەوتوە[٢٨]کە لەو ساڵەدا هاتوەتە سلێمانیو لەو کاتەوە تا ئیستا ئەکاتـــە ١٤٣ساڵ • چوار سالیتش بۆ جیاوازیی سایی کۆچییو زایینیی زیادبکەین ، واتە لە کەیخوسرەوبەگەوە تا حەسەنفەهمی جاف ئەکاتە پێنج پشـتو ، ئەم پێنج‌پشتەیش هەمووی ١٤٧ی ساڵی بڕیوەتەوە •

کەوابوو ئەگەر پێنج پشت ١٤٧ی بڕیبێ چۆن هەشت پشت٣٣٥ ساڵ ئەبڕێ ؟ دیارە ئەمە لە ئەقلەوە دوورە •

بەلای منیشەوە ـ هەر وەکوو تەئریخـی مەردۆخیش ئەڵێ ـ ئەبـێ زاهیربەگ لە ساڵی ١١٥٥ی کۆچیدا هاتبێ بۆ کوردستـانی عوسمانیـی ، بەم حیسابە لە زاهیربەگەوە تا ئەمڕۆ ئەکاتە ٢٢٥ساڵو ئەمەش لەگەڵ هەشت پشتەکە جووت‌ئەبێو ئەقڵیش پەسەندی ئەکا •

هەروەها دیاریکردنـی مێژووی کوشتنـی زاهیربەگ بە فەرمانـی خانئـەحمەدخـانـی سێهـەمـی ئـەردەڵان[٢٩] لەلایەن مـەستـــوورەی کوردستانییەوە ، کە لە خانەوادەی ئەردەڵانەو ، مێژووی ئەردەڵانـی بـە باشیی نووسیوەتەوە پشتگیرییەکی بەهێزە بۆ ڕاستیی ئەم بۆچوونـە کـە زاهیربەگ لە ساڵی١١٥٥ی کۆچیدا هاتبێتە عێراق ، هەرچەند ئەوەش بێ وەڵام ئەمێنێتەوە کە : ئەی ئەم لەقەبی (مرادی)یە لە کوێوە هات بۆ جافـی عێراق ؟ مادام لەولاوە ئاشکرایە کە ئەم لەقەبەیان لە سـەردەمی سوڵتـان موورادی چوارەمدا دراوەتێ ، واتـە پێش هاتنـی زاهیربەگ بـە خـۆیو عەشرەتیەوە بۆ عێراق ئەم لەقەبە پەیدابووبێ ، بەڵـێ ڕێی تێ ئـەچێ پێش هاتنی زاهیربەگ بە خۆیو عەشرەتیەوە بۆ عێراق هەندێ تیـرەی جـاف

(٢٨) بڕوانە : رحلة ريج في العراق عام ١٨٢٠ ، كولديـوس جيمس ريـج ، ترجمة بهاءالدين نوری ، ص : ١٣٢ .

(٢٩) دوای کوشتنی زاهیربەگ لە لایەن خانئەحمەدخانـەوە ، تاهیربەگـی برای کۆچی کردووەو ڕۆیشتوە بۆ شام • جاف لەو شوێنەدا ، کە ئێستە بەدێی چەمەرگە بەناوبانگە لە ناحیەی وارماوا کۆتەڵو چەمـەرانە بـۆ زاهیربەگ ئەگێڕنو هەر لەو شوێنەدا بەخاکی ئەسپێرن .

خۆیان سەربەخۆ کۆچیان کردبێ بۆ عێراق و[30] لە موناسەبەیێکدا ئەم لەقەبەیان وەرگرتبێ[31] •

هۆی هاتنی زاهیر بەگ و عەشرەتەکەی بۆ خاکی عوسمانیی ئەوە بوە هەموو سالێ هەندێ جەردەو پیاوخراپ لە ئێرانەوە هاتوون و لە سیروان پەڕیونەتەوە بۆ ناوچەی (دزیایش) و (پێواز) و (بانی خێلان) و هەندێ جێگای ترو تالانیان کردوەو ، مەڕو مالاتی خەلکەکەیان بردوە • میرەکانی بابان بە دەست ئەم دزو جەردانەوە داماون ، وەلامیان ناردوە بۆ زاهیربەگ بۆ ئەوەی ئەم جەردانە لەناوبەرێ ، ئەویش بە چوارسەد مالێکەوە گواستوویەتیەوە بۆ ناوچەی دزیایش و لەوێ دامەزراون و ، جەردەکانیان تەفرو توونا کردوە • بابانەکانیش لە پاداشی ئەم کردەوەیەدا ئەو ناوچانەیان پێ بەخشیون[32] •

---

(۳۰) باسیل نیکتین لەو بڕوایەدایە کە تیرەکانی هاروونیی و گەلالیی هاوبەشی هێرشەکەی سولتان مورادی چوارەمیان بۆ سەر بەغدا کردوەو ، لەقەبی مورادییان وەرگرتوە • بڕوانە : الاکراد باسیل نیکتین ، ترجمة دار الروایة ، بیروت ۱۹۵۰ ص : ۱٦٦ •

(۳۱) لەمەولایش لە (تەئریخی جاف)دا بەدرێژیی ئەم بابەتە دەخوێنیتەوە ، کە (کەریم بەگ) هۆکارەکەی شیی کردوەتەوە •

(۳۲) ادمونس بە هەلە هاتنی زاهیربەگ بۆ دزیایش بۆ سالی ۱۲۸٦ك ۱۷۷۲ز ئەگێڕێتەوە ، کە ئەو سەردەمە ئەحمەد پاشای بابان فەرمانڕەوای میرنشینی بابان بوەو لەو ڕووەوە ئەلێت : کە ئەحمەدپاشا تاوانی سەرۆکایەتی چل جەردەیەك ، کە ناوچەکانی ئیمارەتی بابانیان تێکدابوو ..سەپاندیە سەری زاهیر بەگداو ، لە سەر ئەم تاوانە کوشتی هەر وەکو قادربەگی کوڕی جەردەکانی گرت و کوشتنی • ( بڕوانە : کرد ، ترك ، عرب ، ترجمة جرجیس فتح‌الله ، بغداد ، ۱۹۷۱ ، ص : ۱۳۱ ) •

چەند ساڵێك ئەم جافانە بەهاوین‌و زستان لە ناوچەی دزیایش ئەمێننەوە ناپەرمنە خۆیان بچنەلوێستان ، نەوەك عەشایرە ئەسلییەکانی نیشتەجێی ئەو ناوچانە وەك : گەلالیی‌و ، شێخ‌سمایلیی‌و ، سمایل‌عوزێریی‌و تایفەکانی تربچن بەگژیانا • ساڵێکیان پێ‌بەجەرگی خۆیانا ئەیێن‌و ئەچن‌و لەگەڵ ئەو عەشایرانە ئەبێ بە شەڕیان‌و لە شەڕەکەدا زاڵ‌ئەبن بەسەریانا • ئیتر ئەم سەرکەوتنە ئەبێ بە هۆی کۆبوونەوەی هەموو تیرەکانی جاف لەژێر فەرمانڕەوایی زاهیربەگداو ، زاهیر بەگ ئەبێ بە سەرۆکی هەموو جافی کوردستانی عوسمانیی •

پاش کوژرانی زاهیربەگ سەرۆکایەتیی جاف ئەکەوێتە دەستی قادربەگ‌و[٣٣] سلێمان‌بەگی کوڕانی زاهیربەگ • لەسەردەمی ئەم قادربەگەدا بوە کە جاف زۆر پەرەئەسێنن •

**نەخشی هۆزی جاف لەسایەی چەند سەرۆکێکیەوە لە مێژووی کورددا :**

هەوڵ دەدەین لەم کورتەباسەدا باسی چەند سەروکێکی هۆزی جاف بکەین کە نەخشێکی لە مێژووی نەتەوەکەماندا بەئاشکرا هەبوە • وا بزانم روونکردنەوەی ئەم نەخشە کەلێنێکی چکۆلە لە مێژووی نەتەوەکەماندا پڕدەکاتەوە •

بێگومان ئەم سەرۆك‌هۆزانە نەخشێکیان لە توندوتیژکردنی زۆرانبازیی‌و کێشەوبەرەی عوسمانیی‌و ئێرانیاندا هەر لەسەر کوردستانەکە خۆی هەبوە • ئەم کێشەوبەرەیش زۆرتر لە دووبەرەکیی میرە کوردەکان ، بەتایبەتیی میرنشینی بابان‌و ئەردەلاندا ، بەدیاردەکەوێ •

---

(٣٣) حسەین‌بەگی حەسەن لە نامەیەکدا نووسیویە کە قادر بەگ کوڕی عەبدوڵلابەگە ، عەبدوڵلابەگیش کوڕی زاهیربەگە .

خوالیخۆشبوو کەریم بەگ نەیتوانیوە ، لەبەر چەند هۆیەك ، بەدرێژیی پەیجە بۆ بارو نەحسی سیاسیی ئەم سەروبانە لە مێژووی میللەتی کوردا رابێشێ • وا دیارە چەند تێبینیی سیاسیی و کەمیی سەرچاوەو دەست نەکەیشتنی بەسەرچاوە بیانیەکان هۆی ئەم لەمو تورییەن کە لە نووسینەکەیدا بەرچاو دەکەون •

لە دوای سەدەی پانزەو سەرەتای سەدەی شانزەهەمدا بەرەبەرە توندوتیژبوون و پەرەسەندنی کێشەو هەرای نێوان دەولەتی عوسمانیی و دەولەتی سەفەویی لەسەر داگیرکردنی کوردستان ، بە نیازی دامەزراندنی ئیمپراتۆریەتێکی گەورەو بەربلاو خۆی نواندو ، کێشەکە گەیشتە ئەوپەڕی و لە شەڕی چالدێراندا خۆی نواندو ، کوردستان زەرەرو زیانێکی زۆری لێکەوت و ، ئەم ولاتە لە نێوان دەولەتیعوسمانیی و دەولەتی سەفەویدا دابەش کرا(۳٤) •

بەلام سەرۆك هۆزو تیرە کوردەکان کە ناوبەناو سەربەخۆو جاربەجار نیوەسەربەخۆ مافی میرایەتی خۆیان پشتاوپشت دەپاراست ، نەیاندەتوانی بێ لایەن بمێننەوەو خۆیان ئەداپال یەکێ لەو دوو هێزە ، چونکە لەو قۆناغەدا هەستی سەربەخۆیی لەناو ئەو نەتەوانەی ، کە لە ژێر سێبەری ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی و دەولەتی سەفەویدا دەژیان ، هێشتا بە تەواویی خۆی نەنواندبوو ، دیارە هۆی ئەمەیش روونە ، چونکە زۆربەی ئەو نەتەوانەی

---

(۳٤) بروانە : شەرەفنامەو راپەڕینی کوردەکان سالی ۱۸۸۰ ، نووسینی د. جەلیلی جەلیل • وەرگێڕانی د. کاوس قەفتان • بەغدا ، ۱۹۸۷ ، ل : ۷۱ •

هەروا : مێژووی کورد لەسەدەی شازدەهەمدا ، نووسینی د. شەمسەدین محەمەد ئەسکەندەر ، تەرجەمەی شوکور مستەفا ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ، دەستەی کورد ، ژ: ۲۰ ، ۱۹۸۹ •

که موسوڵمانبوون بیریان له جیاوازیی نەتەوایەتیی نەدەکردەوە ، بەڵام بیریان له جیاوازیی مەدهەبیی ئەکردەوە .

هەردوو دەوڵەتەکەیش هەمیشه هەوڵی ئەوەیان دەدا کوردەکان لە دژی یەکترو بۆ یارمەتیدانو پشتگیری لێکردنیان بەکاربێنن . سەفەویەکان بۆ ئەوەی وڵاتی ئێران له عوسمانیەکان ، له خۆیان به میراتگری خەلافەتی ئیسلامیی دەزانی[٣٥] بپارێزن . لەگەڵ دەوڵەته رۆژئاواییەکان دژی عوسمانیەکان رێكدەکەوتنو ، بۆ ئەوەی بتوانن رقی گەلانی ئێرانو گەلە موسوڵمانەکانی تر له دژی عوسمانیەکان بجوولێننەوە ، له هەر جۆره پڕوپاگەندەیەك بۆ ئەم مەبەسته درێغییان نەدەکردو ، بەڕاستیی تەنگیان به عوسمانیەکان هەڵچنیبوو ، له کاتێکدا هێزی چەکداری عوسمانیەکان وڵاته مەسیحیەکانی ئەوروپای رۆژئاوای خستبوە مەترسیەوەو ،توانیی شاری (ڤیەننا) ی پایتەختی دەوڵەتی (نەمسا)گەمارۆ بدا (١٥٢٩)[٣٦] لەو کاتەدا له پڕ له پشتەوە سەفەویەکان جەبهەیەکیان له عوسمانیەکان کردەوەو هێرشیان بردە سەر سنوورەکانی عوسمانییو ، صەفەویەکان له سەردەمی شائیسماعیلەوە شەڕو شۆڕێکی سەختو بەردەوامیان لەگەڵ عوسمانیەکاندا دەستپێکردو ، ئەم کێشه بوە هۆی ئەوەی عوسمانیەکان له دەورو بەری ڤیەننا پاشەکشێ بکەن[٣٧] .

---

(٣٥) انظر : لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث ، علي الوردي ، بغداد ١٩٦٩ ج : ١ ، ص : ٤٩ .

(٣٦) هەندێ له مێژوونووسان لەو بڕوادان دواکەوتنو لاوازیی ئیمپراتۆریەتی عوسمانی پاش پاشەکشەی عوسمانیەکان له دەورو بەری ڤیەننای پایتەختی نەمسا له ساڵی١٦٨٣زدا دەستپێدەکا . (بڕوانه : السلطان عبدالحميد ، حياته واحداث عهده ، اورخان محمد علي ، مطبعة الخلود ١٩٨٧ ) .

(٣٧) بڕوانه: تشيع علوى وصفوى ، د.علي شريعتي ، چاپخانه ارشاد ل : ٥٥-٥٦ .

لەم زۆرانبازیـە خوێنینـەدا نەتـەوەی کـورد زیانێکـی گـەورەی لێکەوت‌و ، کوردەکان بە ناوی دوژمنایەتیی سونیگەریی‌و شیعەگەرییەوە بوون بە داردەستی ئەم دوو دەوڵەتەو ، کوردستانیش بوو بە مەیدانـی شەڕو شۆڕی خوێنینی ئـەم دوژمنـە سەرسەختانـەو ، هـەراو هـوریای سنوورو دووبەرەکیی‌و نەفامیی کـوردەکـان هـەموو کاتێـك مەبەستـی بەگژیەکاچوونی بۆ ئەم دوو حوکوومەتە ئەدۆزیەوە •

ئەگەر کوردەکان تەربیەی سیاسییان بوایە لەم کێشەیەدا بە جۆرێك هەڵئەسووڕان کە هەردوو دەوڵەتەکە زەبوون‌بکەن ، بەڵام ، بەداخـەوە ، بیرو هۆشێکی وەها بەکەڵك لە سەری سەرداری کوردەکاندا بەدی‌نەدەکرا •

سەفەویەکان بـۆ لەناوبردنی میرنشینە کـوردەکـان لەبـەر ئـەوەی زۆربەیان سونی‌مەزهەب بوون تێکوشیون(٣٨) • بـەڵام سەرەڕای ئەوەی ئەم سەفەوییانە بەهێز بوون توانستی لەناوبردنی یەکجـاریی میرنشینـە کوردەکانیان لە وزەدا نەبووەو ، هەرکاتێ دەستیان ڕۆیشتبێ هەوڵیـان‌داوە بە هێز لەناویان بەرن(٣٩) ئەگەر نەشیان‌توانیبێ ئەوە هەوڵی ئەوەیان داوە سیاسەتی خۆنزیك‌کردنەوە لە میرەکـان بەکاربێنن‌و ژنیان داوە بـە میـرە بەهێزەکانیـان‌و ، بە خەروار ئەلقـاب‌و نیشـان‌و شمشێری موورەسەعیـان پێشکێش کردوون ، ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی تریشەوە هەوڵیان داوە دەس‌بخەنە ناو بارودۆخی ناوخۆی میرنشینەکانەوەو ، دوژمنایەتیی نێوان

---

هەروەها بڕوانە : امبراطوری عثمانی ، ویسن‌ووسبینج ، ترجمه سهیل آذری ، تهران ١٣٤٦ هـ ص : ١٥ — ١٩
تأريخ الشعوب الاسلامية ، عبدالعزيز سليمان نوار ، بيـروت ١٩٧١ ، ج/١ • ص : ٢٨ •

(٣٨) بڕوانە : مێژووی نەتەوەی کورد ، صالح‌قەفتـان ، بەغـدا ، سـاڵی ١٩٦٥ ، ل : ٣٤ •

(٣٩) هێرشی شاعەباس بۆ سەر قەڵای دمدم بۆ لەناوبردنی خانی لەپزێڕین‌و کۆتایی بەدەسەڵاتهێنانی لە کوردستاندا نموونەی‌ئەمەیە •

بنەماڵەکانیان بەتین بکەنو ، دژی هۆزو میرنشینە بەهێزەکانی کورد کە لەژێر فەرمانیاندا نەبوون بیانجوولێننەوە • ئەم سیاسەتە تا زەمانی نادرشاو زەندیەکانو ناصرەدین شای قاجار بەردەوام بوەو ، نموونەی ئەم سیاسەتە بەتایبەت کە سیاسەتی قاجاریەکان بوەو لەگەڵ میرنشینی ئەردەلاندا نواندوویانە سیاسەتی نالەباری پاشاکانی ئێران بوە لە دژی کوردەکانی ژێردەستیان(٤٠) •

ئەوەی راستیی بێ عوسمانیەکان ، لەم بارەوە ، لە سەفەویەکان بەسیاسەتتر بوونو ، بۆ ئەوەی کەڵکی زۆرتر لە کوردەکان وەربگرن هەستی دینییو مەزهەبییانیان هاوردۆتەجۆشو ، سەربەخۆیی‌یەکی تەسکیان پێداون • مەلائیدریسیبەدلیسیی کەزاناو هۆشیارێکی کورد بوە کردوویانەتە دەمسپیی خۆیانو ، بەدلیسیی بەباشیی هەوڵی داوە میرنشینە کوردەکان یەکبخاتو بیانکاتە پاڵپشت بۆ عوسمانیەکانو عوسمانیەکانیش سەربەخۆیی‌یەکیان داوە بە میرنشینە کوردەکان •

ئەم هەڵوێستەی مەولانا ئیدریس لە چیەوە هاتوە ؟ لەم روەوە ئەسکەندەر مونشیی لە عالەم‌ئارای عەباسیدا نووسیویە : کورد کە هەست بە مەترسیی دوژمن دەکەن دەگەڵ یەکتریی رێك دەکەونو یەکدەگرن ، بەلآم کە ئەم مەترسییە لەگۆڕێدا نەما دەبنە دوژمنی گیانیی یەکترییو شیرو تیر لەیەك دەسوون(٤١) •

مەلا ئیدریسی بەدلیسیی کە هەستی بە پرژو بلآویو بێسەرو

---

(٤٠) بۆ رۆشنایەکی زۆرتر لەم بارەوە بڕوانە ئەم کتێبانەی خوارەوە :
(زبدة التواريخ)ی سەنەندەجی ، مەلاشەریفی قازیی سەنەندەجیی ، فەسڵی یازدەهەم ، ل : ٣٨٨ ــ ٥٢٣ • مێژووی ئەردەلان ، مەستوورەی کوردستانی ، وەرگێڕانی د. حەسەن جافو ، شوکور مستەفا •

(٤١) بڕوانە : مێژووی کورد لە سەدەی شازدەهەمدا ، نووسینی شەمسەدین محەمەد ئەسکەندەر ، وەرگێڕانی شوکور مستەفا گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ، دەستەی کورد ، ژمارە : ٢٠ ، ١٩٨٩ • ل : ١٥٠ •

بەری کورد کردبووو ، سووریش دەیزانی کورد تا ئاوابن نە بەهیچ دەبن و نەهیچیان بۆ دەکرێت و ، بەڵکو وردە وردە چیشیان هەیە لە دەستی دەدەن ، بۆیە زیرەکانە ـ بە گوێرەی بارو دۆخی ئەو سەردەمە ـ لەگەڵ مەسەلەکەدا رەفتاری کرد ، بەڵام دووبەرەکییو ناتەبایی و تێنەگەیشتوویی میرە کوردەکان لەوە قووڵتر بوو دەرمانی دەستی مەلائیدریس دەردەکەیان دەرمان و برینەکەیان تیمار بکات[٤٢] .

---

(٤٢) ئەوەی لێرەدا نابێ پشتگوێ بخرێت ئەوەیە ، بەداخەوە ، هەندێ لە رۆشنبیرانی کورد ، لەبەر ناشارەزاییان لە مێژووی زانایان و ناودارانی کورد ، وا چەسپوەتە دڵیان کە مەولانا ئیدریسی بەدلیسی وەك کەوڵ سووری بەرلەشکرو نۆکەری عوسمانییان دەستی لەشکری عوسمانی گرتوەو میرەکانی کوردی بۆ بەنگ کردوون و ، کوردستانێکی گەورەو فراواوان و دەوڵەمەندی وەك هێلکەی پاکراو خستۆتە بەردەستیان !
بەڵام راستیەکە زۆر پێچەوانەیەو ، مەولانا ئیدریس یەکەم زاناو رۆشنبیری کوردە ـ تا ئێستە زانرابێت ـ زۆر زیرەکانە هەوڵی داوە بۆ وەدیهێنانی فەرمانڕەوایەکی ناوخۆی کوردستان کە لەگەڵ کەش و هەوای ئەو سەردەمەدا بگونجێ و ، یەکەم کەس بوە نیظامی ( ڤیدراسیون )بۆ کورد بێنێتەدیو ، ئەو بوو کارێکی وای بۆ میرنشینە کوردیەکان کرد ، کە ئەگەر ئەو میرانە ئەو ئیدارەو رێکخراوەی ئەویان بپاراستایەو خۆبەخۆ بەرنەبوایەنە گیانی یەکتری ئەوا پاشەڕۆژێکیان دەبوو جێگەی دڵخۆشییو مایەی سەرفرازیی کورد بێت .
هەر مەولانا ئیدریسیش بوو ئیمارەتی (حصن کیف)ی دروست کردو مەلیك خەلیلی لەسەر داناو ، بەو شێوە نەیهێشت کوانووی ئەیبوبیان کوێربێتەوە .
جگە لە گەلێ کاری گەورەی دیکەی کە مایەی شانازی گەل و وڵاتێکە .
( بڕوانە : مشاهیرالکردوکردستان . محمد امین زکی ، الجزء الاول بغداد ، مطبعة التفیض الاهلیە ، ١٣٦٤هـ١٩٤٥م ، ص : ١٠٤ـ١٠٦ )
هەروەها : هەڵوێستێکی جوانمەردانەی مەلا ئیدریسی بەدلیسیی . محەمەدعەلی قەرەداغی . هاوکاری ٢٠٦٩ ، ١٩٩٤/١١/٦ .
هەروەها : مەولانائیدریس بتلیسی ، م. جەمیل رۆژبەیانیی . رەنگین ژمارە : ٧٤ ، ١٩٩٤ .

دوژمنانی کوردو داگیرکەرانی کوردستانیش هەمیشە ئەم بارە نالەبارەی دووبەرەکیی‌و ناتەبایی نێوانیانیان قۆستوەتەوەو ، لەو رێگەوە هەوڵی لەناوبردنی سەربەخۆیی میرنشینەکانی کوردیان داوە ، ئەوەی راستیی بێ کوردەکان هەتا نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەهەم دەستبەرداری سەربەخۆیی خۆیان نەبوون(٤٣) .

گومان لەوەدا نیە کە دەوڵەتی عوسمانی‌و دەوڵەتی ئێران هەمیشە رێبازی سیاسەتی (لێکیان کەرەوەو تێکیان بەرەوە)یان لە نێو هۆزو بنەماڵە ناسراوەکانی کورددا بەکارهێناوە ، تا بتوانن لەو رێگاوە بەئاسانیی بەرژەوەندیی تایبەتیی خۆیان لە کوردستاندا بەدەستبێنن‌و ، نەهێڵن یەکێتیی‌و یەکدلیی‌و هاوکاریی لەنێوان کوردەکاندا بچەسپێ‌و ، بۆ ئەم ئامانجە بەگژیەکداکردنی هۆزو تیرەو بنەماڵە کوردەکان چاکترین چەك‌و نزیکترین رێگەبوە . بۆ نموونە حوکمڕانانی ئەردەڵان بە پیلانی ئێرانیەکان دژی بابانەکان دەجووڵانەوە ، یا وەکوو بابانەکان بە پیلانی عوسمانیەکان دژی ئەردەڵانیەکان کاریان دەکردو ، بە درێژایی تەمەنی ئەم دوو میرنشینە بەپیلانی ئەم دوو دەوڵەتە لەشکریان لەیەك کردوەو هەزاران کوردی بێچارەو بێتاوان لەم شەڕانەدا خوێنیان رژاوەو گوندیان تالان کراوە(٤٤).

عەلی سەیدۆ گۆرانیی لەم بارەوە دەڵێت : ئەگەر میرنشینی ئەردەڵان‌و میرنشینی بابان‌و باقیی میرنشینە سەربەخۆکانی کورد یەکیان بگرتایە هیچ هێزێکی بێگانە نەیدەتوانی زەفەریان بێ بەرێت‌و لەناونەدەچوون(٤٥) .

---

(٤٣) راپەڕینی کوردەکان ، نووسینی د. جەلیلی جەلیل ، وەرگێڕانی لە رووسیەوە د. کاوس قەفتان ، بەغدا ١٩٨٧ ل : ١٩ .

(٤٤) بڕوانە نەخشی جاف لە سایەی چەند سەروکێکیەوە لە مێژوودا ، د. حەسەن جاف ، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق دەستەی کورد ، ژمارە ٢١/٢٢ .

(٤٥) من عمان الی عمادیە ، علی سیدو الگورانی ، عمان ١٩٣٩ ، ص ٩٧ .

ئەم بارو دۆخە کارێکـی زۆری بوە کـە ئێرانیەکـانو تورکەکـانو والیەکانی بەغدا بتوانن بە ئاسانیی تووی دووبەرەکییو دوژمنایەتـی لـە نێوان بنەماڵەی میرنشینە کوردەکانو سەرۆکهۆزە کوردەکاندا بچێنـنو بیانکەن بە گژ یەکداو ، دوژمنایەتی ناوخۆی بنەماڵـەی بابـان نموونـەی ئەمەیە • یەکێ لە فەرمانڕەوایانی بابان لەم بارەوە بەم شێوە لای میستـەر ریچ سکاڵای کردوە : حەسـوودیی بەینی ئومـەرای ئێمـە بوەتە هـۆی ماڵوێرانیی بەبە ، بەڕاستیی ئەگەر نیفاقو حەسادەتی بەینی ئومەرای بەبـە نەبوایە نە تورکو نەئێران نەیانئەتوانی زەفەرمان پێببەن[٤٦] •

ئەوەی ئاشکرایە میرە کوردەکان هەمیشە خۆیان زیاتر لە پێنـاوی عوسمانییو ئێراندا بەختکردوەو خوێنیان بۆ رشتوون ، یا بـە فەرمـانو پیلانی ئەوان دژی یەکتری راستبوونەتەوە ، ئەم کارەیش ئەوەندەی تـر لە بەرچاویاندا سووکی کردوون ، تەنانەت زۆریان بوون بـە ژێر دەستـەو کەوتوونەتە تەنگانەوەو بوون بـە دەسکـەلای دەستیـانو ، لەناوبردنـی میرەکوردەکانو میرنشینەکانیان مەبەستو ئامانجی بەرو دوایان بوە[٤٧] •

ئەم سیاسەتـە بوو بە هـۆی ئەوە ئیتـر لە ساڵی ١٨٤٨ زدا هیـچ میرنشینێکی کورد سەربەخۆیی نەمێنێو دوا ئیمارەتی کورد کە ئیمارەتـی بابان بوو ، لە دوای دووصەد ساڵ فەرمانڕەوایی ، لە ساڵی ١٢٦٧ك١٨٥١زدا بە تەواویی لەناوچوو[٤٨] ، هەموو ولاتی کوردستان راستەوڕاست کەوتە ژێر حوکمی داگیرکەرانەوە •

---

(٤٦) تأریخ سلیمانیو ولاتی محمد امـین زکـی ، بەغـدا ، ١٩٣٩ ل : ١٦ .
هـەروەها : عرب وکـرد ، منـذر الموصـلی ، بیـروت ١٩٨٦ ، ص : ١٨٥ ـ ١٨٦ •

(٤٧) یادداشتەکانی رەفیق حیلمی ، بەشی یەکەم ، بەغدا ، ساڵی ١٩٨٩ ل: ٢٦

(٤٨) تأریخ سلیمانیو ولاتی ، ل:١٦٢ • هەروەها : میژووی نەتەوەی کورد ،صالح قەفتان ، بەغدا ، ١٩٥٩ ، ل : ٣٢ •

هۆزی جافیش وەك هەموو هۆزە ناسراوە بەهێزەكانی كورد لەو قۆناغەدا هەمیشە كاربەدەستانی ئەم دوو دەوڵەتە لە چوارچێوەی سیاسەتی (جیاكەرەوەزاڵدەبی)دا نەیانهێشتوە هاوكارییەكی بەتین لە گەڵ حوكمڕانانی ئەردەلانو باباندا بكەن ، هەروەها حوكمڕانانی ئەم دوو میرنشینەیان هانداوە بێوچان دەسدرێژیی بكەنە سەر هۆزی جافو ، دەستبخەنە بارودۆخی تایبەتیانەوە ، ئەگەر رێكیش كەوتبێ سەرۆكێكی جاف بەپێچەوانەی ئەم سیاسەتە جووڵابێتەوە ، یان بیروباوەڕی سەربەخۆیی كەوتبێتە كەللەیەوە ئەوە دەسبەجێ هەوڵیانداوە لەناوی بدەن •

كاتێك بەوردیی سەیری كتێبی (مێژووی ئەردەلان)ی مەستوورەی كوردستانی دەكەین چمكێكی ئەم دیاردەی باسمانكرد بەڕوونیی دەردەكەوێ ، ئەگینا ئەبێ چۆن هەڵوێستی میرئەمانوڵلاخان كە هۆزی جافی تالانو قەلاچۆ كردوە لێكبدەینەوە ؟ ئەگەر نەڵێین هاندەرێكی نەبوە جا بۆ ئەوەی خوێندەوارانی بەڕێز باشتر لەم سیاسەتە تێبگەن نووسینەكەی مەستوورەتان سەبارەت بەم هێرشە دووبارە بۆ دەنووسینەوە ، مەستوورە دەڵێت :

( دووسێ ساڵێ پاش بەخۆشی گوزەراندن رابواردن لە بەر ئەوەی كوردی ناوچەی سلێمانییو شارەزوورو هۆزی جاف كە لەسەر سنووری ناوچەی سنە پەزو ئاژەڵیان دەلەوەڕاند ، پێیان لە بەری خۆ زێتر راكێشابوو ئاژاوەیێكی زۆریان لە ناوچەكەدا نابوەوەو ، والیی هەرچەندی دەكرد ، ئەم كردەوەیەی بۆ قووتنەدەچوو ، بڕیاری سەركوتكردنیانی داو، تیرەو هۆزەكانی جافی سەرلەبەر چەپاوداو ، تالانو بڕۆی كردنو ، زوربەی ناودارو بەڕێزانیانی لە شیركێشا • لەم دەگژداچوونو شەڕو شۆڕەدا لەشكری سەركەوتووی ئەمانوڵلاخان پەنجا هەزار تمەنی زێتر بەدەسكەوتو ، هەمووی بۆ سنە نارد • والیی خۆیشی بە تەنتەنەو

هەیتوهووتەوە لە سەر مەریوانو شارەزوورەوە هاتە ناو شاری سلێمانیەوە ، کە مەلبەندی پاشایی بابان بوو ، ئەو سەروبەندە مەحموودپاشا میری بابان بوو . ئەو سەروبەندە مەحموودپاشا بەخۆیو دەسو دایەرەو پیاوماقوولانو بازرگانییو بازاڕییانەوە شاری سلێمانییان چۆڵکردو بۆی دەرچوونو ، هەرچی مالو سامانێکی لە مزگەوتو تەکیەو خەلوەتخانەو کولبەدا شاردبوویانەوە هەموو وەگیر لەشکری ئەمانوڵڵاخان کەوت . وەلەدبەگی جافیش ، کەیەکێ لە هەرە پیاوەگەورەکانی کورد بوو و ئەم هەلکردنەسەرمەلبەندی بابانەش هەر لە بنەڕەتدا بۆ سەرکوتکردنی ئەو بوو ، دەسگیرکراو ، والیی لەگەڵ خۆیدا هێنایە شاری سنەو ، رۆستەمبەگو حەبیببەگو کوڕانی ناودارانی لە قەلای قەسلان زیندان کردن )[٤٩] .

هەر ئەو نووسەرە لە باسی دەوری عەلیقولیخان لە ئەردەلاندا دەلێت :

( عەلیقولیخان پاش ئەوەی بۆ کوردستان گەڕایەوە لەبەر توندوتیژییو زمانپیسیی خۆی زوربەی پیاوماقوولانو ناسراوانی ئەردەلانی لەگەل حسێنبەگی مامۆییدا دەستیان تێکەلکردو لە دژی وەستان . عەلیقولیخان توانی بەرەنگاربوونیانی لە خۆیدا نەدەبینی ، ناچار هەلاتو رووی کردە قەلای یالنگانو ، هەر لەوێ جێگیربوو داوای یارمەتییو پشتگیریی لەخانەپاشای بابان کرد ، خانەپاشایش رۆستەمبەگی جافی لەگەل هۆزەکەیدا بەبانگیەوە ناردو ، هەردو لا بڕیاریان دا شەڕ بکەن )[٥٠] .

---

(٤٩) بڕوانە : با وردتر لە رووداوە مێژووییەکان بکۆلینەوە ، د. حەسەنجاف گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ، ژ : ١١٦ ، سالی ١٩٨٨ .
مێژووی ئەردەلان مەستوورەی کوردستانیی ، وەرگێڕانی د. حەسەنجافو شوکور مستەفا . ١٩٠ — ١٩١ .

(٥٠) سەرچاوەی پێشوو ، ل : ٨٥ .

ئەم رووداوەیش هەر نموونەیێکی ترە بۆ ئەوە کە بابانەکانیش جافەکانیان دژی ئەردەلانەکان بەکارهێناوە •

ئەزیەتو ئازاریك کە میرەکانی ئەردەلان سەبارەت بە هۆزی جافیان ئەنواند بوە بە مایەی ئەوە کە بەشی زۆری تیرەکانی جاف ناچار ناوچەی جوانرۆ بەجێبێلن[51]و ، پەرتو بلاوبنەوە زۆربەیان لە تەك زاهیربەگی کوڕی یارئەحمەدبەگی کوڕی سەیفوڵڵابەگی کوڕی ئەحمەدبەگی جوانرۆدا دێنە ناوچەی میرنشینی بابانەوەو لە دزیایش‌و بانیخێلان جێگیر ئەبن ئەمانە بە جافی مورادیی ناوبانگیان رۆیشتوە •

باسیل نیکتین دەربارەی هۆی هێرشی میرەکانی ئەردەلان بۆ سەر هۆزی جاف ئەڵێت : ئەردەلانیەکان ئەیانویست ناوچەی جافی جوانرۆ داگیربکەن ، ئەمەیش بۆ دوو هۆ :

یەکەم ناوچەکە ناوچەیەکی پڕ لە بەرەکەتو دەغڵودان بوو •

دوەم لە هێزی عەشرەتی جاف ، کە عەشرەتێکی ئازاو نەبەزبوون[52] ئەترسان • تەنانەت دوژمنایەتیی‌و ناحەزیی هۆزی جاف‌و ئەردەلانیەکان گەیشتنە رادەیەکی زۆر سەخت ، بەتایبەتیی پاش کوژرانی زاهیربەگی جاف لە لایەن خانئەحمەدخانی سێیەمەوە • ئەم خانئەحمەدخانە ، کە میرێکی هەڵکەوتووی بنەماڵەی ئەردەلان بووا ەگەڵ نادرشادا تێکچوو و کەوتە بەر رق‌و شالاوی ناوبراوەوە • لەبەر ئەوەی خانئەحمەدخان عەماری لەشکری نادرشای لە ناوچەی سنەدا بەهۆی قات‌وقڕیی ئەو سالانەوە بەسەر فەقیرو هەژاراندا دابەش‌کردبوو ، خانئەحمەدخان بە لەشکرێکی قورسەوە لە سالی ١١٥٥دا ناوچەی سنە بەجێدەهێلێ‌و لە ناوچەی پەوازەوە لە سیروان ئەپەڕێتەوە ، خۆی بە خاکی عوسمانیی

---

(٥١) مێژووی ئەدەبی کوردی عەلائەدین سەجادیی ل : ٤٧ .

(٥٢) الاكراد ، باسيل‌نيكيتين ، بيروت ، ١٩٥٨ ، ص : ١٦٦ .

ئەگەیەنی بۆ کۆمەڵخوازیی[٥٣] • زاهیربەگ ، سەرۆکی عەشایەری جاف بەرەنکاری لەشکرەکەی خان ئەحمەدخان دەوەستێو هەموو لەشکری جافو ئەو دێهاتانە کۆئەکاتەوەو رێ بەلەشکرەکەی خان ئەحمەدخان دەگرێ • دوای لەناوچوونی زاهیربەگی سەرۆکی عێلی جاف ، هۆزی جاف ، ماوەیەك توانستو بڕستیان کزدەبێو لە دەسەلات دەکەون ، بەڵام سەرەڕای ئەوەش ، لە مەیدانی سیاسەتدا دەوری خۆیان ئەگێڕنو بەرچاودەکەون • بۆنموونە ژان گورە ، مێژوونووسی فەڕەنسزی دەڵێت : پاش کوژرانی نادرشا میرزا مەهدی ئەسترابادی ، کە میرزاو لێپرسراوی نادرشا بوو ، داوای یارمەتیی لەسەرەك تیرەو هۆزەکانی کورد کرد کە بریتیی بوون لە پەنجا تایەفەی نیشتەنیی ناوچەی کرماشانو ، کوردستان • لەم هۆزانە تەنها سەرەك هۆزی جافو سەرەك هۆزی مەنگوڕ بەیارمەتیی میرزا مەهدییەوە هاتن[٥٤] • تایبەتێتیی ناوچەی قەڵەمڕەوی جاف ، ئازایەتییو لێهاتوویی جاف ، بەژمارەزۆریی جاف ، هەمیشە بوە بە مایەی هەستبەتوانو لەباریی ئەم خێڵە کە لەگەڵ دەوڵەتی ئێرانو عوسمانیدا بکەونە بەربەرەکانیەوەو سوڵتانەکانی عوسمانییو شاکانی ئێران والێبکەن ، بۆ بەرژەوەندیی خۆیان دڵی سەرۆکەکانیان راگرنو نوازشتیان بکەنو تێکۆشیون لە خۆیانیان نزیك کەنەوە[٥٥]• بەتایبەت سوڵتانەکانی عوسمانیی زیاتریان نازدەکێشان • بۆ نموونە ، بەشێ لەم هۆزی جافە لە دەورو بەری سالی ١٦٢٨زدا کاتێ سوڵتان مورادی چوارەم بەغدای گرتەوە ، دەستی یارمەتییان بۆ درێژکردو لەو سەرکەوتنەدا کەڵەمێردییو ئازایەتیەکی مەردانەیان نواند • هەرسەبارەت

---

(٥٣) مێژووی ئەردەلان ل:٩٧ . تەئریخی مەردۆخ ، بەرگی٢ ، ل : ١٢٢ .

(٥٤) بڕوانە : کتێبی خواجەتاجدار ، ژان گورە ، ترجمە ذبیح‌الله منصوری ، انتشارات امیرکبیر ، بەرگی ١ ، ل : ١١٠ .

(٥٥) الاکراد دراسة جغرافية اثنوغرافيه ، شاكر خصباك ، بغداد ١٩٧٢ ، ص : ٣٧ .

بەمە سوڵتان موراد نازناوی موورادیی پێبەخشیون • ئـەم نازنـاوە لــەو سەروبەندەدا بە نازناوێکی زۆر گەورە دەژمێردرا (٥٦) •

من لام وایە شاعیرێکی زەبردەستی وەك شێخ رەزای تاڵەبانیی هەروا لە خۆڕاییی بە هـۆزی جافیدا هەڵنــەداوەو بەبێسۆنگــە بە قوولەی قافــی نەشوبهاندوون کە ئەڵێ :

خزمینە مەدەن پەنجە لـەگەڵ عەشـرەتی جافا
مێروولـە نەچێ چاکـە بەگـژ قوولــەیی قافـا
کــێ بێ لـە دلێرانی عـەشـایر کـە نەچووبــێ
وەك تیری ئەجەل نووکـەڕمی جافی بـە نافا ؟
خوێنڕێژو شــەڕەنگێزو عەدوبـەندو تـەنومەند
کامیان کە گەنە شێرە لە مەیدانی مەسافا !(٥٧)

ئەم نزیکبوونەوەو متمانەی عوسمانیەکـان لە عێلی جـاف بوو بــە مایەی ئەوە کە هۆزی جـاف لە مەیـدانی زۆرانبـازیی نێوان دەوڵەتــی عوسمانییو دەوڵەتی ئێراندا بەئاشکرا بەرچاوکەوێ •

محەمەدئەمین گولستانە لەم بارەوە شتێکمــان بۆ روون دەکاتــەوەو دەڵێت :

« عەبدوڵلا پاشا • لێپرسراوی عوسمانیەکان ، کە حاکمی ناوچــەی زەهاو بوو و ، ناوچەکە لەژێر دەسەلاتی عوسمانیەکـاندا بــوو ، لەگــەڵ محەمەدخـانی زەنــددا تێكدەچێ • ئــەم محەمەدخـانە یەکێــك بوە لــە سەرلەشکرەکانی زەند ، پەلاماری ناوچەی زەهاو دەدا ، عەبدوڵلا پاشــا داوای یارمەتیی لە عێلــی جـاف بەسەروکـایەتیی قادربەگــی زاهیربەگو باجەلانەکان کردوە ، ئەوانیش بەدەنگیەوە چوونو ناوچەکەیان لەدەســت

(٥٦) الاکراد ، باسیل نیکیتین ، ص ١٦٧ •
(٥٧) بڕوانە دیوانی شێخ رەزای تاڵەبانیی •

رزگارکردوون[٥٨] • وا دیاره دوای کوژرانی زاهیربەگ لەلایەن ئەردەلانەکانەوە ، بابانەکان تا رادەیێکی زۆر پیوەندییان لە گەڵ جافەکاندا بەهێز دەکەن ، بەتایبەت زۆر چاکیان زانیوە کە هێزی جافەکان رۆژبەڕۆژ لە پەرەسەندندایە ئەحمەدپاشای بابان داوای لە قادربەگی زاهیربەگی سەرۆکی عێلی جاف کردوە ، چەند پیاوخراپو جەردەیێ کە ئاسایشی ناوچەی میرنشینی بابانیان شێواندبوو ، لە ناوبەرێ • قادربەگ ئەم خواستە بە رێکوپێکییو بە تەواوەتیی بەجێدەهێنێو هاوکارییەکی تەواو لە نێوان هۆزی جافو بابانەکاندا بەرقەرار دەبێو ،[٥٩] ئەم یارمەتییو پشتیوانیە تا سەردەمی قادربەگی کوڕەزای زاهیر بەگ هەر بەردەوام دەبێت • بەڵام لە سەروبەندی کەیخوسرەوبەگی کوڕی سلێمانبەگدا ئەم پێوەندیە بچڕاو نێوان تێکچوە • وا دیارە میرانی بابان هەولیانداوە دەست لەکاروباری بنەماڵەی سەرۆکەکانی جاف وەردەن ، ویستوویانە بەشی وەڵەدبەگیی بەگزادەکانی جاف کەخالوانیان بوون[٦٠] سەرۆکایەتیی هۆزی جافیان بەدەستەوە بمێنێ ، جگە لەم هۆیە ، وا دیارە میرانی بابان حیسابێکی زۆریان بۆ پەرەسەندنی هێزی عەشرەتی جاف کردوە • ریچ لەم بارەیەوە ئەڵێت : عەشرەتی جاف هەزارسوارو چوارهەزار تفەنگچیی پیادەیان هەیە • پیاوانی ئەم هۆزە ئازاترین پیاوانی هەموو عەشایری

---

(٥٨) بڕوانە : مجمل التواريخ افشاريه وزنديه ، ابو الحسن محمد بن محمد امين گلستانه ، به اهتمام مدرس رضوى ، تهران ، ١٣٤٤ ، ص : ٣٠٠

(٥٩) ئەدمۆنس بە هەڵە نووسیویە کە ئەحمەدپاشای بابان زاهیربەگی کوشتوە بڕوانە : کرد ، ترك‌عرب . ترجمة جرجيس فتح‌الله ، بەغداد ، ١٩٧٥ ، ل : ١٣ .

(٦٠) کلودیوس جیمس ریچ لە گەشتەکەیدا کە باسی راکردنی حەسەن بەگی برای مەحموودپاشای بابان بۆ بەغدا بە پیلانی داودپاشا دەکات بەهەڵە دەڵێ : حەسەن‌بەگ خوشکەزای کەیخوسرەوبەگی جافە . بەڵام لە راستیدا حەسەن‌بەگ خوشکەزای وەڵەدبەگی جافە . بڕوانە : رحلة‌ريچ في العراق عام ١٨٢٠ . ص : ٦٠ .

کوردن ، ئەوەندە ئازان ئازایەتیەکەیان لەناو هەموو عەشایرەکاندا دەنگی داوەتەوەو چەلدارایی ئەم عەشیرەیە ئازاترین جەلداورایی لەشکری کوردن(٦١) .

ریچ بەم شێوە باسی بینینەکەی کەیخوسرەوبەگی سەرۆکی جافی کردوە . لە هەوارەکەی هۆزی جافدا نزیك بە گۆلی زرێوار سەعات ٩/٥ گەیشتینە خێوەتەکانی کەیخوسرەوبەگ کە دوو میل دووربوون لە خوارووی گۆمی زرێبارەوە کەیخوسرەو بەگ خۆیو سێ کوڕیو محەمەدبەگی قادربەگ(٦٢)کە برازای بوو ، هاتن بەپیرمانەوە . کەیخوسرەوبەگ سواری ئەسپێك بووبوو دەمێ سالە ئەسپی وا چاكو جوانم نەدیبوو ، چەند سوارێکی رێکوپێکی باشی جافی لەگەلا بوو ، پالتاوێکی ئەستەمبوولیی کردبوە بەر ، کە داوێنەکەی ئالتوونکاریی کرابوو ، کوڕەگەورەکەشی دەستێ جلی وەکوو جلەکانی باوکی لەبەرابوو ، سەلتەی کوڕەکانیو برازاکەی هەموو بە تەلی ئالتوون چنرابوو ، خێوەتێکیان بۆ من هەلدابوو بۆ ئەوەی پێشوازیی پیاوانی تیا بکەم .

کەیخوسرەوبەگی سەرۆکی هۆزی جاف پێنج کوڕی هەبوون : سلێمانبەگ کە نەتەوەی لێنەکەوتوەتەوە . عەبدوڕەحمانبەگ ، قادربەگ کە بۆ جێگیربوونی عەشیرەتی جاف خزمەتێکی زۆری کردوە(٦٣) .

---

(٦١) هەمان سەرچاوە ل : ٧٨ .

(٦٢) ئەم محەمەدبەگی قادربەگە باپیرە گەورەی بەگزادەکانی بارامبەگییە ،

(٦٣) قادربەگ باوکی ئەمنەخانی شاعیرەی بەناوبانگە کە شووی کردوە بەبارامبەگ بۆ زانینی زیاتر سەبارەت بە ئامینەخان بڕوانە وتاری د. حەسەنجاف ، بەسەردێری ئامینەخانی سەردارو مەولەویو چەند تێبینییەك ، ڕۆژنامەی عێراق ، ژمارە ٢٧٩٦ ١٠ نیسانی/١٩٨٥ .

عەبدوڵڵابەگ[٦٤] کە لە شەڕی گردەگڕوێدا ، کەیخوسرەوبەگی باوکی ناردبوویە یارمەتیی سلێمان‌پاشای بابانەوە لە دژ مەحموودپاشای بابان کە برای‌بوو ، کوژراوەو لە کردی سەیوان نێژراوەو[٦٥] ، محەمەدبەگ ، کە کوڕی بچووکی بوەو ، دەورێکی زۆری لە کێشەو زۆرانبازیی ئێرانو عوسمانیدا گێڕاوە . وا دیارە کەیخوسرەوبەگی جاف دژی‌مەحموودپاشای بابان بوەو لەگەڵ عەبدوڵڵاپاشادا لە دژ مەحموود پاشای بابانی مامی دەستی تێکەڵ‌کردوەو[٦٦] ، ئەم دەستتێکەڵکردنو رێککەوتنە لە شەڕی قەرەگۆلدا بە ئاشکرایی روون دەبێتەوە . ئەم شەڕە لە نێوان لەشکری مەحموودپاشا، بە یارمەتیی لەشکری داوودپاشاو، عەبدوڵڵا پاشا، بەیارمەتیی محەمەدعەلی‌میرزا[٦٧] ، وەلیعەهدی ئێران ، رووی‌داوەو رێکەوتی ئەیلوولی سالی ١٨٢١ز قەوماوە . لەم شەڕەدا لەشکری مەحموودپاشاو داوودپاشای والیی بەغدا ، بە سەختیی شکاوەو محەمەدعەلی میرزا عەبدوڵڵاپاشای بابانی

---

(٦٤) عەبدوڵڵابەگ لە شەڕی گردەگڕوێدا کوژراوە . داستانی کوشتنی عەبدوڵڵاپاشا خەسرەوجاف بەشێوەیەکی زۆر شیرین لە رۆمانەکەی (پاشایان‌کوشت)دا دایڕشتوە . بڕوانە : پاشایان کوشت، بەغدا ، ١٩٩٣ ، ل : ٨٧ .

(٦٥) بڕوانە : تأریخ سلیمانی‌و ولاتی ، محمد امین زەکی‌بەگ ، ل : ١٥٣ .

(٦٦) د. عەبدولعەزیز سولەیمان نەوار ئەڵێت : هێزی مەحموود پاشا یەکجار لاوازبوو دوای ئەوەی هۆزی جاف بەسەرۆکایەتیی کەیخوسرەوبەگ دایانە پاڵی هێزی عەبدوڵڵاپاشای مامی مەحموودپاشا بە پشتیوانیی محەمەدعەلی میرزا وەلیعەهدی ئێران هێزی داوود پاشاو مەحموودپاشا بابانیان شکاند . بڕوانە : تأریخ الشعوب الاسلامیة في العصر الحدیث ح/١ ، ص : ٢٠٩ .

(٦٧) محمد علی‌میرزا کوڕی گەورەی فەتحعەلی‌شاە سالی ١٢٠٤ لەدێی نەوا لەدایك‌بوە ، نازناوی دەولەتشایەو حاکمی ناوچەی‌کرمانشاەبوە . دوای سەرکەوتنی بەسەر لەشکری داودپاشادا لەشەڕی قەرەگۆلدا محەمەدئاغای کەهیە لە ترسی داودپاشاخۆی تەسلیمی شازادە محەمەدعەلی‌میرزا کردو، دوای ئەم رووداوە ئابلووقەی بەغدای دا . بەلام بەهۆی بلاوبوونەوەی نەخۆشیی رشانەوە لە لەشکرەکەیدا خۆیشی بەو نەخۆشییە سالی١٢٣٧هـ لە شاری کرند وەفاتی کرد .

کردوه به حاکمی سلێمانی(٦٨) • خوالێخوشبوو محەمەدئەمین زەکی بەگ ، بۆ تەوجیهی سیاسەتی دووڕوانەی میرەکانی بابان ئەلێت : (واقیعەن ئەگەر بە چاوێکی ئینصافو بێتەرەفیی لە ئەحوال وردبینەوە ، ئەبێ سیاسەتی دووڕوویی ئومەرای بەبە لۆمە نەکەین ، چونکە زەمانەیان دووڕوو بوو لەبەر ئەوە ئەوانیش گیرۆدەی زەمانە بوون • ئەگەر بە نەوعێکی تر حەرەکەتیان بکردایە ئیشیان سەری نەدەگرتو زووبەزوو لەناو دەچوون • لەگەڵ ئەمە لازمە ئیعتیراف بکەین کە بەعزێکیان زۆر لەحەد چوونەدەرەوەو هیچ مولاحەزەی مەنافیعی موشتەرەکەی خۆیانو خەڵکی ولاتەکەیان نەکردوە )(٦٩) •

وا بزانم تا رادەیەکی زۆر ئەم بیروباوەڕەی خوالێخوشبوو محەمەدئەمین زەکیبەگ لە راستیەوە نزیکە ، مولاحەزەنەکردنی مەنافیعی بنەماڵەکەیانو تێکچوونیان لەگەڵ یەکتردا ، بۆ نموونە تێکچوونی عەبدوللا پاشای مەحموود پاشاو حەسەنبەگو سلێمانبەگی برای مەحموودپاشا لەگەڵ مەحموودپاشاداو ، تێکچوونی مەحموودپاشا لەگەڵ پاشای کۆرەی رەواندزداو ، تێکچوونی لەگەڵ کەیخوسرەوبەگی سەرۆکی هۆزی جافدا ، ئەمانە هەموو بوون بە مایەی تێکچوونی ترازووی هێزو دەستدرێژکردنی عوسمانیەکان کە لەوپەڕی لاوازیدا بوون ، یا وەکوو ئێرانیەکان کە وەزعیان لەوان باشتر نەبوو ، بۆ کارو باری ناوخۆی ئەو میرنشینە حاڵ ئەگاتە رادەیەك ، بۆ نموونە شازادە محەمەدعەلی میرزا بە لەشکرێکەوە حوکوومەتی بابان لە مەحموودپاشا دەسێنێتەوەو ، ئەیسپێرێتە عەبدوللاپاشای مامی •

---

(٦٨) تأريخ سليمانىو ولاتى ، ل:٤٣ . والسليمانيه من نواحيها المختلفة ، جمال بابان ، ٣٨٥ .

(٦٩) تأريخ سليمانىو ولاتى ، ل : ١٤٩ .

کەیخوسرەوبەگی جاف لە تەمەنی ٤٤ سالیدا سالی ١٢٤٤ی‌ك کۆچی دوایی کردوە • ئەوەی ئاشکرایە میستەر ریچ لە سالی ١٨٢٠زدا دیویەتی‌و لە کتیبەکەیدا باسی کردوە • کەیخوسرەوبەگ نیشانەی گۆڕەکەی لەسەر چەم‌و ئاوێکی نزیك شاری سەیید صادق لە ناوچەی شارەزووردا ئێستایش هەرماوە •

دوای کەیخوسرەوبەگ حەمەپاشای کوڕی لە تەمەنی چواردە سالیدا بە سەرۆکی عەشیرەتی جاف داندرا • حەمەپاشا لە سالی ١٢٣٠ك‌دا (١٧١٤-١٧١٥)لەدایك‌بوە • حەمەپاشا پیاوێکی ئازاو نەترس‌و ژیر بوە • توانیی هۆزی جاف یەك‌بخاو بیانکاتە خاوەن دەسەلاتێکی گەورەو فراوان ، سەری بۆ کاربەدەستانی هەردوو دەولەتی عوسمانیی‌و ئێران شۆڕنەکردوەو[٧٠] ، ئەم دوو دەولەتە هەمیشە مەترسییان لێ‌کردوەو تێکۆشیون کە بە هۆی میرنشینە کوردەکان ، یا لە ڕێی دژمنانی تری ئەم هۆزەوە لە ناوی بەرن[٧١] •

بەپێی یادداشتەکانی کەریم‌بەگی فەتاح‌بەگی جاف (باوکم) ئەحمەدپاشای بابان لەگەل حەمەپاشای جافدا نێوانیان خۆش نەبوە • ئەحمەدپاشای بابان ویستوویەتی ئەحمەدبەگی وەلەدبەگ کە خالی بوە ، بکا بە سەرۆکی هۆزی جاف‌و ، بۆ ئەم مەبەستە ویستوویە حەمەپاشا بە فێلێ بگرێ ، بۆسلێمانی بانگ کردوە ، بەلام نەچووەو چەند بەگزادەیێکی لە خزمانی نزیکی لە جیاتیی خۆی ناردوە • ئەحمەدپاشای بابانیش ئەم بەگزادانە دەگرێ‌و لە کۆیێ زیندانیان دەکات • حەمەپاشایش بەرانبەر بەم کردەوەیە ئەحمەدبەگی وەلەد بەگی جاف دەگرێ‌و ، مالەکەی تالان دەکات‌و

---

(٧٠) گۆڤاری ژیان سالی ١٠ژمارە ٤٥٠.هەروەها : العراق الحديث من سنة ١٩٠٠ - ١٩٥٠ . ترجمة سليم طه التكريتي ، بغداد، ١٩٨١، ص ٥٤ .
(٧١) گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژ : ١١٦ ، ١٩٨٨ ، ل : ٤٤ .

لەگەڵ هەموو تیرەو هۆزەکانی جافەتیدا بۆ ناوچەی ئەردەلان دەچن •
بەڵام بە هۆی حزمایەتیی ئەحمەدبەگی وەبەدبەگ لە ئەو والیی ئەردەلاندا ،
کە ژنو ژنخوازییان لە نێواندا هەبوە، ئیتر لەو ناوچەیەدا ناتوانن بژیو ناچار
بۆ خاکی عوسمانیی دەگەڕێتەوەو ، لە دەوروبەری خانەقیو قزڕەباتدا
دادەمەزرێتو ، خۆشی دەچێتە لای والیی بەغدا ، حوکوومەتی بەغدایش
زۆری ڕێز لێ دەنێو لەگەڵ عەشایەری جافدا ، لە دەوری قزڕەبات
جێگیریان دەکاتو زۆریان یارمەتیی دەدات • سەرەنجام ئەحمەدپاشای
بابان وا بە مەسڵەحەت دەزانێ ، کە لەگەڵ حەمەپاشادا ئاشتبێتەوەو ،
ئیتر بەم جۆرە لە پاش سێ ساڵ ، هەردووکیان ئاشتدەبنەوەو حەمەپاشا
دەگەڕێتەوە ناوچەی شارەزوور • واتە تا پایانی میرنشینی بابان کە ڕێکەوتی
ساڵی ۱۲٦۷ ك (۱۸٥۱ز)[٧٢] لەو ناوچەیەدا دەمێنێتەوە • کاتێ کە لەشکری
نەجیب پاشا والیی بەغدا[٧٣] دێتە سەرئەحمەدپاشای بابان ، بەپێی نووسینی
ئەمینزەکی بەگ ، حەمەبەگی جاف بەدەنگیەوە ناچێت[٧٤] • بەڵام بەپێی

(٧٢) هەندێ لە مێژوونووسان لەو بڕوادان نەجیبپاشا ساڵی ۱۸٤۹
لەکارخراوە ، کە لەگەڵ ئەم تەئریخەدا ناگونجێ . بەڵام ئەو مێژووەی
سەرەوە ڕاستە ، ( بڕوانە : لمحات اجتماعية عن تأريخ العراق الحديث .
علي الوردي ، ج/۲ ص : ۱۹۱ ) .

(٧٣) نەجیبپاشا ساڵی ۱۸٤۲ بوەتە والییبەغدا ، لە دەورەی
سولتانمەحموودی دووەمدا ، وە بە توندوتیژییو ستەمکارییو
خۆبەزلزانین بەناوبانگ بوە . لەگەڵ عەشایەرەکاندا زۆر بە توندیی
جووڵاوەتەوەو ، زۆر ڕقیانلێیبوە . لە سەردەمی ئەودا کوشتاری
کەربەلا ڕووی داوە کە بوە هۆی تێکچوونی نێوان ئێرانیەکانو
عوسمانیەکان ، سەرەنجام بەسەرپەرشتیی ئینگلیزو فەرەنساو ڕووس
پەیماننامەی (ارزنةروم)لە ساڵی ۱۸۲۳دا بەسرا . (بڕوانە : اربعە قرون
من تأريخ العراق الحديث . لونگريك ، ترجمة جعفر الخياط ، بغداد ،
۱۹٦۲ ) .

(٧٤) تأريخ الدول والامارات الكردية . محمد امين زكى ، القاهرة ، ترجمة
محمد على عونى ، ۱۹٤٥ ص : ٤۲۲ .

یادداشت‌و بەڵگەو دەساوێژێکەوە کە بەدەست بنەماڵەی جافەوە تا ئێستا ماون ، حەمەبەگی جاف ، هەرچەند لە دلەوە لە ئەحمەدپاشای بابان زویربوە، بەڵام کاتێ ئەحمەدپاشا لێی دەقەومێ‌و لەشکری نەجیب‌پاشای دێتە سەرو تەنگی‌پێ‌هەڵدەچنێ ، ناچار دێتە ناو عەشایەری جاف‌و[75] حەمەبەگی جاف بەدەنگیەوە دەچێ‌و لەشکرێکی بۆ پێکەوە دەنێ ، بەڵام وا دیارە لەشکری ئەحمەدپاشای بابان نەیتوانیوە بەرانبەرهێزی ڕێکوپێکی لەشکری نەجیب‌پاشا خۆی ڕاگرێ •

وەك لە پێشەوە وتمان میرنشینی بابان لەساڵی ١٢٦٧ی‌ك (١٨٥١ز)دا لەناو دەچێ • پاش ئەحمەدپاشای بابان ماوەیێ عەبدوڵلا پاشای برای بە ناوی قایمقام لە سلێمانی فەرمانڕەوایی کردوە • ئەم عەبدوڵلاپاشایە لەگەڵ حەمەپاشای جافدا نێوانیان تەواو خۆش بوە • پاشان لیوا ئیسماعیل پاشای تورك لە لایەن حوکوومەتی ئەستەموولەوە کراوە بە فەرمانڕەوای سلێمانی•

ئەوەی نمایانی باسە دەوڵەتی عوسمانیی لە نیوەی یەکەم‌و دووەمی سەدەی نۆزدەهەمدا هەوڵی داوە بە دەستێکی پۆڵایین بەسەر کوردەکان‌ڕابگاو میرنشینەکوردەکان بۆ یەکجارەکیی لەناو بەرێ • بەڵام ئەوی ڕاستە کوردەکان هەروا بەئاسانیی ملیان بۆ کاربەدەستانی عوسمانیی شۆڕنەدەکرد • ئەگەر بە وردیی لەو هۆیانە بکۆڵینەوە دەبینین دەسەڵاتی عوسمانیی لە کوردستاندا هەروا بەناو مابوەوە ، سەرەك‌هۆزو میرە بەدەسەڵاتەکانیان هەرکاو ناکاوێ لە بابی عالیی یاخیی دەبوون‌و ، حوکوومەتیی عوسمانیی هەر بەوەڕادەگەیشت لەشکر بکاتە سەر کوردستان‌و میرەکوردەکان سەرکوت بکا • بەڵام کوردەکان بەهۆی هاندرانەوە لە لایەن ئێران‌و محەمەدعەلی پاشای میسرەوە هەمیشە لە

---

(٧٥) دەستنووسی مستەفابەگی جاف ، مێژووی ئێلی جاف .

گوێبەفەرمانیی عوسمانیەکان سەرپێچییان دەکردو ، جاری شۆڕشیان دەدا • خەبەری شکستی عوسمانیەکان لە سالی ١٨٣٩دا لە لایەن محەمەدعەلی پاشاوە بەکوردەکان گەیشت ، دووبارە شۆڕشیان بەرپاکردو(٧٦) ، پاشاکۆرەی رەواندز ، کە هاوپەیمانی ئیبراهیم پاشای کوڕی محەمەد عەلی پاشابوو ، سوودی لەم هەلە وەرگرتو ناوچەی هەولێرو زاخۆو دهۆكو جزیرەی بن‌عومەرو دێهاتەکانی دەوروبەری داگیرکرد(٧٧) •

دوای بەستنی پەیماننامەی (ارزنەرومی) دوەم ، کە لە سەرەتای موحەڕەمی ١٢٥٩ك ١٨٤٢زدا دەستی‌پێکردو ، لە شانزەهەمی جیمادی‌ثانی ١٢٦٣ك١٨٤٧زدا تەواوبوو ، لە دوای مردنی سوڵتان‌مەحموودی دوەمی عوسمانییو محەمەدشای قاجارییو هاتنەسەرحوکمی سوڵتان عەبدولمەجیدو سوڵتان‌عەبدولحەمیدی عوسمانییو ، ناصرەدین شای قاجار ••شەڕ لە نێوانی ئەم دوو دەوڵەتەدا خاوبووەوەو شەڕی گەرم لە نێوانیانا نەما ، وەك مادەی هەشتەمی ئەم پەیماننامە ئەم راستیەمان بۆ روون دەکاتەوە • لەم مادەدا هاتوە : هەردوو دەوڵەتەکە موافەقەتیان کرد بە هێزی هەردوو لا لەو عەشایەرە کوردانەی کە لەسەر سنوورەکان هاتوچۆ دەکەنو ئاژاوە ئەنێنەوە ، بدەنو ، لەشکری هەردوولا لەسەر سنوورەکان جێگیر بێ(٧٨) •

لەم قۆناغەدا بوو هۆزی جاف یەکجار بەهێز بوونو ، سەرۆکی هۆزی جاف حەمەپاشای جاف بەهەموو توانایەکیەوە هەولی داوە هۆزەکەی

---

(٧٦) تأريخ عرب درقرون جديد ، لوتسكى ، ترجمة پرويزبابائى تهران ، ١٣٤٩ ص : ١٤١ .
هەروا کتێبی عربو کرد ، منذر الموصلي ، بيروت ، ١٩٨٦ ، ص : ١٩١ .
(٧٧) لمحات اجتماعية من تاريخ العراق الحديث ، علي الوردي ، ج/٢ ، ١٩٧١ . بغداد ، ص : ٩٥ .
(٧٨) امير كبير در ايران ، دكتر فريدون ادميت ، تهران ، ١٣٤٨ ، ص : ١٣٦

بەسەربەخۆیی بژینو ، لەم ڕووەوە ، وەکوو باسمان کرد هەوڵی داوە سەر بۆ کاربەدەستانی ئێرانو عوسمانیی دانەنەوێنێ • لەبەر ئەمە عەشایەری جاف گرفتارییو نارەحەتیەکی زۆریان بۆ دەوڵەتی عوسمانیی پێك‌هێنا(٧٩) •

دەوڵەتی عوسمانیی بۆ راکێشانی حەمەپاشا نازناویپاشایەتیی پێبەخشیوە • بەڵام درانی ئەم نازناوە بە حەمەپاشا ئەو لە بیری سەربەخۆیی ناهێنێتەخوارەوە ، لە ساڵی ١٨٢٣دا لە نارچەی شێروانە لە دەوروبەری کەلاری ئێستادا قەڵایەکی گەورە دروست دەکاتو(٨٠) ، ئەم قەڵایە تا ئێستا ماوەو رەمزی سەربەخۆییو دەسەڵاتی ناوبراوە(٨١) •

---

(٧٩) تأريخ العراق الحديث في نهاية حكم داود پاشا الى نهاية حكم مدحت پاشا القاهرة ، ١٩٦٨ ، ص : ٧٠ •

(٨٠) بۆ زانینی زۆرتر لە بارەی ئەم قەڵاوە بڕوانە گۆڤاری ( الف باء )ژمارە (١٠٩٩) ساڵی ١٩٨٩ . هەروەها : رۆژنامەی عیراق ژ : ٤١٨٧ ساڵی ١٩٨٩ •

(٨١) شاعیری بەناوبانگی کورد شێخ ئەحمەدی شێخ محەمەدی شێخ سەعیدی شاکەلیی بە چەند شیعرێکی جوان باسی ئەم قەڵای بەم جۆرە نووسیوە •

گردی شیروانە سەیرانی سیروان
مەنزەڵەی بەرزی خاسی ئەمیران
قەڵای سەربەرزو قەسری تاجدار
جێگەی عوشرەتی میری کوردەوار
چاوئەندازی تۆ دوو فەزای کوردن
یەك لەیەك زیاتر بە دەسو بردن
بەئیخلاسەوە ئاوەکەی سیروان
داوەن بۆستە بە کوڵ بەگریان
سروەی دەشتەکەت وەرەم لابەرە
شنەی ئاوەکەت نەشئەی دولبەرە
بینای ئەساسی نەوشیرەوانی
یا قەڵای قایم (کوردەمیر)انی
هاتە سەر زمان بە گریانەوە
خۆیو ئەمیری ئەلاوانەوە :

حەمەپاشا ئەبێ بە هۆی ناڕەزایی عوسمانیەکانو لەسەر ڕووداوێك کە بوە بە هۆی هەلسانی حەمەپاشاو جێهێشتنی حالی عوسمانیی. ڕووداوەکەیش ئەوە بوو لە سەردار عومەرپاشا[٨٢] داوا لە حەمەپاشای جاف دەکا لە ناوچەی شارەزووردا زەویوزار بکڕێ، بەمەرجێ جافی کۆچەریی تێدا نیشتەجێ بکاتو ڕەسمێ بخاتە سەریان. حەمەپاشا ئەم فەرمانەی بەدڵ نابێ، چونکە لای وا دەبێ دامەزرانی جافو بەکشتوکاڵەوە

---

**بانی ئەساسم نەوشیرەوانە**
**تەئریخی ڕۆشن نەوشینڕەوانە**
**بەلام ئەم قەسرەو ئەم بورجە سەختە**
**کردەی میری جاف ئەو [ دارابەخت ]ە**
**لایق بە جێگەی نەوشیرەوان بوو**
**حوکمی عەدالەت ئەمری ڕەوان بوو**
**ئەم ئەرزو ئاوو شاخو درەختە**
**ئەو حاکمی بوو لەسەر ئەم تەختە**
**چەن میرو وەزیر مەجلیسیان ئەگرت**
**لە عورووسیا تەدبیریان ئەکرد**
**جێگەی عوشرەتو مەزرەی بەزم**
**کلاوفەرەنگیی شاهانەتەرزم**
**من قەسری چەرخی پاشای جافانم**
**کۆنەهەوارگەی ( کوردەمیر )انم**

بڕوانە: دیوانی شاکەلی، شاعیری گەورەی دەشتی گەرمیان، ساغکردنەوەی جەمال محەمەد. ١٩٧٨، ل: ١١٩ - ١٢١.

(٨٢) عومەرپاشا ساڵی ١٨٥٧ز بوەتە والیی بەغدا دوای ڕەشیدپاشا بە ڕەگەز هەنغارییە. لە شەڕی (قرم)دا کە لە نێوان دەوڵەتی عوسمانییو ڕووسدا ڕوویدا بە بێباکییو ئازایەتییو کەڵەمێردیی ناوبانگی دەرکرد. سیاسەتێکی یەکجار تیژی لەگەڵ هۆزەکانی کوردو عەشایەرەکانی عێراق بەعەرەبو کوردەوە، بەکارهێناو، هۆزەکانی کوردیش بوونە قۆچی قوربانیی ئەم سیاسەتە نالەبارەی عومەرپاشا، بە تایبەتی چەند ناسراوێکی لە هۆزی ئازای هەمەوەند لەناوبرد. عومەر پاشا ٢٥ی ئەیلوولی ١٨٥٩لە ویلایەتی بەغدا دەرکرا. ( بڕوانە: **لمحات اجتماعية ج/٢، ص: ٢١٦** ).

خەریکبوون مانای بەدیلبوونیانەو ، بەمە سەربەستیی خۆیو هۆزەکەی لەدەست دەدا ، ئیتر بەم بۆنەیەوە حەمەپاشا سەرپێچیی لە فەرمانی عومەر پاشا دەکاتو پێیڕادەگەیەنێ کە ئەوان وەکوو بازێك سەربەستنو کوێیان بەدڵ بوو لەوێ دەنیشنەوە ، چۆن بەدەستی خۆیان دەستو پەلی خۆیان دەخەنە زنجیرەوە ؟ هەر شوێنێ ئەوانی پیابڕۆن موڵکی جافە چ لە ئێرانو چ لە عوسمانیی[٨٣] •

عومەر پاشا لەم وەڵامەی حەمەپاشا زۆر قارس دەبێو ، بڕیاری ئازاردانی عەشرەتی جاف دەدا • حەمەپاشایش لەتەك گشت تیرەکانی جافدا روو دەکاتە ئێران ، بەڵام تایەفەی کەرەموەیسیی ،کە فیرقەیەکن لە تیرەی شاتریی ، لەتەکیا نارۆن بۆ ئێران • حەمەپاشا روو دەکاتە ناوچەی جوانڕۆ لە هاویندا و ، زستانیش دەچنە ناوچەی زەهاو کە گەرمیانە ، دەوڵەتی ئێران بۆ نزیکبوونەوە لە هۆزی جافو راکێشانیان بۆ خزمەتی سیاسەتیان رێزێکی زۆریان لە حەمەپاشا گرتو لە لایەن ناصرەدینشای قاجارەوە نازناوی خانی پێبەخشراو ، میرنشینی زەهاوی پێدراو ، هەموو ناوچەی سەرسنووری ئێرانو عوسمانیی پێسپێردراو ، عوسمانبەگی کوڕی دەکرێ بە حاکمی جوانڕۆ • بۆ نموونە ئەم فەرمانەی ناصرەدین شایە کە حەمەپاشای جافی پێکراوە بە حاکمی ناوچەی زەهاو لێرەدا بڵاودەکەینەوە :

---

(٨٣) یادداشتەکانی حەسەنفەهمی جافو مستەفابەگی کەریم بەگی جاف ، هێشتا دەستنووسن •

( حکم فرما شد انکه عالیجاه اخلاص‌و ارادت آگاه مقرب الحضرة
محمد پاشای حاکم زهاب سرافراز بوده بداند چون خدمات آباءو اجداد آن
عالیجاه که همواره در ان صفحه نموده‌اند منظور نظر سرکار والا بوده ومراتب

خزمتگزاری وصداقت آن عالیجاه بدرجه وضوح و ظهور رسیده بپاس خدمات
اسلاف و لیاقت و کاردانی آن عالیجاه واز (۰۰۰)حکومت زهابرا کما في
السابق بعهده آن عالیجاه مقرر و مرحمت فرمودیم که مشغول انجام خدمات
محوله بخود بوده وحسن کفایت خودرا بمرتبه ظهور رسانیده با تمام اهتمام
در صدد آبادی و نظم آن صفحه واسایش رعیت وساکنین انجا برآمده مالیات
دیوانی بخود مقرر عاید دارد مقرر عالیجاهان میباشد که (دیوانی) وکدخدایان و
ریش‌سفیدان زهاب عالیجاه مشارالیه را در ترار این رقم مبارک حاکم خــود
دانسته از سخنان او تجاوز نکرده از مقرری ... آنرا در احتیاط و
استیفای مالیات دیوانی سند ... شهر شوال المکــرم
(۰ ۱۲۹۱

مۆری ناصرەدین‌شای قاجار

**تەرجــەمەکــەی :**

فەرمــان‌درا محەمــەد پاشــای فەرمــانڕەوای پایەبلنــدو دڵســۆزو لەئێمەوەنزیك کە بەم فەرمانە سەرفراز‌کراوە بزانێ‌لەبەر ئەوەی خزمەتــی باوباپیرانی ئەو پایەبلندە لە لەو ناوچەیەدا کردوویانە جێی ڕەزامەندیــی ئێمــە بوە ، پلــەی خزمەتــوزاریی‌و ســەرڕاستیــی ئــەو گەیشتوەتــە ڕادەی ئاشــکرایــی‌و ڕوون‌بوونــەوەو بەرانبــەر خزمەتــی باوباپیرانیــی‌و لێهاتوویی‌و کارزانیی ئەو پایەبلندە فەرمانڕەوایی زەهاومــان وەك جــاران بەزەوڕووی کردەوەو ، بۆ ئــەوەی خەریکــی ئەو خزمەتــە بێ کــە پێــی سپێرراوەو ، بۆ ئەوەی لێهاتوویی‌و کارزانیی خۆی لەم مەیدانەدا بنوێنێ‌و بەوپەڕی پەرۆشەوە هەوڵی ئاوەدانکردنەوەو ئاسایشت فەراهەمکردن بــۆ خەڵکی ناوچەکە بداو ماڵیاتی‌و خەرج‌و باجێکی کە بۆ دەوڵەت دانــدراوە جێ‌بەجێ بکاو پێویستە لەسەر کوێخاو ڕیشسپیی‌و پیاوماقووڵانی ناوچەی زەهاو بەپێی ئەم فەرمانە پیرۆزە ، ناوبراو بە فەرمانڕەوای خۆیان بزانن‌و لە قسەی حیسابیی دەرنەچن‌و ، هەر پسووڵەو قەبزێکی ئەو بۆ وەرگرتنی باج‌و خەراجی دیوان بەڕەسمیی بزانــدرێ ۰ مانگی شــەوالی موکــەڕەم ، ساڵی ۱۲۹۱ ۰ مۆری ناصرەدین شا ۰

حەمەپاشا نزیکەی سێ ساڵ لەئێران دەمێنێتەوە ، لەم ماوەیەدا هۆزی جاف دەسەلاتو تواناییەی ئیکجار زور پەیدا دەکەن • دەستدریژیی دەکەنە سەر ناوچە سنوورەکانی دەولەتی عوسمانیی • حەمەپاشا ئەو ناوچەیە دەشێوێنێ • کە کاربەدەستانی دەولەتی عوسمانیی بەجارێ تەنگەتاو دەبنو هەرچی تیدەکۆشن لە ناویبەرن دەستیان نایکاتێ ، ناچار ئەم دەولەتە پەنا دەباتە بەر دیبلۆماسییەتو بە هۆی بالیۆزخانەکەیانەوە لە تاران داوای تەسلیمکردنەوەی حەمەپاشا دەکەن(٨٤) • بەلام ئێران بەدەستیەوە نادات • دەسەلاتی فراوانی حەمەپاشا لە ئێراندا نارەزایی کاربەدەستانی ئێران دینێتە گایەوە ، بەتایبەت کە حەمەپاشا لەگەڵ شازادە (معتمد الدولە)فەرهاد میرزادا، کەمامی ناصرەدینشاه بوو(٨٥)لە ساڵی ١٢٨٤-١٢٩١كدا والیی سنە بوە تیکدەچێ • والیی داوا لە حەمەپاشا دەکات عەشایەری جاف لە ئێراندا جێگیر بکاتو تابیعییەتی ئێران وەربگرنو رێگای دەستدرێژیی تیرەکانی جاف نەدا بۆ سەر ناوچە سنوورەکانی ئێرانو ، ئەگەر بێتو سەرپێچیی لەم فەرمانە بکرێت ماوەی هاتوچۆی تیرە کۆچەرییەکانی کورد نادرێ کە لە خاکی عوسمانییەوە بێنە ناو خاکی ئێران • حەمەپاشا ئەم فەرمانە

---

(٨٤) ئەم داخوازیەی دەولەتی عوسمانیی لە یادوداشتەکانی میرزا ملکم خان لە گۆڤاری (بررسیهای‌تأریخی)ژمارە یەکەمی ساڵی پێنجەمی نیسانی ١٩٧٠ - ١٣٢٩دایە •

فەرهاد میرزا (معتمد الدوله) کوڕی فەتحعەلیشایە ، مامەی ناصرەدینشاه ساڵی ١٢٣٣ك لەدایكبوە بە سەختگیریی‌و خوێنرێژیی بەناوبانگە ، لە ناو فارس‌و کوردستاندا فەرمانرەوایی کردوە ، دەستی نووسینیشی بوە • کە کتێبی زنبیل‌و مقتل قائمقام‌و جام‌جم لە دانانی ئەون • ساڵی ١٣٠٥ مردوە •

بڕوانە : تأریخ عضدي ، شاهزاده عضدالدولة سلطان‌احمد میرزا ، بە اهتمام د.حسن‌نوایی ، تهران ، سال٢٥٣٥س‌ص : ٢٨٨ •

(٨٥) تأریخ مردوخ ج/٢ ، ص : ١٩٥ - ١٩٧ •

قوبووڵناکاتو شەڕو شۆڕێکی زۆر لەناو عەشایەری جافو هێزی دەوڵەتی ئێراندا روودەداتو لەشکری جاف لەوشەڕانەدا بەسەختیی دەشکێت •

ئیتر بەم جۆرە نێوانی حەمەپاشاو فەرهادمیرزا تێکچوو ، فەرهادمیرزا نامەی هەڕەشە بۆ حەمەپاشا دەنێرێو پێی رادەگەیێنێ کە پێویستە بەرگرین لە دەستدرێژیی ئەو جافانە بکرێت ، ئەگینا بە توندیی ئازار دەدرێن • فەرهادمیرزا تەنگ بە حەمەپاشا هەڵدەچنێ ، حەبیبوڵلاخانی باوەجانیی ، سەرۆکی تیرەی باوەجانیی ، کە تیرەیەکن لە جافی ئێران بەنددەکات • ئەم حەبیبوڵلاخانە زۆر خۆشەویستو نزیکی حەمەپاشا بووەو هەرچی حەمەپاشا پێیبگوتایە دەسبەجێ جێبەجێی دەکرد • فەرهادمیرزا حەبیبوڵلاخان دەگرێ ، هەرچی حەمە پاشا تکای لێ دەکاو قەولی پارەو نەختینەیەکی زۆری دەداتێ ، هەر بەرەڵای ناکات • ئەم راستیە لە نامەیێکدا کە فەرهادمیرزا بۆ حاجی ئەمیر نیزامی گەڕووسیی ناردوە ، رووندەبێتەوە • لەو نامەیەدا دەڵێت حەمەبەگی جاف هەزار تمەنو قەتارێ هێستری پێشکێشکرد ، حەبیبوڵلاخان ئازاد بکەم ، بەلام من شەفاعەتی ئێوبراوم قوبووڵ نەکردو لەسەر نامەی کاك ئەحمەدی شێخ ( قدس سرە العزیز ) بەرەڵام کرد(٨٦) •

توندوتیژجووڵانەوەی ئێران لەگەڵ عەشایەری جافدا حەمەپاشا دڵکرمێ دەکات • دۆستەکانی لە دەوڵەتی عوسمانیدا ، بە تایبەت تەحسینپاشای والیی موصڵ(٨٧) چەندجارێ مەحموودبەگی کوڕی

---

(٨٦) کتێبی سەیدطاهیری هاشمیی بەسەردێری (مەولەوی تاوگۆزیی)

(٨٧) ئەم تەحسینپاشایە دۆسی نزیکی مەحموود پاشای کوڕەگەورەی حەمە پاشابوو ، دوای بەستنی لیوای سلێمانیو کەرکووك بەموصڵەوە ، بوەتە والیی موصڵ موصادیفی ١٨ی شەوالی ١٢٩٦–١٣٠٤ بڕوانە رۆژنامەی (الزوراء) ژمارە ١٠٤٣ ١٩ رجب ١٢٩٦ •

بەشوێنیدا دەنێرن بۆ ئەوەی بۆ خاکی عوسمانیی بگەڕێتەوە • سەرەنجام حەمەپاشا ناوچەی زەهاو بەجێدەهێڵێو دەگەڕێتەوە بۆ خاکی عوسمانییو(٨٨) ، والیی بەغدا (٨٩) بە مەسڵەحەتی دەزانێ ڕێزێکی زۆری لێ دەنێ ، بەڵام راستیەکەی ئەوەیە ، کە زۆربەی کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانیی لێی نارەحەت بوونو زۆریان رکبۆوەو هاتنەوەیان بەهەل زانیوە کە داوێکی بۆ بنێنەوە • بۆ ئەوەی بەدگومانیی حەمە پاشا نەورووژێنن ، پێشان ، دەیکەن بە وەکیلی موتەسەڕیفی سلێمانی(٩٠) • پاش ماوەیێ دەیکەن بە قایمقامی هەڵەبجە • ئەوەی شایانی باسە لەو ماوەیەدا حەمەپاشا لە ئێران بوو بە پێی سیاسەتی پاراستنی (هاوسەنگی)هێز، عوسمانیەکان بۆ ئەوەی هێزێکیان لە جافەکان بەدەستەوە هەبێ ، دەسەلاتێکی زۆر ئەدەن بە عەزیزی شاوەیس ، سەرۆکی تایفەی کەرەموەیسیی ، کە لەگەڵ حەمەپاشادا بۆ ئێران نەچووبوون دەوڵەتی عوسمانیی موڵکێکی زۆری بەم تایفەیە بەخشیبوو • پاش دانانانی حەمەپاشا بە قایمقامی هەڵەبجە ، کەرەموەیسی‌یەکان هاندەدەن دژی حەمەپاشا بجووڵێنەوە • تایفەی کەرەموەیسیی تایفەیەکی دڕو ئازابوون ، سەرۆکەکەیان ، عەزیزی شاوەیس ، پیاوێکی دەسەلاتدارو خاوەنی کەس‌و عەشیرەت بوە • هاندانی ئەم تیرەیە گەیشتە رادەیێ رێگای پیاوەکانی حەمەپاشایان نەداوە کە کاروباری رەسمیی قایمقامی هەڵەبجە بەرێوەبەرێ • عەزیزشاوەیس ماڵی لە بەشارەتی نزیکی هەڵەبجە بوە • حەمە پاشا دەنێرێ بەشوێنیا ، ئاڕوا بۆ لای • حەمەپاشا ناچار دەبێ دەنێرێ لە هەلێکدا دەیگرێ ، دەیخەنە بەندیخانەوە • ماوەیەکی زۆر لە بەندیخانەدا دەمێنێتەوە،

---

(٨٨) تأریخ سلیمانیو . . ل : ١٨٣ .

(٨٩) لەو سەردەمەدا عەبدوڕەحمانپاشا والیی بەغدا بوە رێکەوتی ١٢٩٦ - ١٢٩٧ك .

(٩٠) بڕوانە گۆڤاری ژیان ژ : ٤٩٧ سالی ١٩٣٦ .

سەرەنجام بە نەخۆشیی سیل یا (ذات الرئة) بە مردنی خوایی دەمرێ • کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانیی ، بەتایبەت دژمەکانی حەمەپاشاو هەروا هەندێ لە دژمنانی ناوخۆی حەمەپاشا ، پڕوپاگەندەیێکی زور بڵاودەکەنەوە کە حەمەپاشا عەزیزی شاوەیسی لەبەندیخانەدا دەرمانخواردکردوەو لە چەسپاندنی ئەم تۆمەتەدا سەرکەوتوون ، تیرەی گەرەمویسیی دەچێتە دڵیانەوە ، کە سەرۆکی تیرەکەیان دەرمانخواردکراوە ، ئەمە ئەگرنە دڵ ، بەشوێن هەلێکدا دەگەڕێن ، حەمەپاشا لەناوبەرن • ئەوەبوو کاتێ حەمەپاشا لە ساڵی ١٢٩٩کدا ، لە چیمەنی برایمسەمین نزیك شاری زەهاو خەریکی راوکردن دەبێ ، دەیکوژن و قاتیلەکانی خۆیان دەدەنە پاڵ جوامێر ، سەرۆکی بەناوبانگی هۆزی هەمەوەند ، کە ئەو سەروبەندە ناوی بە ئازایەتیی و دلێریی عالەمگیر بووبوو • وا دیارە هەمەوەندەکان لەسەر کوژرانی خولەپەزە ناکۆکییان لەگەڵ حەمەپاشادا هەبوە[٩١] • لەبەر ئەم دژمنایەتیی و ناکۆکییە قاتیلەکانی حەمەپاشا دەکرنە خۆیان و کاربەدەستانی دەوڵەتی ئێرانیش بە هەلی دەزانن کە هەمەوەندەکان بەرامبەر بە هێزی جاف راوەستێنن ، ئەوەبوو هەموو ناوچەی زەهاوی پێبەخشیی و ، هەزار تمەنی مانگانە بۆ بڕییەوەو ، دەسەلاتێکی زۆری وای دایە ، قەلایێك لە قەسری شیرینی بەرامبەر بە قەلاکەی حەمەپاشای جاف لە ناوچەی شیروانەدا دروستبکات و ، ئەم قەلا تا چەند ساڵێك لەمەوپێش پاشماوەکەی لە قەسری شیریندا هەر مابوو • بەلام هەروەکو لەمەوبەر باسمانکرد[٩٢] ، دوای پەیماننامەی ( ارزنە رومی )دوەم ، کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانیی و ئێران هەوڵیانداوە سەرۆکێکی هەڵکەوتووی کورد لە مەیداندا نەهێڵن و ،

---

(٩١) خۆشخوانی ، عەلائەدین سەجادی ، بەغدا ، ل : ١٢٤ .

(٩٢) بروانە : وتاری د. حەسەنجاف بەسەردێری : باوردتر لە رووداوە مێژوویەکان بکۆلینەوە ، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ، ژ ١١٦ کانوونی یەکەم ، ساڵی ١٩٨٨ ل : ٤٠ ــ ٤٦ .

ئیتر بەم جۆرە دەبینین جوامێری هەمەوەند لە ئەنجامدا لەسەر پیلانگێری و دەسیسەی ناربەدەستانی عوسمانیەکان و ئێرانیەکان سەری پێداچوو •

لە حەقیقەتدا هەم حەمەپاشای جاف و هەم جوامێری هەمەوەندو سەدان سەرۆکی کوردی تر بە شمشێری یەك سیاسەت کوژراون و ، دەسیسەی ئەم دوو دەولەتە لەناوی بردوون • بۆ ئیسپاتکردنی ئەم نووسراوە ئەمین زەکی بەگ سەبارەت بە جوامێری هەمەوەند ئەلێت : بە پێی تەزویرات و ئیوانشێواندنی حوکوومەتی ئێران جوامێر یاغی بوو تا مەسافەیێکی دوور ئەو ولاتەی =خستبە=ژێر ترس و لەرزەوە ، نیهایەت ئەم دوو حوکوومەتە (عوسمانیی و ئێران) بۆ تەسکینی ئیتتیفاقیان کرد لەشکری ئێران لە قوماندارێتیی ( حسام الملك )دا بوو لە تەرەفی حوکوومەتی عوسمانیەوە قورت ئیسماعیل پاشای دیاربەکری بۆ ئەم حەرەکاتانە مەئموورکرا • (حسام الملك)بە درۆ وەعدەی صولحی دا بە جوامێر ، جوامێری بانگکردە قەرارگاکەی کە لە نزیك قەسری شیرینەوە بوە ، کە جوامێر هاتەئەوێ چەند کەسێکی لە پشت خێوەتەکەوەی قایمکردبوو ، لە پشتەوە هوجوومیان کردە سەری و کوشتیان لە سالی١٨٨٦زدا(٩٣) •

لە صەحنەی ئەم سیاسەتەدا ئەبینین ئێرانیەکان و عوسمانیەکان بۆ لەناوبردنی هەر حەرەکەت و جوولانەوەیێکی کوردەکان هاوکارییەکی تەواویی ئەکەوێتە نێوانیانەوەو ، هیچ کامێکیان یارمەتیی سەرۆکە کوردەکانیان نەدەدا دژی یەکتری و ، لەم بارەوە دەعەبدولعەزیز سولەیمان نەوار ئەلێت : وا دیارە ئیتتیفاقێك کەوتە نێوان عوسمانیەکان و ئێرانیەکانەوە بە هاوکاریی ئینگلیسەکان بۆ لێدانی شۆڕشی هۆزی جاف لەسەر سنووری ئەم دوو دەولەتە(٩٤) • هەردوو دەولەتەکە هەولیاندەدا کۆمەلێك سەرۆك

---

(٩٣) تأریخ سلیمانیو ولاتی ، ل : ١٩٦ .

(٩٤) تأریخ الشعوب الاسلامیة في العصر الحدیث ج/١ ، بیروت ١٩٧١ ، ص : ٢٥٣ . هەروەها بڕوانە : عرب وکرد ، منذرالموصلي ص : ١٩٢ .

عێل‌و ئاغاو بەگەرو شێخ لە خۆیان کۆبکەنەوەو ئەرزو مەعاشیان بدەنێ .
بۆ ئەوەی لە فکری شورش‌و یاعیبووندا نەمێنن‌و ، ئەم سیاسەتە بە تایبەت
لە ولاتی عوسمانیدا زیاتر بەرچاو دەکەوت . کاتێ مەدحەت پاشا لە سالی
١٨٦٩زدا بوو بە والیی بەغدا ، لە عێراق سەربەخۆیی ویلایەتەکانی
لەناوبردو مەرکەزیەتێکی تەواوی بەرقەرارکردو ، زەوی‌و زارێکی بەسەر
ئاغاو سەرۆك خێل‌و هۆزەکاندا دابەش‌کرد ، کوردستانیش کە ئەو ساکە
بە ویلایەتی موسلەوە بەسترابوو ، بریتی بوو لە سێ سەنجەق :سەنجەقی
مەرکەزی موسل شاملی قەزای دهۆك‌و زاخۆو عیمادیەو سنجارو عەقرە
بوو .

سەنجەقی کەرکوك شاملی قەزای هەولێرو رانیەو رەواندز تا
کۆیسنجەق‌و کفریی بوو .

سەنجەقی سلێمانیە شاملی قەزای بازیان‌و هەلەبجەو شەهرەزوورو
مەرگە بوو . بە فەرمانی والیی بەغدا ئەجوولایەوە .

بەلام ئەم سیاسەتە بەتەواویی نەیتوانیوە ریشەی شۆرش‌و یاغیبوونی
کوردەکان لە بەین ببات . حوکمی درێژی سولتان عەبدولحەمیدو ،
زولم‌وزۆری کاربەدەستانی عوسمانیی لە ناوچەی کوردستاندا ، سەررای
خراپیی ئیداریی‌و سیاسیی کە لە ناو هەموو ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا
بلاوبووبوەوە . ئەمانە هەمووی بوون بە مایەی لەناوچوونی ئەمن‌و
ئاسایش‌و ئیستیقرار لە کوردستاندا . شۆرشی عەشایەری بانیانزلی‌کورد لە
ولاتی عوسمانیدا ، هەروا شۆرشی هەمەوەندەکان‌و هەورامیەکان لە دەورەی
مەدحەت پاشادا نموونەی بارو دۆخی کوردستانە لەو سەردەمەدا[٩٥] .

ئەم حالەتە لە سەردەمی فەرمانرەوایی دوورو درێژی سولتان
عەبدولحەمیدا هەر بەردەوام بوو . ئەوەی شایانی سەرنجە بارودۆخی

---

(٩٥) تأريخ الشعوب الاسلامية في العصر الحديث ج/١ ص : ٢٥٦ .

ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی لەو قۆناخەدا رۆژ بەرۆژ بەرەو خراپتر دەچوو و ، حیزبو کۆمەڵەو رێکخراوێکی زۆر لە مەرکەزی ئیمپراتۆریەکەدا هاتبوونەکایەوەو ، هەموو هەڵپەی رووخاندنی رژێمی سوڵتانیان دەدا • ناسراوترینی ئەو حیزبانە حیزبی (اتحادوترقی)بوو ، کە زۆربەی خوێندەوارو رۆشنبیرانی ناسراوی میللەتە ژێردەستەکانی عوسمانیی تیابەشدار بوون •

لەم قۆناغەدا مەحموودپاشای ( ١٢٦١ – ١٨٤٦ / ١٣٣٩ – ١٩٢١ ) کوڕە گەورەی حەمەپاشای جاف بوەتە سەرۆکی عەشیرەتی جاف • مەحموودپاشای جاف هەر لەسەردەمی لاوێتیدا بەڵگەو نیشانەی هەڵکەوتوویی پێوە دیار بووە لێهاتوویی‌و زیرەکیی مەحموودپاشا لە لایەن ئەو مێژوونووسانەوەی باسیان‌کردوە بە ئاشکرا پەنجەی بۆ راکێشراوەو ددانی پێدا نراوە[٩٦] •

بەپێی بارو دۆخی سەردەم‌و لەچاو خۆی‌دا هەموو توانستێکی سەرۆکایەتیی تێداهەبوەو ، هەر بە زرنگیی خۆی باری نالەبارو شلۆقی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیی لا روون بوە • مەحموودپاشا پاش هەقسەندنەوەی باوکی عەشیرەتی جافی یەك‌خست‌و دەسەلاتێکی زۆرو هێزێکی چاکی بۆ پێکەوەنا • لەم بارەوە باسیل نیکتین ، مێژوو نووسی رووس ، دوای پیاهەڵدانێکی زۆر بە سەرۆکەکانی هۆزی جافدا ئەڵێ :

( وا دیارە لە ناو عەشیرەتە کوردەکانا تەنها عەشیرەتی جاف ئەتوانێ نەهێڵێ عەشرەتەکەیان لەناو خۆدا تێکبچێ ، ئەمەش بەهۆی‌ژیریی‌و توانایی‌و بیرتیژیی گەورەکانیانەوەیە[٩٧] کە شتێکی وایان کردوە

---

(٩٦) مشاهير الكرد وكردستان محمد امين زكى ، ج/٢ ، ص : ١٨١ .
هەروەها : الاكراد ، شاكر خصباك ، بغداد ، ١٩٧٢ ، ص : ١٦٦ .

(٩٧) د. موکەڕەم تاڵەبانیی ئەڵێت : سەرۆکەکانی عەشیرەتی جاف بە نەرمیی‌و سەبرو پشوودرێژیی لە ئیدارەی عەشیرەتەکەیاندا بەناوبانگن . بڕوانە : ابراهيم‌خان ، ثائر من كردستان ، سالی ١٩٧١ ، ل : ٧ .

عەشرەتەکەیان هەموو بەرەو سەرکەوتن بڕوا • مەحموودپاشای سەرۆکی هۆزی جاف دانی بەوەدا نا ئەوا لە زەرفی چەند سەعاتێکدا ئەتوانێ چوارهەزار سواری چەلدار کۆبکاتەوە[٩٨] •

میرزا مەحموودخانی (احتشام‌السلطنة)کە[٩٩] لە یادداشتە لەچاپدراوەکەیدا دێتە سەر باسی مەحموودپاشای جاف ئەڵێ : ( عێلی جاف عێلێکی کۆچەرەو ئەگەنە ولاتی کوردستانی ئێران‌و تا دوو فەرسەخ لە نزیك سنەوە • ئەم جافانە (مالك‌الرقاب)و موختارن بەسەر ولاتا ، هەرچی بیانەوێ ئەیکەن‌و ، کەس ناتوانێ بەرانبەریان راوەستێ • فەوجی سوارەی زەفەر کە گوایە بۆ پاسەوانیکردنی خەڵکی ناوچەکە نێرراون نەبادا جافە کۆچەریەکان دەسدرێژییان بکەنەسەر ، جافەکان سەربازەکانی ئەم فەوجەیان بۆ کۆکردنەوەی ئالیك بۆ ولاخەکانیان‌و لەوەڕ بۆ ئاژەڵەکانیان‌و خواردەمەنیی زمستانەی خۆیان بەکاردێنن • وەك بڵێی فەوجی ناوبراو بۆ خزمەتکاریی ئەو جافانە نێررابن • بێگومان فەوجی زەفەر کە لە (٣٠٥) نەفەری لێکەوتەو بێ‌هێز پێکهاتبێ هەرگیز ناتوانێ بەرابەر بە هێزی توانای جافەکان رابوەستێ کە بریتییە لە پێنج هەزار خێزانی چەك‌بەدەست لە ژێر فەرماندەی مەحموودپاشادا ، کە نە مل بۆ عوسمانیەکان کەچ دەکاو نە بۆ قاجاریەکان •

هەر لەم بارەوە[١٠٠] خوالێخۆشبوو پیرەمێرد ئەڵێ : جاف کە مەحموود پاشا رەئیسیان بوو ، تا پشتی سنە ، کە هاوینان عێلی دەچوە کوێستانی

---

(٩٨) الاکراد ، باسیل نیکیتین ، بیروت ص : ١٦٧ ـ ١٦٩ .
(٩٩) میرزا مەحموودخان (احتشام السلطنة) رێکەوتی ساڵی ١٣١٦ك بوەتە والیی سنە ، دوای بەرکەناریی حەسەن‌عەلی‌خان ، پیاوێکی بیرتیژو حوکمڕانێکی بەدەسەلات بوە ، تاساڵی ١٣١٨ك حاکمی ناوچەی سنە بوە • بڕوانە تأریخی مردوخ بەرگی /٢ل : ٢٣٠ .
(١٠٠) ئەم قسانە لە نامەیەکی (احتشام السلطنة)دا، کە بۆ ناصرەدین‌شای قاجاری نووسیوە ، بەرچاوئەکەوێ .

تەگەرمەو بەراتان خاکی ئێران لە بەردەمیان ئەلەرزیو والیی کرماشان ، کە پرێنس بوو ، داری سووتەمەنیی بۆ ئەناردە شیروانەو کانی چەقەل[۱۰۱] •
لەو سەردەمەدا دەوڵەتی عوسمانییو دەولەتی قاجاریی ، بۆ ئەوەی ناوچەی جاف ، کە ناوچەیەکی گرنگو ستراتیژیی بوە ، بگرنە دەست خۆیان ، هەرکام لەم دوو دەوڵەتە هەوڵی ئەوەی داوە دڵی سەرۆکەکانی جاف بۆ لای خۆی رابکێشێو[۱۰۲] لەم بارەوە حوکومەتی قاجار نازناوی خانو فەرمانی ئەو نازناوەو گەلێ دیاریی تری بۆ مەحموودپاشا ناردوە • ئەمەیش ئەو فەرمانەی ( مظفرالدین )شای ئێرانە کە بۆ مەحموودپاشای ناردوە بە دەقە فارسییەکەی :

**« چون مراتب حسن نیتو صدق ارادت سعادتمآب محمود پاشای جاف بعرض پیشگان مرحمت دستگاه اقدس همایون شاهنشاهی رسیدەو خاطر مهر مظاهر شاهانە از محاسن خلوص عقیدت او قرین کمال خوشنودی است • لهذا محض ارائەیی رضایت خودمان خاطر مشار الیەرا بە اعطای یك قبضە شمشیر مرصع از درجەء دوم قرین اعتزازو افتخار فرمودیم کە زیبو علاقۀ کمر اعتبار خود ساختە بین الامثال والاقران مباهیو سربلند بودەو عهدەسال ۲۲ شعبان ۱۳۲۰ مظفرالدین شاه» •**

**فەرمانەکە بە کوردیی(*) :**

**لە سەرەوە مۆری شاە ( مظفرالدین )**

چونکە نیەتپاکییو راستیی سەعادەتمەئاب مەحموودپاشای جاف بە هەموو جۆر گەیشتوە بە ئاستانەی بارەگای پیرۆزی شاهەنشاهی وە خاتری شاهانەو ئیخلاسمنیەتی ئەو خۆشنوود بوە ، لەبەر ئەمە بۆ ئەوەی رەزامەندیی خۆمان بەرامبەر بە ناوبراو پیشان بدەین فەرمانمان دا کە یەك

---

(۱۰۱) گۆڤاری ژیان ژ : ٤۹۹ ساڵی ۱۹۳٦ •
(۱۰۲) الاکراد • د. شاکر خصباك • ص : ۳۷ •
(*) وێنەی ئەم بەڵگەنامە لە وتاری (نەخشی هۆزی جاف لە سایەی چەند سەرۆکێکیەوە • د.حەسەنجاف، گۆڤاری کۆڕی زانیاریی عێراق دەستەی کورد ۲۲/۲۱ )دا هەیە •

شیری مورەسسەع لە پلەی دوەم بکرێ بە فەرو بەمە ئەومان بەرزکردەوە بۆ ئەوە کە بە هۆی ئـەم خەڵاتـی شاهـانەوە ئەو کەمـــەری خۆی پـێ برازێنێتەوەو لە ناو هاوسەرانیا سەربەرزو پایەبڵند ، شایانی ئەوە بێ کە لـە ئاشنایانی ئێمەیە • ٢٢ شەعبانیساڵی ١٣٢٠ » •

بەڵام ئەوی راستیی بێ مەحموودپاشا کە مرۆڤێکی زیرەكو هۆشیار بوە لە حەقیقەتی سیاسەتی نالەباری هەردوو دەوڵەتەکە گەیشتبوو و ئـەم جۆرە فەرمانو خەڵاتانە لە تەوەرەی دەرنـەکـردوەو نەیخـەڵەتانـدوە • هەمیشە هەوڵی ئەدا ناوچەی جاف لە ژێر دەستی کەسدا نەبیتو ، جـۆرە سەربەخۆییەکی لە بەڕێوەبردنی کاروبـاری خۆیا بۆ پێكبهێنێـت • لـە راستیـدا نەك هەر سـەربەخـۆیی ناوچـەی جـاف ، بـەڵکـو ئامانجـی ئەوە بوو کە سەربەخۆیی بۆ هەموو کوردستانی عێراق بێتەدی • لەم روەوە خوالێخۆشبوو محەمەدئەمینزەکی بەگ ئەڵێ : مەحموود پاشا لەم دواییەدا موتتەهەم کرابوو بە هەندێ مەسەلەی نەتەوەییو ، حوکوومەتی عوسمانیی لە رووی ئەم نەتەوەگەرییو سیاسەتی نەتـەوەگەرییەوە دڵی لێ کرمـێ بووبوو »[١٠٣] •

بۆ ئەوەی روونبێتەوە کە مەحموودپاشا دژی سیاسەتی عوسمانیـی جوولاوەتەوە ، نووسراوەکەی د• کەمال مەزهەر بەشاهید دێنینەوە کـە سوارەی حەمیدییەی عەشایەرە کوردەکانو بەکارهێنانی بۆ چەسپاندنـی دەسەڵاتی خۆیو نێوانی ، بە هۆی ئەم هێزەوە بەرەنگاری بزووتنـەوەی نەتەوەیی میللەتەکانی ژێردەست بکا ، بەتایبەت بزووتنـەوەی کوردەکـان خۆیان • هەروا ئەم هێزە بەکاربێنێ بە مەبەستی بەرپاکردنی هەراو ئاژاوە لە سنووری رووسیادا • شایانی وتنـە زۆربەی عەشایەرە گەورەکانـی

---

(١٠٣) مشاهير الكرد وكردستان ج/٢ . بغداد ، ١٩٤٣ ، ص : ١٨١ •

کوردستان پشتیوانیی دروستبوونی ئەم تەشکیلاتی حەمیدیە نەبـــوون ، وەکـــوو عـــەشیرەتی پژدەرو هەمەوەنـــدو جـــافو عـــەشایـــەری ناوچـــەی بەدلیس [١٠٤] • هەر لەم بابەتەوە لازاریف ، رۆژهەلاتناسی رووس ، ئەلێ :

« سولتان عەبدولحەمید چاوی لەوە بوو کە لە سەر حیسابی دراوسێکـــەی لای راستیەوە هـــەیبەتو زەبرو زەنگـــی دەولەتەکـــەی ببووژێنێتـــەوەو بیچەسپێنێو ، سوپاکەی بەهێز بکاتو چاو لە دۆخە دارزاوەکەی ولات کە هەتا دەهات زیاتر بەرەوشلەقینو شلۆقیی دەڕۆیشت بپۆشێت • ئەم دۆخە شلۆقەی کە لەو رۆژەوە دەستی پێکرد کە هاتە سەر حوکمو بـــەدرێژایـــی ســـالانی فـــەرمانڕەواییەکـــەی بەردەوام بوو ، بۆ ئەوە وای دەکرد پیلانی دەستدرێژکردنەسەر ئێران گەرمبێتو جۆش بسێنێت ، ئەوەبوو لە ناوچەی سەرسنووردا تەنیا کورد هەبوو ، ئەم سنوورەش تا ئەو رۆژە دەسنیشـــان نەکرابوو ، هەرپاش سوارەی حەمیدییە بە سالێك هەروا بشێویی لەســـەر سنووری ئێرانو تورکیـــا دەستیپێکـــرد ، خێلی جـــاف لە عێراقـــدا ئـــەو ئاشووبەی هەلگیرساندو مەحموودپاشای سەرۆکی ئەم خێلە هەمیشە لەگەل کاربەدەستانـــی دەولەتـــی عوسمانیـــدا لە دووبەرەکیـــدا بـــوو و دانووی لەگەلیاندا نەدەکولا »[١٠٥] •

ئەوەی راستییە مەحموودپاشا دژی دروستکردنی سوارەی حەمیدیە بووەو ، بیروباوەڕی خۆیشی لەم بارەوە بە ئاشکرا دەربڕیوەو ، حوکوومەتی عوسمانیش لەم بارەوە لە سیاسەتی مەحموودپاشا رازیی نەبوە •

پاش کوژرانی حەمەپاشا مەحموودپاشا لە لایەن عوسمانیەوە بوو بە قایمقامی هەلەبجەو سەرۆکـــی عەشیرەتـــی جـــاف • بـــەلام پاشـــان ، چون

---

(١٠٤) کردستان فی سنوات الحرب العالمیة الاولی ، ترجمة محمد الملا عبدالکریم ص : ٨٩ ـــ ١٩٢ •

(١٠٥) کێشەی کەرد ، م‌لازاریف ، بەشی یەکەم ، وەرگێرانی د. کاوس قەفتان ، بەغدا ، ١٩٨٩ ، ل : ١١٨ •

بیروباوەڕو جوولانەوەی مەحموودپاشایان بەدڵ نەبوو ، کەوتنە خەیاڵی ئەوەوە کە لە دەسەلاتی لەمکەنەوەو ، لە ناو عەشرەبەلەیا لاوازی بکەن .
بۆ ئەم مەبەستە ناکۆکییەکی زۆریان خستە نێوان ئەوو براکانیەوەو .
بەتایبەتیی عوسمان پاشا ، کە دوو ساڵ لەو بچووکتر بوو ، بەلام عوسمانپاشا لەبەر ئەوەی پیاوێکی هەڵکەوتووی بەدەستو دەهندە بوو و لە هیچ روویەکەوە خۆی لە مەحموودپاشا بە کەمتر نەزانیوەو ژنێکی هەڵکەوتووی وریایشی ، کە عادیلە خانم بوو ، هەبووەو[106] ، ئەم ژنە هەموو جۆرە یارمەتیەکی داوەو ، لە پێشکەوتنیدا درێغی نەکردوەو ، هەمیشە هەر خەریکی پێشخستنی بوە ، مەحموودپاشا لەبەر دانایی‌و لێوەشاوەیی عوسمانپاشا خۆی بەم هەموو توانایەوەی نەیتوانیوە بەسەر عوسمانپاشادا زاڵ بێت .

وەکو پێشتر وتمان ، حوکوومەتی عوسمانیی لە دەسەلاتی مەحموودپاشا لە باکووری کوردستانا نارەحەت‌و نیگەران بوە ، بەتایبەت دژمنانی دەسەلاتی مەحموودپاشا هەمیشە راپۆرتیان دژی ناوبراو گەیاندۆتە حوکومەتی عوسمانیی‌و کاربەدەستانی ئەو حوکوومەتە بە دوای هەلێکا گەڕاون بتوانن مەحموودپاشا لە قایمقامیی هەڵەبجەو سەرۆکایەتیی عێلی جاف بخەن‌و ، لە ناوچەکە دووری بخەنەوە ، بۆ جێبەجێکردنی ئەم نیازە فەریق نامیق پاشا لە لایەن حوکوومەتی عوسمانیەوە رائەسپێررێ‌و ئەنێررێ بۆ کوردستان ، گوایە لەوە بکۆڵێتەوە ، کە ئاخۆ ئەو هەموو راپۆرتەی لە

---

(١٠٦) بۆ ئاگاداریی زیاتر لە عادیلەخانم بڕوانە کتێبی : رحلة متنكر ، میجرسون ، ترجمة فؤاد جميل . هەروا ئافرەتی کورد ، هارولد هاتسن ، وەرگێرانی عەزیزگەردیی ، بەغدا ١٩٨٣ ، ل : ١٣٧ .
هەر لەبەر هەڵکەوتوویی عادیلەخانم بوو دوای مردنی عوسمان پاشا حوکوومەتی ئینگلیس دوای ئەوەی ناوچەی کوردستانی عێراقی داگیر کرد نازناوی (خانبەهادوری)دایێ .

دژی مەحموود پاشا ئەگەنە ئەستەمووڵ راستن یا درون ؟ فەریق نامیق پاشایش دێ دەکاتە هەلەبجەو ئەبێتە میوانی مەحموودپاشا • مەحموود پاشا زوو ئەزانێ نامیق پاشا بە چ نیازێ هاتوە • لەوە کەیشتوە کەوا ئەم سەفەرەی بێمەلامەت نیە • لەبەر ئەوە وەکوو پیاوێکی خاوەن عیززەتی نەفس هیچ جۆرە بایەخێك بە نامیق پاشا ناداو وەك هەر میوانێکی تر لە دیوەخان دایئەنێو چێشتو نانی بۆ ئەنێرێ • رۆژێ لە کاتی قسەکردنا بە نامیق پاشا دەڵێ : سوڵتان حەمید ناوچەی دەڵێنو مووانو مالوانو باقیی جۆگەکانی شارەزووری کڕیوەو ، بە ناوی خۆیەوە تاپۆی کردوە • ئەم موڵکانەی شارەزوور ژێرپێی عەشرەتی جافن ، کە عەشرەتێکی زۆر گەورەو خاوەن مەڕو ماڵاتن • دیارە زیان بە کشتوکاڵی ئەم دێهاتانە ئەگەیەنن‌و ئەمەش ئەبێتە هۆی پەیداکردنی نارەحەتیی بۆ حوکوومەتی عوسمانیی ، من وای بە باش ئەزانم سوڵتان ئەم ناوچانە بداتە عەشایەری جاف • بۆ سوڵتان پەسەند نیە موڵك بسێنێو خاوەن موڵکایەتیی بکا • ئێمە لە جیاتیی ئەوە قزرەبات کە لە ناوچەی جافەوە دوورە ئەیدەینێو ئێتر هیچ ناخۆشییەك پێك‌نایەت • نامیق‌پاشا لە ناندانو شێوەی قسەکردنی مەحموودپاشا دڵگیر ئەبێ • لە راستیشدا ئەم پاشایە هەر بۆ ئەوە هاتبوو بۆ ئەوەی پیلانێ بۆ مەحموود پاشا بنێتەوە • دوای چەند رۆژێ هەڵەبجە بەجێ‌دەهێڵێو ئەڕوا بۆ ناو جاف • ئەو کاتە عوسمان پاشا لە ناو عەشرەتی جافدا ئەبێ ، میوانداریەکی پڕ شکۆی لێ دەکاو یەکجار رێزی لێ دەنێو کاتێکیش دەگەڕێتەوە هەزار لیرەی ئاڵتوونی ئەداتێ •

نامیق پاشا ئەگەڕێتەوە بۆ ئەستەمووڵ راپورتێکی یەکجار توندو تیژ لە دژی مەحموود پاشا بۆ سوڵتان عەبدولحەمید ئەنێرێو هەرچی خراپە دەربارەی مەحموود پاشا بۆی تێدەچێنێ • سەربار ئەشڵێ : مەحموود پاشا بە ئەندازەیێ لە خۆی بایی بوە کە خۆی بە هاوپایەی سوڵتان ئەزانێو

نیازی دەربارەی سوڵتان خراپەو لەگەڵ دژمنانی ئەمن و ئاسایشی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیدا هاوبەش و دەستی تێکەڵەو دیوەخانەکەی بوە بە جایگای ئەو کوردانەی کە دژی ڕێبازی خیلافەتن • پاش ئەم راپۆرتە لە سالی ١٣٠٦ ـ ١٨٨٨،١٨٨٩ فەرمان لە سوڵتان عەبدولحەمیدەوە دەردەچێ کە عوسمان پاشا ببێ بە قایمقامی هەڵەبجەو ئەو سەرۆکایەتیی عەشیرەتی جاف بکا • بەمە مەحموود پاشای جاف دەکرێ بە موتەسەڕیفی ئۆرفە[١٠٧] • مەحموود پاشا لەگەڵ بەموتەسەڕیفی کرانیا نازناوی (بێگلەربێگی)یشی دەدرێتێ[١٠٨] کە ئەم نازناوە بە رەئیس ئەیالەتەکان بەخشراوەو ، لە دەوڵەتی عوسمانیدا لە عێراق تەنها بە چوار کەس بەخشراوە: ئەحمەدپاشای بابان • عەبدولقادرپاشا دیاربەکریی • مەحموود پاشای جاف • ئیبراهیم پاشای بەڕێوەبەری زەوی‌وزاری سەنیە •

کاربەدەستانی عوسمانیی ئەیانزانیی مەحموود پاشا ئەم وەزیفەیە وەرناگرێ و سەرپێچیی لێ ئەکا • تا چوار پێنج مانگێك هەر نامەیێکی رەسمیی بۆ ئەهات بە ناوی موتەسەڕیفی ئۆرفەوە بۆی ئەهات • مەحموود پاشا بە باشیی دەیزانیی عوسمانیی ئەیەوێ لە هێزو دەسەلاتی بخەن و لە عەشیرەت و کەسوکاری خۆی بکەن • مەحموود پاشا لە ئەنجامدا سەیر ئەکا ئەم وەزعە دەس نادا بۆی و ئەبێ چارێکی مەسەلەکە بکات ، ناچار ئەبێ بڕوا بۆ ئەستەموول بۆ هەوڵدان بۆ گۆڕینی بە موتەسەڕیفکرانی • کە ئەگاتە ئەستەموول سوڵتان فەرمان ئەدا بە درێژیی تەمەنی لە ئەستەموول دەرنەچێ • خانوویەکی بۆ تەرخان ئەکرێ و فەرمانی دەسبەسەریی بۆ

---

(١٠٧) مشاهیر الکرد وکردستان . محمد امین زکی ، ج/٢ ص : ١٨١ .

(١٠٨) لونگریك ئەڵێت : بێگلەربێگیی بەرزترین پلەی پاشایەتیە ، نازناوی فەرمانڕەوایی ئەیالەتە . بڕوانە : اربعة قرون من تأریخ العراق الحدیث. ترجمة جعفر الخیاط .

دەردەچێ‌و ، لە ژێر چاوێریی‌و هاوچاویدا دەمێنێتەوە • ئەوەی شایانی باسە هۆزی جاف لە دەوری سەرۆکایەتیی حەمەپاشاو مەحموود پاشادا لەگەڵ شێخ عوبەیدوڵڵای نەهریدا ، لە راپەڕینەکەی ساڵی ١٨٨٠(١٢٩٨)ك‌دا هاوپەیمانییان بوە(١٠٩) •

پاش دامرکانی شۆڕشی شێخ عوبەیدوڵلا ، ساڵی١٨٨٢(١٣٠٠) مەحموود پاشا هەمیشە لە پارێزدا بوە ئەو پەیمانە بەجێ بهێنێ‌و لەگەڵ چەند سەردارێکی تری کورددا لەو خولیایەدا بوون رۆژێ دژی عوسمانیەکان راپەڕن • گرتنی مەحموود پاشا لەلایەن سوڵتان عەبدولحەمیدەوە یەکجار توورەی دەکاو بڕیار دەدات هەرچۆنێ بێ خۆی بگەیەنێتەوە ناو هۆزی جاف‌و ، شۆڕشێ لە کوردستانی باکووریدا بەرپابکات • بێگومان رۆشنبیرانی تورك‌و گەلانی ژێردەستی عوسمانیی لە ساڵانی١٨٨٢–١٩٠٨ز ١٣٠٠–١٢٢٦ك‌دا بۆ رووخاندنی رژێمی سوڵتان عەبدولحەمید لە تەکاپۆدا بوون ، رۆشنبیرانی کوردیش بەسەرۆکایەتیی شێخ عەبدولقادری نەهریی‌و بنەماڵەی بەدرخانیەکان لە ئەستەمووڵ بوون لە ناوخۆیاندا پێوەندیەکیان هەبوە لەگەڵ رێکخراوە نهێنیەکاندا بەتایبەت کۆمەڵەی (جون‌تورك)و پاش ئەم کۆمەڵە لە گەڵ کۆمەڵەی (اتحادوترقی) پێوەند بوون • وا دیارە مەحموود پاشا لەگەڵ ئەو کۆمەڵە نهێنیانەدا پێوەندیی هەبوەو ، ئەو کۆمەڵانە هانیان‌داوە لە دژی سوڵتان عەبدولحەمید شۆڕشێ بەرپابکات • بەم خولیایەوە ساڵی١٨٩٢ز١٣٠٩ك بڕیاری‌دا لە ئەستەمووڵ هەڵبێت ، هەڵئەسێ نامەیەکی یەکجار ناشیرین بۆ سوڵتان عەبدولحەمید ئەنووسێ ئەڵێ : تۆ ستەمکارو خوێنڕێژی‌و لە خوا ناترسی‌و هیچ سەرم سوڕنامێنێ کە ئەم ستەم‌و رەفتارە ناشیرینانەت هەبێ ، چونکە زۆڵ‌و حەرامزادەیت‌و

---

(١٠٩) راپەڕینی کوردەکان لە ساڵی ١٨٨٠دا ، نووسینی د.جەلیلی جەلیل . وەرگێڕ لە رووسییەوە د. کاوس‌قەفتان . بەغدا ١٩٨٧ ، ل : ١٢٥ .

کوڕی عەبدولمجید[110] نیت ، هەروەها بۆیشی ئەنووسێت ، تۆ سولتانی جائیری‌و سولتانی جائیریش بە گوێرەی شەرعی ئیسلام (واجب الاطاعە)نیە. تۆ پیاوێکی پیری کەچی ۳۰۰ژنی پێزانراوت هەن . ئەمەیش نە لەگەل شەرعی ئیسلام نە لەگەڵ ڕەوشتی مرۆڤایەتیدا یەك دەگرن .

لەو سەردەمەدا هەرکەسێ نامەی بۆ سولتان نووسیبا بە جۆرە نووسینێکی تایبەتیی دەنووسی ، بەو جۆرە نووسینێکی تایبەتیی سەر زەرفەکەی بۆ نووسیوە ، ئیتر کاربەدەستانی دەربار تەماشای نامەکەیان نەکردوەو گەیاندوویانەتە دەستی سولتان خۆی‌و، سولتان بە دەستی خۆی هەڵی پچڕیوەو خوێندوویەتیەوە . مەحموود پاشا پاش ئەوەی نامەکە ئەخاتە پۆستەخانەوە ئیتر خۆی دەسبەجێ سواری پاپۆڕ دەبێ‌و لە ڕێگای دەریای ڕەشەوە ئەڕوا تا ئەگاتە قەفقازو لەو سەفەرەیدا پیاوێکی لەگەڵدا دەبێ بە ناوی مەلا حەمدیی سنەیی . پاشان قەفقاز بەجێدەهێڵێ‌و ئەڕوا بۆ باکۆ . لە مانگی سەفەری ۱۲۰۹ی ك(تشرینی‌یەکەمی۱۸۹۲)زدا ئەگاتە باکۆو لەوێ وێنەیەکی خۆی بە بەرگی پیاوێکی هەژارەوە ، کە لەم نووسراوەدا بلاوی‌دەکەینەوە ، بۆ کەسوکارانی دەنێرێ .

---

(۱۱۰) سولتان عەبدولحەمید ۲۲ی ئەیلوولی ۱۸٤۲ لە کەنیزەکێکی چەرکەسیی سولتان عەبدولمەجید کە ناوی تیری موژگان دەبێت لەدایك بوە. لەیەکەم ڕۆژی لە دایکبوونیەوە پڕو پاگەندەیان بۆ دایکی کرد کە گوایە لە عەبدولمەجیدنیە ، لە خزمەتکارێکی ئەرمەنییە ، کە ئاشپەزی قەسری عەبدولمەجید بوەو ، عەبدولمەجید تاهەفتەیەك دوای لەدایکبوونی ناوی باوکی خۆی پێ‌نەبەخشی ! بەلام ئەم پڕو پاگەندە دوورە لەڕاستیەوە . بڕوانە : لمحات اجتماعية من تأريخ العراق الحديث ، ج/۳ ، بغداد ، ۱۹۷۲ ، ص : ۱۲ . هەروا : السلطان عبدالحميد اورخان محمد على ، بغداد ، مطبعة الخلود ، ص : ۸۲ .

مەحمودپاشای جاف بە بەرگی پیاوێکی
هەژارەوە دوای هەڵهاتن لەئەستەمبول

هەروەکوو خوالێخۆشبوو کەریم بەگی باوکم باسی کردوە ، لە باکۆوە نامەیەکی نووسیوە بۆ قەیسەری رووسیاو داوای یارمەتیی لێکردوە بۆ ئەوەی شۆڕشێك بە یارمەتیی رووسەکان لە ناو کوردەکانی عێراقدا لە دژی عوسمانیی پێك بێنێ‌و دڵنیای کردوە کە توانای بە ئەنجامگەیاندنی ئەم کارەی هەیە(١١١) • بەڵام وا دیارە رووسەکان لەبەر شلۆقیی وەزعیان حیسابێکیان بۆ نەکردوەو پێوەندییان لەگەڵ نەبەستوە • مەحموودپاشا کە دەست لە یارمەتیی رووسەکان ئەشۆرێ ، لەگەڵ پیاوەکەیا باکۆ بەجێ ئەهێڵێ‌و روو ئەکاتە ئێران‌و سواری پاپۆڕ دەبێ ، دەگاتە (بەندەرئەنزەلی) کە بەندەرێکە لەسەر دەریاچەی خەزەر کە تا پێش دەوری خومەینی بەندەری پەهلەوییان پێ‌دەگوت •

عەشرەتی جاف کە خەبەری هەڵاتنی مەحموودپاشایان پێ ئەگا فەتاح‌بەگی برای ئەچێ بە پیریەوە لە نیوەی رێدا بەیەك‌ئەگەن • وا دیارە لە نزیکی چوارشەمەبازاڕ بەیەك گەیشتوون‌و ، پێکەوە دێنەوە بۆ ناوچەی جاف تا ئەگەنە (گەڵگە) کە هەواری بەگزادەی جاف بوە لە نزیکی پێنجوێن• جافەکان‌و بەگزادەکان لە مەحموودپاشا کۆدەبنەوەو بەڵێنی دەدەنێ کە هەرچی بکات لە دژی سوڵتان عەبدولحەمید لە گەڵی بن‌و لێی‌جوێ نەبنەوە• سوڵتان عەبدولحەمید بڕیاری لەناوبردنی مەحموود پاشا ئەداو فەرمان دەرئەکا کە نازناوی پاشایەتیی‌و تەنانەت نازناویشی لێ‌بسێننەوەو ، لە هەموو نامەو فەرمانێکدا ناوی دێ بە (فیراریی) یا (یاخیی‌مەحموود) • ناوبراو بە والیی موسڵ‌و والیی بەغدا ئەسپێرێ کە بە مردوویی یا زیندوویی مەحموود پاشا دەسگیر بکەن‌و ڕەوانەی ئەستەمووڵی بکەن •

مەحموود پاشا ، وەکوو باسمان‌کرد ، لە بشێویی وەزعی سوڵتان عەبدولحەمیدو جموجووڵی حیزبە موخالیفەکانی ئاگاداربوەو هەر لەو

---

(١١١) یادداشتەکانی مستەفابەگی کەریم‌بەگ ، دەست خەتە .

بیرەدا بوە کە کارێك بکا یەکێتیی ریزی هۆزەکانی کورد پێکبهێنی ، تا بتوانن کەڵك لەو هەلە رەخساوە وەربگرنو جۆرە خودموختارییەك بۆ کوردستان وەربگرن • پیرەمێرد لەم روەوە ئەلێ :

« هەر سەبارەت بە کوردو ئەو کۆنگرانەی بۆ دەستخستنی مەوجوودییەتێك بۆی ، بەستراوە کۆبوونەوە گەورەکەی کەنار زەڵمە • کە مەحموود پاشا لە ئەستەمووڵ بوو شارەزای بشێویی ئەستەمووڵو وڵاتی عوسمانیی بوو کە سالی شەش مانگ مانگانەی کاربەدەستانی دەوڵەت نەئەدرا ئەیزانیی هێزێکیان بۆ هیچ شوێنێ پێ نانێرێ ، جا بەو خولیاوە سالێکیان هەرچی پیاوی ناوداری ئەم خاکە هەن هەمویان لە سەرچاوەی زەڵم کۆئەکاتەوە ، لە سلێمانیەوە نەقیبو ، شێخ محەمەدی موفتییو ، ئەحمەدی پاشچاوەش‌و ، سەیدئەحمەدی بابارەسوولو ئەورەحمان ئاغای عەبدوڵڵا ئاغا •••لە بەری زەهاوەوە فەقێ سەعیدو ، داوود خانی کەلهورو ، هەموو سەرۆك عەشیرەتەکانو ، سمایل‌بەگی داودەو ، مەجیدپاشای کۆیە کە دۆستی شێخ رەزای مەشهوور بوو ، شێخ محەمەدرەئووفو ، شێخ عەلی ••• خۆلاسە ئەو زەڵمە پڕ بوو ، چەند گفتوگۆو تەرتیباتێ کرا ، منیش لە خزمەت نەقیبدا بووم ، بە قەدەر رەئیی عومومیی هیوایان بە قەڵەمی من بوو ، منیش قەلەندەرانە بەو هەموو ماڵە بەگزادەدا ئەسوورامەوە ، رۆژێ پاشا لە ماڵی کەیخوسرەوبەگی کوڕی خۆیو نەقیب بانگیان‌کردم • وتیان : خوا رێکی خست ، قەڵەمی خۆت تیژکە ، دەستووری ئیدارەو بەیان‌نامەت بنووسە • منیش شێتانە هاتمەزوبان وتم : پاشا بە خۆڕایی خۆم ماندوو ناکەم • پاشا ئەمەندە تووڕە بوو سێ جار هەڵساو خۆی دایەوە بەسەر دۆشەکەکەیدا • وتی : بە راس ئەوە چی بێژی ؟ منیش بە جەسارەتێکەوە وتم : پاشا ، ئەگەر تووڕە ببی دەنگ ناکەم‌و ئەگەر عاجز نابی دەیلێم • فەرمووی : بێژە ! وتم : پاشا وا نەبوە ،

بەڵام تۆ وەزعیەتی خۆمان وە کەللەڕەقییو خۆبڵندزانینی ئەهلی ئەم خاکە لێك بدەرەوە • لە مەحاڵیّ بووم لە شارباژێڕ ، دێیەك هەیە بە ناوی کەنارۆوە، سلێمانی رەسوول ئاغای تیابوو ، ئاغا سێ کوێخای بوو : کوێخا ئەحمەدو، کوێخا سمایلو ، کوێخا حەمە • ئەم کوێخایانە هەر یەکە خۆی بە ئاغایێ ئەزانیی ! » •

وا دەرئەکەوێ کە پیرەمێرد بڕوای بە یەکێتیی سەرۆك عەشایەرو شێخو ناودارەکانی کورد نەبوە ، بۆیە هەر لەو وتارەدا ئەڵێت : ئەگەر تۆ حوکمداریت دا بە نەقیبو لە حەقی خۆت چاوت پۆشیی سایری رونەسای تیرەکان بە حوکمداریی قوبووڵیان نیەو ، ئەڵێن : پاشای باوکت ، مەبەستی حەمەپاشایە ، کە لە سلێمانی موتەسەڕیف بوو و تواناو هێزێکی زۆری بەدەستەوە بوو ، چوو دوای مانگێ جێی هێشت • بڕوا ناکەم رەسووڵئاغای ترشیی فرۆشو ، مەحموودئاغای چۆخەڕەشی میراودەلی ، یا فەقێ ئەحمەدی دارەشمانە ئەگەر بیانەوێتیش چۆن ئەبنە حوکمدار »[112] •

خەبەری جووڵانەوەی مەحموودپاشا بە رێکوپێکیی ئەگەیشتە حوکوومەتی عوسمانیی • کاربەدەستانی عوسمانیی ترسێکی زۆریان لێ نیشت • بە تایبەتیی سوڵتان عەبدولحەمید خۆی بایەخێکی زۆری بەم مەسەلەیە ئەدا کە بە هەرچۆنێ بوە مەحموودپاشا لە ناوبەرێو لە ئاژاوەی ئاسوودە بێ • بەم نیازەوە فەرمان ئەدا بە کەریمبەگی خانزادەجوانیی ، کە خەڵکی سلێمانیی بوەو ، لە سوپای عوسمانیدا پلەی عەقیدیی ئەمرۆی هەبوە ، هەزار سوار بۆ گرتنی مەحموودپاشا تەرخان بکات • مەحموودپاشاش کە بەمە ئەزانێ پەنا ئەباتە بەر شاخی زمناکۆو کەریمبەگی

---

(112) بڕوانە : رۆژنامەی ژیان ، ژمارە ٤٩٧ ، سالی ١٩٣٦ ، ل : ٤ • و مەحموودپاشای جاف ، ئومێد ئاشنا ، گۆڤاری کاروان ، هەولێر ، سالی ١٩٩٠ •

ناوبراو بە هەزار هێسترسوارەوە بەدوایا ئەچێو ، لەو ناوچەی شەمێرانو زمناکۆیەدا تەعقیبی دەکات • مەحموود پاشا بۆ ئەوەی بکەوێتە شەرێکی توندوگەرمەوە لە کەلیدا ، زمناکۆ بەجێدێلێ ، رووئەکاتە بناری شارەزوورو ئەچێ بۆ (بانی‌بنۆك) • بەم جۆرە سالێکی خشت ئەمبەرو ئەوبەر دەکات بەکەریم‌بەگ لە نێوان زمناکوو بانی‌بنۆکدا دەیهێنێو دەیبا ، بێ ئەوەی دەرفەتی بداتێ پەلاماری بدا بیگرێ • بەلام پیریی‌و ناساغیی‌و پڕوپاگەندەی پیاوانو مووچەخۆرانی میریی لە نێوان عەشایەری جافدا سەر بەدەولەتی عوسمانیی ، بە تایبەت ئەم پڕوپاگەندەیە کە •• ئەمە کارێکی زۆری کردە سەر دڵو دەروونی دەوروبەرەکانی مەحموود پاشاو ، تەنانەت کەیخوسرەوبەگی کوڕیشی لێ‌هەلگێڕایەوە • هەروەها ناکۆکیی ناوخۆی نێوان مەحموودپاشاو عوسمان‌پاشایش ئەوەندەی تر وەزعەکەی لە مەحموودپاشا تاڵتر کردبوو • ئەمە هەمووی بوو بە هۆی بێزاربوونی مەحموودپاشا لەو بارو دۆخەی تیا ئەژیا • لەبەر ئەمانە ئەکەوێتە سەر خەیاڵی دڵوەدەسهێنانەوەی سوڵتانو لێبوردنو چاوپۆشی‌لێکردنی • بۆ ئەم مەبەستە نامەیەك بۆ والیی بەغدا ئەنووسێت(١١٣) ، بۆی باس ئەکا تیا کە ئەیەوێ خۆی بە خۆی بڕوا بۆ لای سوڵتانو لێی‌ئەپرسێ : ئاخۆ بەڵێنی ئەداتێ ئەگەر چوە بەغدا نەیگرێ ؟ والیش لە وەلامدا نامەیەکی بۆ ئەنووسێتو پێی‌ئەڵێ : وەرە بۆ بەغدا ، ناتگرمو بەڵێنیشت ئەدەمێ کە سوڵتان هیچت لێ نەکا • مەحموود پاشا لەسەر نامەو بەڵێنەکەی دێ بۆ بەغداو ، لە ماڵی محەمەد پاشای داغستانیی ئەبێتە میوان • کاتێ بۆ لای والیی ئەڕوا بۆی روون ئەبێتەوە ئەو بەڵێنەی کە دابوو پێی گوایە سوڵتان عەبدولحەمید عەفوی ئەکات ئەگەر بێتو بێتە

---

(١١٣) لەو سەردەمەدا تەقیەدین‌پاشا والیی بەغدا بوە (١٨٨٠ – ١٨٨٧) بڕوانە : ( أربعة قرون في تأريخ العراق الحديث ، لونكريك ، ل : ٣٦١) و ( لمحات اجتماعية من تأريخ العراق الحديث ج/٣ ل : ٤١ – ٤٢ ) •

بەغدا •• بەدرۆ دەردەچێ • والیی ئیصرار ئەکا بۆ رۆیشتنی بۆ ئەستەمبوڵ چونن سوڵتان داوای کردوە(١١٤) •

مەحموودپاشا بە والیی ئەڵێت : ئەڕۆمەوە بۆ ئەستەمبوڵ بەڵام لـە کفرییەوە بە رێگەی موصلدا ، چونکەپارەو شتومەکم لەماڵەوە بەجێهێلاوە، ئـەیێرم بـۆم بێتە کفـریی • والیـی رازیـی ئەبێت وەکـوو ، زیندانیـەك تابوورئاغاسییەك لە تەك پانزە سوار ژاندرمەدا لەتەکیا بن تـا موصـڵ • حەمەعەلی بەگی برای سێ رۆژ بەر لە حەرەکەی مەحموود پاشا بەغـدا جێئەهێڵێو ، هێزێك لەبەگزادەکانو هۆزی جاف پێکەوە ئـەنێو رۆژی گەیشتنی مەحموود پاشا بە قەرەتەپە ، بەم لەشکرە گـەورەوە قەرەتـەپە داگیرئەکات ، بەم جۆرە مەحموود پاشا دەرباز دەکەنو ، مەحموودپاشا روو ئەکاتەوە شاخەکانی زمناکۆو ، دیسانەوە سوارەکانی کەریم بەگ ئەکەونەوە ئەمسەرەوسەری گرتنـی • بـەڵام وا دیـارە ئـەم جـارە پڕوپاگەنـدەی پیاوو مووچەخۆرەکانی سوڵتان عەبدولحەمید ئەگاتە رادەیەك خزمەکانـی بەگوێی ناکەنو پشتی ناگرنو ، لە چەند سوارێ زیـاتر کـەسی لەگـەڵا نامێنێو نەخۆشییو پیریی تەنگی پێهەڵئەچنێ(١١٥) لەگەڵ ئەوەشدا پاشا بەم سوارە کەمانەوە لە مەیدانا ئەمێنێو هەر خۆی بەدەستەوە نادا •

---

(١١٤) مستەفابەگ لە یادداشتەکانـیدا ئەڵێت : مەحموودپاشا کاتێ بـۆلای والیی ئەڕوا بە پێچەوانەی ئەوەی لە نامەکەیا نووسیبووی بەو بەڵێنەی دابوویێ نەیگرێ، لە ئیچ قەڵا کە ئێستا وەزارەتـی دیفاعە زیندانیی ئەکا مەحموودپاشا چەند رۆژێك لە زیندانا ئـەمێنێتـەوە ، بەڵام ئازایانـە ئەتوانێ لە هەلێکا خۆی لە دەست یاساوڵەکانی بەندیخانە دەربازکـاو ، روو ئەکاتەوە ناو جافو پەنا ئەباتەوە بەرچیای زمناکۆ •

(١١٥) ئەڵێن گوایە مەحموودپاشا کە هەستبە پیریێو کەنەفتی خۆی دەکـا داخ ئەخوا کە ئیتر ناتوانێ شتێ بوکورد بکاتو ، ئەڵێت : « تا توانیـم نەمزانیی ، کە زانیم نەمتوانیی ! » •

مەحموود پاشا زۆری لە کاربەدەستانی گەورەی عوسمانیی ناسیوەو ئاشناو برادەری لەناویاندا زۆر هەبوون • یەکێ لەو ئاشنایانەی ( شیخ الاسلام ابو الهدی)[116] بوە ، کە پلەیێکی ئایینیی بەرزی لای سولتان عەبدولحەمید هەبوەو زۆری ڕێز لێناوە • مەحموودپاشا نامەیەك بۆئەبولهودا ئەنێرێ داوای ئەوەی تیا لێ ئەکا لە سولتان داوا بکات بیبەخشێت • ئەبولهودایش بە سولتان ئەڵێو تکای لێ دەکا بیبەخشێت • سولتان ئەڵێ : سوێندم خواردوە مەحموود لە ناوەڕاستی ئەستەموولدا لە سێدارە بدەم • خۆم ئەزانم گوناهێکی چەند گەورەی چاوپۆشیی لێنەکراوی بەرانبەرم کردوە •

ئەبولهودا بە سولتان دەڵێ : « العفو عند المقدرة فضیلة تکای ئێمە نەدەنە دواوە باشە » • لە ئەنجاما سولتان لەسەر تکای ئەبولهوداو میردەروێش پاشا کە زۆر دۆستی مەحموود پاشا ئەبێ ، دڵی نەرم دەبێو وای لێ دێ کە بڵێ : بە مەرجێ ئەیبەخشم خۆی بەدەستەوە بداو بێ بۆ ئەستەموول• ئەبولهودایش خەبەرەکە بە مەحموود پاشا ڕائەگەیێنێ ، ئەویش ، کە هیچ چارەیێکی شك نەبردوە ، خۆی بەدەستەوەئەداو بەرەو ئەستەموول بەڕێئەکەوێ •

لەم سەفەرەدا عەلیبەگی کوڕیو حەمەعەلیبەگی برای لە خزمەتدا

(116) ( ابوالهدی الصیادی ) ساڵی ١٨٤٩ز لە گوندێك لە نزیکی حەلەب لەدایك بوە ، سەر بەتەریقەی ڕەفاعیی بوە ، لە دوادوایی حوکمی سولتان عەبدولعەزیزدا هاتۆتە ئەستەموول ، یەکێ لە باوەڕپێکراوانی سولتان عەبدولحەمید بوە . سولتان خۆی بە موریدی زانیوە . نفووزێکی گەورەی هەبوەو تکای لای سولتان عەبدولحەمید نەگەڕاوەتەوە . (بڕوانە : لمحات اجتماعیة من تأریخ العراق الحدیث ، ج/٣ ، ص : ٣١ ــ ٣٧ ) .

بوه . هەر کە ئەگەنە ئەستەموول یەکسەر ئەچنە ماڵی دەروێش پاشا[117] .
ئینجا ئەناتە بارەگای سولتان عەبدولحەمید ، سولتانیش ئەیبەخشێ‌و
روتبەکانی جارانی بۆ ئەگەڕێنێتەوە . مەحموود پاشا کە ئەگەڕێتەوە بۆ
هەڵەبجە حوکوومەتی عوسمانیی سەرۆکایەتیی عەشیرەتی جافی جارێکی تر
بۆ دەگەڕێنێتەوە . عوسمان پاشای برای هەر بە قایمقامێتیی ئەمێنێتەوە .
پاش لەسەرتەختداگرتنی سوڵتان عەبدولحەمید ساڵی ١٩٠٨ز مەحموود
پاشا هەمیشە دژی رژێمی ئیستیبدادیی بوە ، بە تایبەتی دوای ئەوە حیزبی
( اتحاد وترقی ) دەست بەزوڵم‌و زۆرداری دەکەن‌و هەر بەڵێنێ بە کوردو
میللەتەکانی تریان دابوو بە درۆ دەردەچێ‌و ئیتر مەحموود پاشا لەم
قۆناخەدا هەوڵی‌داوە یەکێتیی‌و یەکدڵیی لە نێوان سەرۆك‌هۆزەکان‌و
پیاوماقووڵانی کوردا پێکبێنێ‌و بۆ ئەوەی مافێ بۆ کورد بپچڕێ . لەم
بارەوە نامەیەکی زۆر بۆ پیاوە ناسراوەکانی کورد ئەنووسێ . یەکێ لەو
نامانەی ، کە بۆ ئەو ئامانجەی بۆ حاکمی بانەی نووسیوە ، دابووی بە
عەلی‌بەگی رۆستەم‌بەگی خزمی خۆی ، کە دایکی لە بەگزادەکانی بانە بوو .
تورکەکان لە جێگایەك ئەم نامەیان بەدەست عەلی‌بەگەوە گرتبووو ، لەسەر
ئەمە عەلی‌بەگیان دا بە مەحکەمەی موسڵ . ئەگەر (اتحاد)یەکان
نەڕووخابان عەلی‌بەگ‌و مەحموود پاشا تێدادەچوون . هەروەها لەم بارەوە
مەحموودپاشا نامەیێکی تریشی بۆ غولام رەزاخانی پشتکۆ نووسیوەو
پەیمانی لەگەڵدا بەستوە کە بۆ کورد هەوڵبدەن . تا ئێستاش وەڵامی ئەم
نامانە ماون‌و لە کتێبخانەکەی حەسەن‌فەهمی جافدان[118] .

---

(١١٧) ئەم دەروێش‌پاشایە پیاوێکی رەوشت‌بەرزبوەو چاك‌بوە ، ئامۆزایەکی سوڵتان عەبدولحەمیدی خواستوە کە ناوی ناظمەسوڵتان بوە . زۆر دۆستی مەحموودپاشا بوە .

(١١٨) یادداشتەکانی حەسەن فەهمی جاف دەستنووسە .

ناله‌باریی باروده‌خی ئابووریی ئیمپراتۆرییه‌تی عوسمانیی پاش سه‌رکه‌وتنی رژیمی (اتحاد)یه‌کان‌و سیاسه‌تی به‌تورککردنی ئه‌و نه‌ته‌وانه‌ی که له‌ژێر سێبه‌ری ئیمپراتۆریی عوسمانیدا ئه‌ژیان‌و هه‌وڵدانی کاربه‌ده‌ستانی ئه‌م رژێمه به تایبه‌ت سێ فه‌رمانده سته‌مگه‌ره‌که‌ی رژێمی ئیتتیحادیه‌کان ئه‌نوه‌رپاشاو ، ته‌لعه‌ت‌پاشاو ، جه‌مال‌پاشا[119] به‌ده‌ستێکی پۆڵایینه‌وه خه‌باتی نه‌ته‌وه‌کانی ده‌وڵه‌تی عوسمانییان له‌ناو ده‌برد .

ئه‌وه‌ی شایانی باسه نه‌ته‌وه غه‌یره تورکه‌کانی ئیمپراتۆریی عوسمانیی جموجووڵێکی زۆریان ده‌س‌پێکردبوو دژی کاربه‌ده‌ستانی ده‌وڵه‌تی عوسمانیی‌و ، گه‌لی کوردیش له زۆر ناوچه‌ی کوردستاندا بۆ به‌ده‌سهێنانی ئازادیی‌و سه‌ربه‌ستیی چه‌ندین شۆڕشیان به‌رپاکردبوو ، به‌ڵام نه‌بوونی یه‌کێتیی‌و پێوه‌ندیی قایم‌و پته‌و له نێوان شۆڕشگێڕه‌کاندا یه‌کێ له هه‌ره هۆیه سه‌ره‌کیه‌کانی له‌ناوچوونی ئه‌م شۆڕشانه بوو له کوردستاندا[120] .

له‌م رووه‌وه گاردلیڤسکی ئه‌نووسێت: «کورده‌کان هه‌ر به ته‌نیا رائه‌په‌ڕین هه‌ستیان‌کرد ئه‌و هێزو توانایه‌یان نیه شتێکی پێ ده‌ستبخه‌ن . له‌به‌ر ئه‌وه که‌وتنه رێگاخۆشکردن بۆ ئه‌وه‌ی له‌گه‌ڵ ئه‌رمه‌نه‌کاندا رێك‌بکه‌ون‌و به‌یه‌که‌وه رێگای خه‌باتکردن بگرنه‌به‌رو ، مافه‌کانیان ده‌ستبخه‌ن . له هاوینی ساڵی ۱۹۰۹دا پارتی (اتحادوترقی)چه‌ند که‌سان‌و سیخوڕیان به نهێنیی نارده ویلایه‌تی رۆژهه‌ڵاتی‌یه‌کانی تورکیا . ئه‌م که‌سانه ئه‌وه‌یان پێ‌سپێردرابوو تۆوی دووبه‌ره‌کیی له نێوان کوردو ئه‌رمه‌نه‌کاندا بچێنن . جیاوازیی بیروڕای سه‌رۆك‌و سه‌رکرده‌کانی کورد هۆی هه‌ره‌گه‌وره‌و

---

(۱۱۹) ئه‌م جه‌مال‌پاشابه له لایه‌ن نیشتمانپه‌روه‌ره عه‌ره‌به‌کانه‌وه به جه‌مال خوێنرێژ به‌ناوبانگه .

(۱۲۰) بڕوانه : کردستان في الحرب العالمية الاولى د. کمال مظهر ، ترجمة محمد الملا عبدالكريم . ص : ١١٥ .

کۆسپی سەرەکیی بوو لە ڕێی یەکگرتنی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردا •
هەر بۆ نموونە شێخ عەبدولقادری سەرۆکی شەمدینان شیرو تیری لە ئەمین‌بەدرخانی میری بۆتان ئەسوو • هەردووکیان چاویان لەوە بڕیبوو بینە سەرۆك‌و سەرکردەی هەموو کوردەکانی تورکیا • ئەمین‌بەدرخان پاکانەی بۆ لافلێدانەکەی خۆی بەوە ئەکرد گوایە میرنشینی بۆتان لە کۆنەوە هەبوەو خاوەن سایەو دەسەلات بوە ، هەرچی شەمدینانە ئەوە لەوە زیاتر شێخ‌و سەییدو خاوەن دەروێش بن هیچی تر نەبوون ، لایەنگیرانی شێخ عەبدولقادر ئەوەیان بلاوئەکردەوە کە میرنشینی بۆتان هەر ئەوەی لەدەست هاتوە سەرکردەی سوپایی‌و نەك حوکمدار دروست‌بکات • هەردوولاشیان لای کاربەدەستانی تورك بوختانیان بۆ یەکتریی ئەکردە بۆ یەکیان تێ‌ئەچان(١٢١) •

لە شۆڕشی گەورەی میللەتەکانی ئێراندا کە لایەنگیرانی دەستوور بوون لە چەند شوێنێکدا کاریان گرتەدەست‌و لە تەمووزی سالی ١٩٠٩دا محەمەدعەلی شای کوڕی مظەفەرەدین شایان دەرپەڕان •

دەوری کوردەکان لەو ڕووداوانەدا گەورە نەبوو ، زۆر پشتی شاو دەستگای کۆنەپەرستانیان نەگرت ، چونکە قەت شتێکی باشیان لە شاو دەستگای حوکوومەتی شاوە دەستگیر نەبووبوو • لە هەمان‌کاتیشدا شۆڕشگێڕە دەستوورخوازەکان هیچی وایان نەکرد دۆخی گرانی جەماوەری کوردستان چاك بکەن ، ئەوەندە بە تەنگ ڕووداوەکانی تری ولاتەوە نەبوون ، سەرۆکە کوردەکان لە کرمانشا ڕازیی نەبوون لەگەل بەختیاریەکاندا یەك‌بگرن ، ئەوانەی لەگەل شۆڕشگێڕەکانی گەیلاندا بەرەوتاران ئەکشان • کوردەکانی خان‌نشینی ماکۆ زۆر جار ڕووی ئەدا

---

(١٢١) کێشەی کورد (١٨٩٦ ـ ١٩١٧) م،س لازاریف ، بەرگی‌یەکەم ، تەرجەمەی کاوس قەفتان ، بەغدا ، سالی ١٩٨٩ ، ل : ٢٢٦ .

ئەبوونە داردەستی خانی ماکۆ کە یەکێك لە کۆنەپەرستە ناودارەکانی ئێران بوو • بەشداریی ئەو هێزانەیان ئەکرد کە ئەچوون بەگژ پێشمەرگـە لایەنگیرەکانی دەستووردا • شۆڕشگێڕەکانیش هەوڵیان ئەدا کوردەکان بۆ سوودی خۆیان بەکاربهێنن ، نموونەش رۆژانی خەباتە پاڵەوانانەکەی پایزوزستانی ساڵی ١٩١١بوو لە تەورێز • خۆ ئەگەر سەرۆکە کوردەکان جاروبار یارمەتیی لایەنگیرانی دەستووریان بدابایە ئەوە لەبەر ئەوە بوو سوودی خۆیانی تێدابوو ، کوردەکان لە دوارۆژانی شۆڕشەکەدا بوونە هێزی بناغەیی بزووتنەوەی کۆنەپەرستان کەواتە ( سالارالدولە ) سەرۆکایەتیی ئەکرد ( ابوالفتح میرزا سالارالدولە) کوڕی سێهەمی مظەفەرەدین‌شای قاجارە • (سالارالدولە)مرۆڤێکی بوڵەندپەروازو سروشتێکی سەرکەشی هەبوو ، لە سەردەمی باوکیدا ئارەزووی وەلیعەهدیی بوە ، رۆژگاری تێ‌ئەپەڕان • دوای مردنی مظەفەرەدین‌شاد ٢٤ی‌ذیلقەعدەی ساڵی ١٣٢٤ی‌ك ئیعلانی پاشایی خۆیی کردو ، لایەنگیرانی دەستوور ، چون دژی محەمەدعەلی‌شای برای بوون‌و بڕوایان پێی نەبوو ، لەسەرەتاوە پشتیوانییان لێ‌کرد دژی محەمەدعەلی‌شای برای ئەو سەردەمە (سالارالدولە) فرمانڕەوای کوردستان وپەیوەندی لایەنگیرانی دەستوور میرزا (نصرالله) لە گەڵ (سالارالدولە)دا لە رێی حاجی (ملك‌المتكلمين)ەوە بوو ،(سالارالدولە)بە ناوی لایەنگیرانی دەستوورەوە خێڵ‌و هۆزەکانی ناوچەی کرماشان‌و رۆژئاوای ئێرانی لە خۆی کۆکردەوەو ئیعلانی پاشایەتیی خۆیی کرد ، بەڵام ئەم هەوڵ‌و کۆششەی نەگەیشتە قۆناخێك چون لایەنگیرانی دەستوور دەستیان لە پشتیوانیی ناوبراو هەڵگرت‌و هێزەکانی محەمەدعەلی‌شای برای سەرکەوتن بەسەر لایەنگیرانی (سالارالدولە)دا لە ناوچەی نەهاوەندا زۆربەی لەشکرەکەی (سالارالدولە) لە کوردەکانی خواروو ، واتە کوردستانی عێراق بوو ، کە بریتیی بوون لە هۆزی جاف ،

هۆزی زەنگنە ، هەروەها کوردەکانی موکریانو خانەکانی سەقزیش دایانە پالی • لە ناوەڕاستی تەمووزی ١٩١١دا بانگیدا کە سەرداری هەموو کوردستانە • ئەوەی شایانی باسە لەو سەردەمەدا هێزی لایەنگیرانی دەستوور سەرکەوتنە سەر محەمەدعەلیشاداو دەریانپەڕان بۆ رووسیا • بەلام محەمەدعەلی شاه دەستبەردار نەبوو لەوێوە لەگەل (سالارالدولە)ی برایدا رێککەوت کە هەردوکیان بەهێزەکانیانەوە بەرەو تاران بکشێنو لە دەستی لایەنگرانی دەستووریی رزگاری کەن • زۆری نەخایان زۆربەی کوردەکان لە دەورو بەری (سالارالدولە)دوورکەوتنەوە ، لە پێش هەموان خانەکانی پسفیو کوردەکانی موکریو بەگزادە جافەکان دەستبەرداری بوون • (سالارالدولە)بەرە بەرە هیچ هێزێکی بە دەستەوە نەماو لەم ماوەدا هاتوەتە مالی مەحموودپاشای جاف بۆ کۆمەکخوازیی ، بەلام مەحموودپاشا زۆر گوێی نەداوەتیو لە رەوشتو ئەخلاقی نارازیی بوە ، بەلام کەیخوسرەوبەگی کوڕی مەحموودپاشا یارمەتیی داوە وایزانیوە ئایندەی (سالارالدولە)روونەو ئەبێتە پاشای ئێران • بەلام کێشەو هەرای (سالارالدولە)سەری نەگرتو ناوبراو سەری لە ئەورووپاوە دەرکرد (١٢٢) •

بەعزێ لە نووسەرانی کورد ، کە خۆیان بەسەر چەپدا سەپاندوە ، لەو بڕوادان لێهاتوەکانی جاف لەگەل حوکوومەتو رژێمە داگیرکەرەکانی کوردستاندا خۆیان گونجاندوە، لە نێوان دوو هێزی دەولەتەکانی عوسمانییو فارسدا خزمەتگوزار بوونو ، لەو سەردەمەیشدا هەستی نەتەوایەتیی نەگەیشتوەتە رادەی دروستبوونی رێکخراوو گرۆی سیاسیی

(١٢٢) بروانە : تأریخمشروطە ایران . احمد کسروی ، تهران ١٣٤٦ ، ص : ٢٦٧ ، ٢٦٨ . هەروا : کێشەیکوردل : ٢٩٢ . هەروابڕوانە : وتاری سرهنگ سپهر مسعودی معتمدی بە سەردێری غائلۀ سالارالدولە . گۆڤاری بررسیهای تأریخی ، شمارە٣،٤، سالی سێهەم مرداد ـ آبان ١٣٤٧ ـ ١٩٦٨ .

تا شەخسی وەك مەحموودپاشا کاری تێدا بکاتو ، ئەگەر ئەم ڕێکخراوانە هەیشبووبن هیچ کات جافەکان ئامادەی ئەو کارانە نەبوون[١٢٣] .

نازانین ئەم نووسەرانە بە چ بەڵگەیەك بەو قەناعەتە گەیشتوون کە لەو سەردەمەدا هەستی نەتەوایەتیی نەگەیشتبووە رادەی دروستبوونی ڕێکخراوو گرۆی سیاسیی ؟ هەستی نەتەوایەتیی گەلی کورد هەر لە سەدەی شازدەهەمەوە چەکەرەی کردوەو ، مەموزینەکەی ئەحمەدی خانییو ، شەرەفنامەکەی شەرەفخانی بەدلیسییو ، پاشان شۆڕشەکانی کورد سەرلەبەرو ، ڕێکخراوەکانی ١٩٠٨ لە ئەستەموولو ، **دەرچوونی چەندین** ڕۆژنامەو گۆڤاری کوردییو تورکیی ڕۆشنبیرییو سیاسییو کۆمەلەی خۆیبوونو ... هتد هەموو بەڵگەی چەوتیی ڕاکەی ئەم نووسەرانەیە . ئەمە لە لایەکەوە ، لە لایەکی ترەوە ئەم باوەڕەتان کە گوایە ئەمسالی مەحموود پاشا ئامادەی چوونەڕیزی ڕێکخراوە سیاسیەکان نەبوونەو ، ئەگەر کاری سیاسیی ، حیزبیی ، شۆڕشو بزووتنەوەیەك هەبوایە ، کاریان تێدا نەدەکرد ..هەر پووچەو ، نازانین ئەم فەرزی مەحاڵە لە چ شەرایتێکی زاتییو مەوزووعیی قۆناخەکەوە هەڵێنجاوە ؟ ئەوەی ڕاستیی بێ هیچ فەرمانڕەوایێکی داگیرکەر دروستکەری هیچ خاوەن دەسەڵاتێکی نە دەرەبەگایەتییو نە شێخایەتیی نەبوونو ، ئەگەر بیسەلمێنین نەتەوەی کورد وەك نەتەوەکانی تر قۆناخی کۆمەڵایەتیی بڕیبێ ، ئەبێ بڵێین : باری کۆمەڵایەتییو هەلومەرجی قۆناخی مێژووینە دروستی کردوون[١٢٤] .

---

(١٢٣) بڕوانە : مۆمێکی نیوەتەمەنو وەڵامی مێژوو ، نەجمەدین عەزیزبیانی ، مامۆستای کورد ، ژمارە ١٥ ، سوید ، پایزی ١٩٩٢ ، ل : ٣٩ .

(١٢٤) بڕوانە : وتاری : خوایەلە دۆستانم بمپارێزی دژمنانم لەسەر خۆم . حەسەنگەرمیانیی ، مامۆستای کورد ژ : ١٧ - ١٨ ، بەهارو هاوینی ١٩٩٣ ل : ٨٢ .

بێگومان مەحموودپاشا قۆناخی مێژووی میللەتی کورد دروستی کردوە نەك پاشاو سولتانەکانی ئێران‌و عوسمانیی • مەحموود پاشا وەك سەرەك هۆزێکی نیشتمانپەروەری کورد هەستی بەم سیاسەتە نالەبارەو دژی‌کوردەی ئیتتیحادیەکان کردبوو ، لە سیاسەتی ئیتتیحادیەکان نارازیی بوە ، بەلام بە دەسپێکردنی شەڕی یەکەمی جیهانیی ١٩١٤ــ١٩١٨کاربەدەستانی ئیتتیحادیەکان‌و ئەلمانەکانی هاوپەیمانیان هەوڵ‌و تەقەلایەکی زۆریان‌دابوو بۆ بەهێزکردنی هەستی ئیسلامەتیی لە نێوان میللەتەکانی ئیمپراتۆریەتی عوسمانیداو لە هەموو ناوچەیەکی ئەم ئیمپراتۆریەتەدا پیاوانی ئاین خەڵکیان هاندەدا بۆ جیهاد دژی داگیرکەرە کافرەکان ، کە بریتیی بوون لە دەوڵەتە هاوپەیمانەکان • ئەم پڕوپاگەندەیە کارێکی زۆری کردبوە سەر ناوچەی کوردستان‌و ، ئەبینین کە خوالێخۆشبوو شێخ مەحموودی نەمر پاش ئەوەی ئینگلیزەکان بەسرەیان داگیرکرد هەر وەکوو ئیتتیحادیەکانی بە بەرپرسیاری کوژرانی باوکی دەزانی ، بەلام هاوکاریی خۆی لەگەڵ تورکەکان لە دژ ئینگلیزەکان دەس‌پێکردو لە شەڕەکەی شوعەیبەدا بەشداریی کرد • مەحموودپاشای جافیش لەبەر هەستی دینیی لەسەر داخوازیی تورکەکان هەزار سوار جافی بە سەرۆکایەتیی حەمەعەلی برای‌و کەریم بەگی فەتاح‌بەگی برازای نارد بۆ ئەم شەڕە[١٢٥] •

---

(١٢٥) بەداخەرە مامۆستای بەڕێز موکەڕەم تاڵەبانیی لە کتێبی ( ابراهیم خان ثائر من کردستان )دا باسی بەشداربوونی جافەکانی لەم شەڕەدا نەکردوە • وا دیارە نەیبیستوە ئەگینا باسی ئەکرد •

مامۆستا د. کەمال مەزهەری بەڕێزیش لە گۆڤاری رۆشنبیری نوێی ژمارە ١٢٥ی ساڵی ١٩٩٠ لە وتاری کوردو شەڕی شوعەیبەدا نووسیویە : « بەشی هەرەزۆر ئەو سێ هەزار کوردەی چوونە شەڕی ئینگلیز بریتیی بوون لە لایەنگرانی شێخ‌مەحموودو کوڕگەلی داودەو

تورکەکان لە پەلاماردانی قەڵای شوعەیبەدا شکانو فەرماندەی هێزی عوسمانیەکانو سولەیمانعەسکەریی لە داخان بە دەمانچە خۆی کوشت(١٢٦) .

ئیتر عەشایەرە کوردەکانیش پاش خەسارەتێکی زۆر بڵاوەیان لێ کرد. لە یادداشتەکانی مستەفابەگدا ، کە کەریمبەگی باوکی ئەیگێڕێتەوە ، ئەڵێ : خوالێخۆشبوو تۆفیق وەهبی بەگ لە شەڕی شوعەیبەدا یەکێ لە ئەفسەرە ناودارەکانی لەشکری تورك بوە ، تەمێی سەرەك هۆزە کوردەکان ، بە تایبەت خوالێخۆشبوو شێخ مەحموودو حەمەعەلی بەگی جاف دەکات : کە بە خۆڕایی کورد لە پێناوی تورکدا بەکوشت مەدەن . شێخ مەحموودو حەمەعەلی بەگ قسەکەی بەجێ دەزانن‌و بەگوێی ئەکەن ، کەریمبەگ ئەڵێ : من لەبەر تافی لاویی‌و لەبەر خوێنگەرمی‌و حەزبەناودەرکردن پێم خۆش بوو لە شەڕەکەدا بەردەوام بین(١٢٧) .

شایانی باسە هەر ئەم هەستی ئاینییە بوو هانی کوردەکانی دژی لەشکری رووسەکان دا ، ئەو لەشکرە رووسەی کە پەلاماری ناوچەکانی

---

دەلۆو زەنگەنەو هەمەوەندو جافی دەوروبەری کەلار » . مامۆستا د. کەمال مەزهەر وا دیارە نەیبیستوە ئەم جافی دەورو بەری کەلارە کێ سەرکردایەتیی کردوون ، ئەگینا ئەینووسی .

(١٢٦) بۆ زۆرتر ئاگاداریی لە بابەتی ئەم شەڕەوە بڕوانە : لمحات اجتماعية من تأريخ العراق الحديث ، علي الوردي ، بغداد ، ١٩٧٤ ، ص : ١٤٥ .

(١٢٧) نووسەری ئەم لێکۆڵینەوە ساڵی ١٩٧٨ لەگەڵ تەحسینبەگی یەزیدیدا لە لەندەن چوەتە ماڵی تۆفیق وەهبیبەگ‌و چۆنێتی ئەم رووداوەی لێ‌پرسیوە ، ئەویش لە وەڵاما وتوویە : چون ئەمزانیی خەسارەتی کوردەکان زۆرئەبێت‌و سەرکەوتنی تورکەکان مەحاڵە ، ئامۆژگاریی شێخ مەحموودو حەمەعەلی بەگی جافم کردو پێم‌وتن : بەفیڕۆ کورد بۆ داگیرکەر بە کوشت‌مەدەن ، قسەکەم کاری کرد ، دوای خەسارەتێکی کەم بڵاوەیان‌لێ‌کرد .

کوردستانیان داو زولمو زۆرێکی فراوانیان له دانیشتوانی ئەو ناوچەیە کرد • ئەم هەستە بوە هۆی سەرەکیی هاوکاریی کوردەکان لەگەڵ لەشکری عوسمانیدا ، ئەوەبوو کاتێ دەولەتی عوسمانیی داوای له مەحموودپاشاو سەرۆك هۆزەکوردەکانی تری کرد کە له دژی رووسەکان یارمەتییان بدەن هۆزی جاف بە فەرمانی مەحموودپاشا تاهیربەگی وەسمانپاشا ، عەلیبەگی مەحموودپاشا ، حسەینبەگی مەحموودپاشا ، حسەینبەگی حەسەنبەگ ، حەمەسەعیدبەگو حەسەنبەگی وەلەدبەگو ، عەلیبەگی ئەحمەدبەگی وەلەدبەگ •• دژی رووسەکان بەشەڕهاتن ، ئەم شەڕەیش له مەحاڵی سەقز له ناوچەی (قاتانقۆری)دا رووی‌داوه خوالێخۆشبوو شێخ مەحموودی حەفیدزادە لەم شەڕەدا دەورێکی گەورەی هەبوەو ، ئەوەی شایانی باسە لەشکری تورك لەم شەڕەدا دەورێکی گەورەی هەبوە ، ئەوەی شایانی باسە لەشکری تورك لەم شەڕەدا بە هاوکاری کوردەکان ئازایانە دژی لەشکری رووس شەڕیانکردو ، بە هەموو لایەکیانەوە توانییان بەربەستی هێرشی لەشکری رووسەکان بکەن •

بەڕێز شێخ عوسمانی شێخ عەلائەدین نەقشبەندیی بۆمی گێڕایەوە کە خۆی لاو بوە لەم شەڕەدا بەشداریی کردوەو ، زۆربەی عەشایەری کورد ئازایانە شانبەشانی تورکەکان دژی رووسەکان شەڕیانکردوە •

هەر لەو دەورەدا کە دەورەی ئیتتیحادیەکانە مەحموودپاشا سەرکردەی هێزێکی عەشایەری جاف ئەبێ لەگەڵ تابوورێ عەسکەری تورك بە سەرکردایەتیی حسەینرەئووف بەگو بەهاءبەگ ، ئەیانویست ناوچەی رۆژاوای ئێران ، بە تایبەت کرماشان داگیربکەن(١٢٨) •

---

(١٢٨) لونگریك ئەڵێت : هێزی جاف له ناو ئەو هێزانەدا بوون کە لە رۆژاوای ئێران شەڕیانکرد • بڕوانە : تاریخ العراق الحدیث من سنة ١٩٠٠ – ١٩٥٠ ، بغداد ، ١٩٨٨ ، ص : ١٠٤ •

عوسمانیەکان داوا لە مەحمودپاشای جاف دەکەن لەگەڵ ئەم لەشکرەدا بەخۆیو دەستو پەیوەندیەوە بڕوات ، ئەگەر چی مەحمودپاشا پێش ئەم داخوازیەی ئیتتیحادیەکان لەبەر هەندێ کارو باری سیاسیی کاربەدەستانی ئیتتیحادیەکان کەوتبوونە گومانەوە لێی . لە راستییا مەحمودپاشا نەیئەویست لەگەڵیان هاوکاریی بکات ، بەڵام ناچار لەگەڵ لەشکرەکەدا رۆیشت لە ناوچەی کرندا عەشرەتی سەنجاویی قەڵخانییو هۆزە هاوکارەکانیان جافەکان دەشکێننو بەرەو قەسری شیرین دەگەڕێنەوە(١٢٩).
لەم رووەوە سەرەکی بەشی جەنگاوەری قەفقاس ئەنووسێت : زۆری کوردەکان هیچ جۆرە هەستێکی خۆشەویستییو دۆستایەتییان بەرانبەر بە حوکوومەتی تورك نیە . ئەو حوکوومەتەی هیچ باشیەکیان لێ نەدیوەو بە پێچەوانەوە چاوەڕوانن خراپەیان لێ بوەشێنەوە . سەرەڕای هەموو ئەو چەكو جبەخانەی داویانە بە چەند خێڵێکی کورد ، وەك خێڵی جافو ، ئەو هەموو پەلاتیقەی بۆ چەند سەرۆکێکی تری کوردی ئەکەن ، کەچیی کوردەکان هەر ناحەزن ، هەر بۆنموونە ئاغای خێڵێکی کورد کە نزیکەی دە هەزار کەس دەبێ وتی : خێڵەکەی پێی خۆشە ببێتە رەعیەی رووسیا ، چونکە دادپەروەریی لە رووسیا زۆرترە نەك هەر لە

---

(١٢٩) عەلیئەکبەر خانی رەئیسی عێلی سەنجاویی شۆڕشێکی لە شاری کرندا دژی تورك بەرپاکرد ، سەرلەشکرێکی تورکی کوشتو دوو فەرماندەی تورکی حسەینرەئووف بەگو ضیائەدینبەگی شکاند ئەم دوو فەرماندەی تورکە صەدان کوردیان بەبێتاوان کوشتبوو ، سەرداری بۆکانیشیان لە سێدارە دابوو ، ئەم عەلیئەکبەرخانە دژی شارەزاخان لەسەر ئەمە کە پشتیوانیی لە ئەحمەدخانی قاجار ئەکردو لە دەست ناوبراو هەڵاتو خۆی گەیاندە ناوچەی جافو بەسەدو پەنجاسوارەوە چوە ماڵی عوسمانپاشای جاف ، سێ مانگێ لە ماڵیاندا میوان بوو ، ئەم عەلیئەکبەرخانە لە یادداشتەکانیدا باسی ئەم رووداوەی کردوەو بە رێزەوە باسی میوانداریی خانمی وەسمانپاشای جاف دەکات . پێشەکیی نووس خۆی ئەم یادداشتانەی لە کتێبخانەکەی د.سەنجاویدا پاش هەرای خومەینی دیوە . لەم ئاخرەدا بیستم لە دەرەوەی ئێران چاپکراوە .

ئەنادۆڵ ، بگرە لە عێراقیشدا گەلێك لە خێڵەكان ئەو حەزەیان خستوەتە روو كە پەیوەندییان لەگەڵ رووسیادا هەبێت[١٣٠] .

لە راستیدا ئیتتیحادیەكان لە هەڵوێستی كوردەكان رازیی نەبوون . چونكە باش ئەیانزانیی سەرەكهۆزە كوردەكان لەگەڵ رووس و ئینگلیزدا پەیوەندییان هەیەو ، زۆر چاكیان لێ روونبوو كە میللەتی كورد بە هیچ جۆرێ لەگەڵیاندا نیەو ، عەتفی كوردیان بەیەكجاریی لە دەستداوە .

ئەوە بوو زۆری نەبرد لە ساڵەكانی پێش شەڕی گێتیی یەكەمدا ناوچەكانی خوارووی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵو كوردستانی خواروو (عێراق) بوەتە بنكەی بزووتنەوەی رزگاریخوازیی كوردو ، لەوێوە زۆربەی بزووتنەوەكانی كورد دژی زۆرداریەتی توركیا تەقینەوە . ئەوەی راستیی بێ ئاژاوەو راپەڕین لە خوارووی رۆژهەڵاتی ئەنادۆڵدا قەت وەستایی بەخۆیەوە نەدی ، دەسەڵاتی میریی لەم ناوچانەدا هەرگیز چەسپاو نەبوو . لە چەند ناوچەیەكی تریشدا ئەو دەسەڵاتە رووكەش و سەرزاریی بوو . هەر بۆ نموونە خێڵی جاف(٥)هەزار ماڵ دەبن قەت سەرانەو باجیان بە میریی نەئەدا ، بگرە زۆربەی خێڵی جاف ، كە بەشێكیان لە ئێرانیشدا بوون دانیان بە هیچ دەسەڵاتێكدا نەئەنا ، خێڵی هەمەوەندو كوردەكانی بۆتان(٢٥) خێڵ بوون رق وكینەیێكی هەمیشەییان بەرانبەر بە حوكوومەتی تورك هەبوو[١٣١] .

بەم بۆنەوە بە تایبەت لە قۆناغە دواییەكانی شەڕی یەكەمی جیهانیدا حوكوومەتی ئیتتیحادیەكان بە توندو تیژییەكی فراوانەوە هەوڵی تواندنەوەی میللەتی كوردیان دابوو[١٣٢] .

---

(١٣٠) كێشەی كورد ، م،س لازاریف ، ١٨٩٦ ــ ١٩١٧ل : ٣٢٤ .

(١٣١) كێشەی كورد ، م،س لازاریف ، ٣٣٢ .

(١٣٢) كردستان في سنوات الحرب العالمية الاولى ، ص : ٢١٨ .

میللەتی کورد لەم قۆناغەدا شۆڕشێکی زۆریان بەرپا کردو ، شۆڕشەکەشیان زۆر جێگای کوردستانی گرتەوەو هۆیەکانیشی ئەو زوڵم‌و زۆرانە بوون کە ئیتتیحادیەکان لە کوردیان ئەکرد .

ئەم خەبات‌و هەوڵ‌و کۆششی کوردە پەیمانی سیڤەری ١٩٢٠ی لێ‌هاتەگۆڕێ ، بەڵام بە هاتنەمەیدانی کەمالییەکان‌و بەستنی پەیمانی لۆزان هەر مافێ کە بۆ کورد دانرابوو بەئاوادرا ، چونکە کاربەدەستە هاوپەیمانەکان ، کە لە شەڕی یەکەمی جیهانیدا سەرکەوتبوون ، پشتیان لەو مافانە کردو کەوتنە هەڵپەی میراتبەشکردن . ئەمەیش هەرچەندە بە هۆیەکی گەورە دەژمێررێ بەڵام وەنەبێ تەنها هۆی لەناوچوونی مافەکانی کورد بێ ، چونکە هۆی تر زۆرن ، لێرەدا بە بەریەوە نیە بە درێژیی باسی لێوە بکەین . هۆزی جافیش وەك هەموو هۆزەکانی تری کورد گرفتاری فرتوفێڵی ئینگلیزەکان بوون ، هەروەك دەوڵەتی عوسمانیی هەوڵیان‌داوە بۆ بەرژەوەندیی خۆیان ، کوردەکان هاوکارییان لەگەڵ بکەن‌و ، لەم روەوە تەماحیان بەبەر سەرەك هۆزە جافەکان ناوە هاوکارییان لەگەڵدا بکەن .

بە فەرمانی حوکوومەتی ئینگلیز مێجەر نۆئێل پاش داگیرکردنی شاری سلێمانی چوو بۆ لای مەحموودپاشا ، کە ئەو سەروەختە لە دووئاوانی زەڵم بوە . هەر کە خەبەری ئەدەنێ کەوا مێجەر نۆئێل لەگەڵ چەند ئەفسەرێکی پایەبڵندی ئینگلیزدا هاتوە ، بەپیریانەوە ناچێ‌و بەرگی پاشایەتیی عوسمانیی لەبەرئەکاو ، هەرچی نیشانەو میداڵی پێبەخشراوی ئەبێ سەرلەبەری بەقەد خۆیدا ئەکاو لەناو رەشماڵەکەیدا چاوەڕێیان ئەکا . کاتێ مێجەر نۆئێل دێ‌و مەحموودپاشا بەو بەرگ‌و هەیتوهووتەوە ئەبینێ‌و تەماشا ئەکا روتبەکەی لە روتبەی ئەو زۆرترە ، یەکسەر لە بەردەمیدا تەمەنایەکی بۆ ئەکێشێ‌و لە حوزوورا رائەوەستێ‌و دانانیشێ تا مەحموودپاشا خولکی دانیشتنی ئەکا .

پاش بەخێرهاتنکردنی مێجەر نۆئێل ئەڵێ : جەنابی پاشا ئەزانیی بۆ چی مەبەستێ هاتووین ؟ پاشا لە وەلامیدا ئەلێ : بیشزانم حەز ئەکەم لە زمانی خۆتانی ببیستم • مێجەر نۆئێل ئەڵێ : ئینگلیز ئەیەوێ خزمەتی ناوچەی کوردستان بکاو یارمەتیی میللەتی کورد بداو ، مافی بۆ دانێو لە دەست زولمو زۆری عوسمانییابی رزگارکا • بۆ ئەم نیازەش چاوەڕوانی پیاوێکی وەکو جەنابنە ، لە سەرکردەی هۆزی جافی ، هاوکاریمان لەگەڵدا بکا • مەحموودپاشا لە وەلامدا بێ پێچو پەنا یەکسەر ئەڵێ : بەداخەوە لەبەر سێ هۆ من ناتوانم هاوکاریتان بکەم •

یەکەم ئەوەیە : کە باوەڕم ئەوەندە بەهێز نیە مەبەستان راست بێ ، ئەگەر ئێوە بەڕاستیی بتانەوێ خزمەتی میللەتی کورد بکەنو مەبەستتان راست بێ هەزاری وەکو منیشتان لەگەڵا نەبێ ، هەر ئێوە سەرئەکەون •

دوەم ئەوەیە : کە من موسوڵمانمو بیروباوەڕی ئاپینم یەکجار بەهێزەو ئەم بیرو باوەڕەم رێگای ئەوەم نادا هاوکاریتان لەگەڵدا بکەم •

سێیەم ئەوەیە : کە پیربووم‌و تاوی هەڵسوکەوتم لێ بڕاوەو بۆ کاری وەها دەستنادەم • ئینجا ئینگلیزەکان بۆیان دەرکەوت هەڵوێستی مەحموودپاشا ئەمەیە کەوتنە لاوازکردنی دەسەلاتی مەحموودپاشاو هۆزی جاف • مەحموودپاشایش ئەوەندە پیرو بێهێز بووبوو هیچی وای پێ نەئەکرا بەربەرەکانی ئینگلیزی پێ بکا •

مەحموودپاشا لەگەڵ خوالێخۆشبوو شێخ مەحموودی حەفیددا نێوانیان خۆش نەبوەو ، لە حەقیقەتدا هۆی دووبەرەکیی سەرۆکەکانی هۆزی جاف لەگەڵ شێخ مەحموودا لەسەر نفووزو ئەرزو ئاو بوە نەك لەسەر کوردایەتیی ، چون مەحموودپاشا باوەڕێکی تەواوی بە رێبازی کوردایەتی بوەو سەرۆکەکانی جاف بەتایبەت مەحموود پاشا لەو بڕوادا بوە ئەوەی دوای

کێشەی کورد بکەوێ سەرئەکەوێو سەرۆکایەتیی میللەتی کور
ئەگرێتەدەستیو ، لەم روەوە شاعیری بەناوبانگی کورد شێخ سەلام لە
بەسەرهاتی ژیانی خۆیدا ئەم حەقیقەتەمان بۆ روونئەکاتەوەو بۆما
ئەگێڕێتەوە کە چۆن سالی ١٩١٨-١٩١٩ مەحموودپاشا دوو نامەی تایبەتی
داوەتێ کە بیانبات بۆ حوکمداری کوردستان شێخ‌مەحموودو بۆ حاکمی
ولات حاجی سەیید عومەری مامی • کە ئەڕواتە سلێمانی شێخ مەحموو
لە دەربەندی بازیان لە شەڕدا ئەبێو شێخ سەلام نامەکەی کەیاندوەتە
دەستی شێخ مەحموود ، بەلام باسی ناوەرۆکەکەی نەکردوە سەبارەت بە
چی بوە • شێخ سەلام لەسەری ئەڕواو ئەلێت : دوای ئەوە نامەکانم برد
شێخ مەحموود لە پاش یەك دوو رۆژ گیرا لە لایەن لەشکری ئینگلیزەوە
بۆیان ئەگێڕێتەوە چۆن توانیویەتی پاش داگیرکردنی سلێمانی لە لایەن
ئینگلیزەکانەوە خۆی دەربازبکاتو بگاتە ناوچەی قەرەداغو لەو بارەو
ئەلێت : لەوێ بە هەر رەنگێ بوو چوومە لای مەحموودپاشا حیکایەتی
بەسەرهاتی خۆمم بۆگێڕایەوە ، بەلام پاشا زۆر لێی وردکردمەوە کە ئای
شێخ مەحموود کوژراوە یا گیراوەو زیندوە ؟ پێم‌وت : بریندارو زیندوەو
گیراوە وتی شێخ مەحموود بوو بە پیاوێکی گەورەو رەفیقی ئێمەمانا
نیە(١٣٣) •

وەك هەموو سەرچاوە مێژووییەکان دەری ئەخەن ململانێیەك لەسەر
دەسەلاتو سەرۆکایەتی لە نێوان بنەمالەی بەگزادەی جافو بنەمالەی
شێخاندا هەبوە ، بە تایبەت ، لە سەردەمی شێخ سەعیدو شێخ مەحموودی
کوڕیدا کە ویستوویانە دەست بەسەر هۆزی جافا بگرنو بیانکەن بە هێزێ
بۆ پالپشتی دەسەلاتی خۆیان • ئەمەیش دوای ئەوەی کە دەسەلاتی
شێخایەتییان چەسپیوەو لە رووی ئایینیەوە رەگی خۆیی داکوتاوەو ، ئەوە

(١٣٣) دیوانی شێخ سەلام ، ئومێد کاکەڕەش ، سلێمانی ١٩٩١ ، ل : ٣٦ •

ەگە لە ناو دڵو دەروونی کوردەواریدا جێگیر بوەو ، شێخان بـوون بـە
ناوەن زەویو زارو ، ئەبینین کە شێخ مەحموود هەر کە بە پلەو پایەیەکـی
ەرچاو ئەگات لەم دەسەڵاتەدا بە گژ عەشرەتی گەورەی جافو ، عەشرەتی
ازای هەمەوەندا دەچێو[١٣٤] • ئەم هەڵوێستو دووبەرەکییە خێڵەکییـە
ستێکی لە قۆناغ بەدەرنەبوەو ، لەگەڵ سروشتی ئەو سەردەمەدا گونجـاوە ،
ەڵام ئەوە شایانی باسە ئەم دووبەرەکییە نەگەیشتوەتە رادەی لەیەکڕاپەڕینو
ەڕو خوێنڕشتن • بۆ پالپشتی ئەم راستییە :

لە سییەکاندا ئەبینین عیزەت بەگـی وەسمـان پاشـای جـاف پاش
اپەڕینی شەشی ئەیلوول بە سەرۆکایەتیی شێخ مەحموود دەستێکی باڵای
ەبوە لە هاندانی خەڵکدا دژی ئینگلیسەکـان • پشتیـوانیی ناوبراو لـە
ێخ مەحموود ئەبێتە هۆی ئەوە کاربەدەستانی ئینگلیس بۆ سەرکوتکردنی
اپەڕینەکەو کپکردنەوەی دەنگی هاندەرانی جەماوەر :

١ ـ عەزمی بەگی بابان

٢ ـ شێخ قادری شێخ پاشا

٣ ـ ئەوڕەحمان ئاغای ئەحمـەد پاشا

٤ ـ حەمە صاڵح بەگی حەمەعەلی بەگ

٥ ـ حەمەغای ئەوڕەحمان ئاغا

٦ ـ عیزەت بەگی وەسمان پاشا

٧ ـ فایەق بەگ

٨ ـ شێخ محەمەدی گوڵانیی

---

١٣٤) بڕوانە : شێخمەحموودی قارەمانو دەوڵەتی خوارەوەی کـوردستان
محەمەد رەسووڵ هاوار .

٩ ـ مەجید ئەفەندیی کانیسکان

١٠ـ رەمزی فەتاح

١١ـ تۆفیق قەزار •• دەستگیر بکات[١٣٥] •

مەحموودپاشا لە دواساڵەکانی ژیانیدا بۆی دەرکەوت کە ئینگلیز ب
تەواوەتیی بەسەر ناوچەی کوردستاندا زاڵبوەو خۆیشی لەبەر پیریی
لاوازیی توانای مامەڵەکردنو کەوتنە کێشەوبەرەی لەگەڵ ئینگلیزدا نیە ••
ئیتر لەو رۆژانەدا وازی لە سەرۆکایەتیی هۆزی جاف هێنا بۆ کەریمبەگ
فەتاحبەگی برازای • مەحموودپاشا ساڵی ١٣٣٩ك ١٩٢١ز کۆچی دواییکردو
لە شاری قزڕابات لەو مزگەوتەدا کە خۆی بنیاتی ناوە بەخاك سپێردرا •

(١٣٥) بڕوانە : یادداشتەکانی رەفیق حیلمی ، بەشییەکەم ، بەغدا ، ل : ٦٨ .
هەروا : خوایە لە دۆستانم بمپارێزی دژمنام لەسەر خۆم ، گۆڤاری
مامۆستای کورد . ژ : ١٧ ـ ١٨ ، ساڵی ١٩٩٣ . ل : ٧٧ .

# کەریم بەگی جاف

کـەریـم‌بەگ کـوڕی فـەتـاح‌بـەگ کـوڕی حـەمەپـاشـای[1]
[ج]افە • لە ساڵی ۱۳۰۲ك ۱۸۸۹زلە ئاوایی(کردەبان)ی وارگەی کانیی‌چـەقەڵ
[ه]اتوەتە دنیاوە[2] ژیانی منداڵیی لەناو عەشرەتەکەی خۆیدا بوە ، بەڵام بـۆ
[و]ەرگرتنی عیلم چوەتە سلێمانی لە ماڵی ئەوڕەحمان‌ئاغای ئەولاغـای خـاڵی
[ب]ەو بۆ دەرزوەرگرتن چوەتە حوجرەی مەلا سەعیدو لەوێ قورئان‌و کتێبە
[ف]یقهیەکان‌و هەروا وردەوردە کتێبـە فارسیەکانـی تەواوکـردوە ، ئینجـا
[گ]ەڕاوەتەوە بۆ ناو جاف ، لەوێش لای شێخ عەلی بەرزنجیی‌و شێخ غەنیی
[ک]ە مەحموودپاشا لە ئەستەموڵ لەگەڵ خۆیدا هێنابووی‌و .. گەلێکی تـر
[ف]ارسیی خوێند • لە لای مەلا سەعیدی قزڕەباتیش عولوومی عەرەبیی تـا
[ر]ەناریی خوێنـد • لە ۱۹۰۸دا فەتاح‌بەگـی باوکی دنیـای بەجێ‌هێشـت •

---

۱) فەتاح‌بەگ بەهاری ساڵی ۱۹۰۷زلە دەشتی مەریوان بە نەخۆشیی گرانەتا
کۆچی دوایی کردو تەرمەکەی لە گۆڕستانی پێنجوێن بەخاك ئەسپێرن .

۲) خوالێخۆشبو وەسمـان پاشـای جاف بەم شیعـرە فارسییـە مێژووی
لەدایکبوونی کەریم‌بەگی تۆمارکردوە ، بە خەتی رەزابەگی برای کەریم‌بەگ
لە پەراوێزی وێنەکەیدا نووسراوە :

**شب نوروز کـرم گشـت کریـم از داور**
**کوکب سعـد پی چاکریش بسـت کمـر**
**شکـر حق گردید از پسـرش دل‌روشـن**
**بهرتأریـخ بپرسیـد زمن گفتـم مـن :**
**چون‌بهاراسـت ریاحین بسـراید ازبیـخ**
**بلبـل وسرو سمـن نسـتـرن‌و گل تأریـخ**
**۱۳۰۲ هـ**

کەریم بەگ کەوتە ئیدارەی ئەملاك‌و کاروباری عەشائیریی‌و تا باوەنوور • ئیبراهیم خانچیی لەسالی ١٩١٩دا رەسمەن بوەتە سەرۆکی هەموو عێلاتەکانی جاف‌و بە رێکوپێکی زۆر بە باشیی کارو باری هۆزەکەی بەڕیوەئەبرد[٣] •

خوالێخۆشبوو پیرەمێرد بە هۆی کۆچی دوایی کەریم بەگەوە بـــەم شێوەیە پێیدا هەڵداوەو ئەڵێ :

ئێلی جاف کە رەونەقی کوردستانەو ، لە شارەزووردا کە بابا ئەردەڵان پەنای بۆ بردن ئەوانیش لێی کۆبوونـەوەو بوون بە سەبـەبی تەشکیـلاتی حوکوومەتی ئەردەڵان‌و پیرلوتی شاعیری یەگانەی دوایی‌فراتەلە سیاحەتی ئەسفەهانیدا پێی‌وتوون سەرئازادی جیهان • دوای سەردار عەشرەتێکی وەك مەحموودپاشا لە گەرمیان‌دا بە سیفەتی سەرئێلی کەریم بەگی فەتاح‌بەگیان مابوو ، ئەویش چونکو پیاوی خواو بەڕاستیی ئەهلی ناموس‌و تەقوا بوو خوا بردیەوە بۆ خۆی ، بە هەموو مەعنایەکەوە ضایعات بوو ، بەڵام شوکور جێی خاڵی نیە[٤] ئـەو بنەماڵەیە پیاوی وایان هەیـە هیوامان وایـە جێـی پڕبکەنەوە •

کەریم بەگ پیاوێکی تەبیەت ئاچوخ‌و دەس‌بڵاو بوو ، لە سەخاوەتـدا گەلێ مەیدانداریی کردبوو[٥] • قاپی دیواخانی بۆ هەموو کـەس بەربـڵاو بـــوو •

---

(٣) گۆڤاری گەلاوێژ ژ ٧: ـ ساڵی ١٠ تەمووزی ١٩٤٩ •

(٤) ئێستاکە مستەفابەگی کەریم بەگ لەکەلاردا لەجێـی باوکی دانیشتوە • مستەفابەگ بە نیشتـمانپەوەریـی‌و رەوشتبـەرزیی‌و دەهەندەیـی‌و رووخۆشیی‌و میوان‌نەوازیی بە ناوبانگە کەم کەم بەرەو پیریی دەچێت • خوای گەورە تەمەنی زیادبکات •

(٥) شاعیرێکی بەگزادەی جاف سەبارەت بە کـەریم بـەگ‌و جەمیـل بەگـی حەمەعەلی بەگ وتوویەتی :

کەریمبەگ لە ئەربابی نوکتەو نوکتەزانەکان بوە ، هەموو دەم دەم بەپێکەنین بوە ، لەگەڵ گەورەو بچووکدا یەکسانو بەنەرمیی ئەجوولایەوە، خەم لە دنیا جێگەی نەبوەتەوە ، رقەبەریی لەگەڵ کەسدا نەئەکرد ، کەسی رووشکێن نەئەکرد ، بەهانای هەموو کەسێکەوە ئەچوو رێزی لە سەییدو شێخو مەلا زۆر ئەگرت •

مامۆستا نەریمان کاتێ کە مامۆستا بوە لە ناوچەی کفرییو کەلارد ١٩٤٤ ـ ١٩٤٨لە بارەی کەریمبەگۆ ئەڵێت : کەریمبەگ بۆ چاوترساندن نەبێ چەوسێنەر نەبوو ، دوو ساڵ لەکەلاردا بووم دزییو شەڕو دەستدرێژیەك نەئەکرا • داڵدەی هەژارو لێقەوماوان بوو ، عەلیخان ئەکبەری سەرۆکی کەلهوڕ لە ئێرانەوە رایکردە لای کەریمبەگ لە دەستدرێژیی ئێرانو عێراق پارێزگاریی کرد • گەورەکانی دوو هۆزی پالآنی زەنی لە دەستدرێژیی وەنداوییو سەیدەکانی کفرییو هۆزەکانی دیکە لە زەنگاباتەوە

---

کەریمی مامە فەتاحو جەمیلی مامەعەلی
دوو فەرعی زیادە بەرئەصلن قەسەم بە زاتی عەلی
شەجیعو عاقڵو دانا سەخای بارانیان زۆرە
بەرایی جوملەعالەم چە خوفیەوو چە جەلیی

هەروا مەلا محێدینی کوڕی مەلا سەعیدی زلزلەیی کە خۆشەویستی کەریمبەگ بوە ئەم پارچە شیعرەی بەکەریمبەگدا وتوە :

رووبەڕووی عالیجەنابێ من بە رێی دوورا ئەڕۆم
باسی ئەنعامو سەخای بکرێ لە حاتەم دەس ئەشۆم
مەعنی شەیبان فەرزئەکەین گەربێتە بەزمی هیممەتی
مونفەعیل سەردائەخا : کەوشم لە کوێیە با بڕۆم
وەصفی ئابائی تەواو نابێ بە تەحریری قەڵەم
بێزوبان ماون لەگەڵ فورسو عەرەب تاجیكو ڕۆم
رووبەڕووی میری کەلار (محی) هەڵسە بڕۆ
هیچ کەس پێم نایژێ عەیبە ئیتر بۆچ نەڕۆم ؟

هانایان بۆ کەریم بەگ هێنا ، ئەویش پیاوانە برێ سواری لەگەڵ مستەفابەگی کوڕی ناردە ناویانو بوون بە شوورەیەك دژی دەستدرێژکەران(٦) .

کەریم بەگ لەگەڵ ئەوەدا کە پیاوێکی خەیرخوای ئایینی دلخوازی ئایینی بوو ، لە بارەی مێژووی جافانیشدا یەکەمین بەڵگە بۆ رابواردنی دیواخانەکەی لەگەڵ ئەربابی عیلمو ئەدەبدا کۆڕێکی ئەدیبانەی ئەگێرا(٧) لە هەر سووچێکی مێژووی جافەوە قسە ئەهاتە مەیدانەوە کەریم بەگ شاسواری ئەو مەیدانە بوو ، ئەم تەئریخەی کە داینا‌وە بەڵگەیەکی دیارییە بۆ ئەو رایەمان .

کەریم بەگ زەکاوەتێکی ئێجگار سەیری هەبوە ، هەر شوانو سەپانێکی جافی چاوبکەوتایە ناو خۆیو باوکی لێ‌ئەپرسی ، ئینجا ئەم ئیتر پێنج پشتی بۆ کابرا هەڵئەداو ئەینایە مستی کە لە چ هۆزو بنەماڵەیەکەو چی بەسەرهاتوەو چۆنیان رابواردوە .

کەریم بەگ مرۆڤێکی ئاشتیخواز بوو حەزی بە خوێنڕشتنو دووبەرەکیی لەناو هۆزە کوردەکاندا نەدەکردو ، ئەم رێبازەی لە ماوەی سەرۆکایەتی جافدا گرد‌وەبەرو بۆ ئەوەی دزو جەردەو پیاوخراپ لە ناوچەکەیا پەرە نەسێنێ لە سەردەمی شەڕی نێوان تاڵەبانییو جافدا کە لە ساڵی١٩٤٢ لەسەر ناکۆکیی زەویو موڵك رووی‌دا هەر وەك نیازێکی زۆریان بە مرۆڤی شەڕکەر بوو لەو سەردەمەدا ، بەڵام چون لەو بڕوادا بوو

---

(٦) بیرەوەریەکانی ژیانم ، مستەفانەریمان ، بەغدا ، ١٩٩٤ ، ل : ٧ ـ ٨ .

(٧) کەریم بەگ دەریایەکی ئەشعارو ئەدەبیات بوو ، گەلێ شیعری کوردییو فارسییو تورکیی لەبەر بوو ، کە لە دیوەخانێکا دابنیشتایە بە قسەی جوانو ئەشعاری ئاودار ئەبوو بە گوڵدەستەی دیواخانەکە . خۆیشی دەستی شیعری هەبوو زوربەی شیعرەکانی هەزەلییە لە کەشکۆڵەکەیدا تۆمارکراوە .

هەروەکو ئیمامی عەلی ئەفەرمێ : ( ما ظفر من ظفر الاثم به ) سەرکەوتوو نیە ئەوەی زولم‌و گوناه پێی سەرکەوێت‌و ، هەر ناوچەیەك زولم‌و ستەمی تێدا بلاوبێتەوەو فەرمانڕەوای ناڕاست‌و ناعادلی ببێت فەڕو بەرەکەت لەو ناوچەیەدا نامێنێت‌و خەلکەکەی گورفتاری هەژاریی‌و مەینەتیی ئەبن ۰۰ بڕیاری دا هەموو جەردەو دزو ڕێگرەکان لە ناوچەکەیدا پاك‌کاتەوەو بەسەر ئەم هەل‌و مەرجەدا کە بارو دۆخی دوژمنایەتیی نێوان جاف‌و تالەبانیی پێکهێنابوو سەرکەوێ‌و هەموو جەردەو دزەکانی ناوچەکەی هەر وەکوو هەموو لە هۆزەکەی بوو دەری‌کردن‌و ، هەرچیان دزیی‌بوو بەزۆر لێیانی سەندەوەو گەڕاندیەوە بۆ خاوەنەکانی‌و رایگەیاند کە زۆری لا باشترە تالەبانیی دێهاتی ئێمە داگیربکا تا ئێمە ببین بە پەناگای دزو جەردەی جاف[٨] ۰

کەریم‌بەگ کوردێکی نیشتمان‌پەروەرو باوەڕێکی تەواوی بە میللەتەکەی هەبوە ۰ بڕوانە لە سەرەتای نووسراوەکەی سەبارەت بە مێژووی جاف چۆن بیری خۆی سەبارەت بە مێژووی کورد دەردەبڕێ‌و ، ئەلێت : بۆ موحافەظەی تێکنەچوونی ئیستیقلالی بابان زۆر بەگزادە لە بەگزادەکانی جاف‌و پیاوی چاکی جاف کوژراون‌و بەم رەنگە رۆییون‌و خۆیان فیدای وەطەنی کورد کردوەو ناویشیان نیە ۰ ئەمەش بە واسیطەی ئەمەوەیە کە ئومەراو پاشاکانی کورد موبالاتیان بە تەئریخی کورد نەکردو ، تیکرار ئەینووسم‌و بەیانی دلگیریی ئەکەم کە رابوردووی هەموو میللەتێ ئەچێتە غەوری تەئریخەوە ، ئەمما رابوردووی کوردی بێچارە چوەتە ژێر خاکوخۆلی بێ‌تەئریخیوە ۰ ئەگەنا ئەتوانم بنووسم بۆ موحافەظەکردنی ئەم خاکە کەمەی بابانە نیوەی میللەتەکەی خوێنی خۆی رژاندوەو ناویشیان نیە !

---

(٨) بڕوانە : ئاوڕێك لە رابوردوو ، نووسینی محەمەدسەعید جاف ، رۆژنامەی هاوکاریی ، ژمارە ٢٢٢٣ ۰ ١٩٩٠/٦/٢٠ ۰

کەریمبەگ لەگەڵ خوالێخۆشبوو شێخ مەحموودی حەفیددا نێوانیان زۆر باش بوەو ناوبراو تا کۆتایی ژیان بە ئەوپەڕی ڕێزو خۆشەویستیوە باسی ئەو زاتەی دەکرد • وە لە شەڕی ئاوباریکدا بە هەموو توانایەکەوە لەگەڵ شێخ مەحموودا هاوکاریی کردوە • پاش کۆتایهاتنی حوکمداریەتی شێخ مەحموودی حەفید ئینگلیزەکان سلێمانییان بۆمباران کردو شێخ مەحموود پاڵی دا بە چیاکانی کوردستانەوە • ئەو هێزانەی سەر بە کوردایەتیی بوون لە بزووتنەوە نەکەوتن ، وەك سەیید محەمەدی جەباریی کە هێزێکی سەرەکیی شێخ بوو لە ناوچەی کەرکووکدا لەولایشەوە هێزی چەکداری ناوچەی جاف کەوتنە هەستانو بزووتنەوە ، سەرۆکی ئەو بزووتنەوەیە کەریمبەگی فەتاحبەگی جافبوو ، کە پەیوەندیی بە شێخەوە کردو داوای لێکرد ناوچەی گەرمیانو ئاوباریك بە مۆڵگەی ئەو کۆبوونەوەیە دانرا ئاوایی ئاوباریك مۆڵکی شێخ مەجیدی تاڵەبانیی بوو ، جووتیارەکانی لە هۆزی جاف بوون • شێخ مەجید خۆیشی سەربەشێخ بوو پێش ئەوەی شێخ بگاتە جێ تیرەی گەلاڵیی جاف بە سەرکردایەتیی کەریمقوبادو حەمەی کوڕیو صەدسوارێك لە ئاوباریك ئامادە بوون لە تیرەی صۆفیوەندیش صەد سوارێك بە سەرکردایەتیی تۆفیق مستەفاو حەمەنامیقی کوڕی گەیشتە جێ ، هەروەها سوارەکانی تەرخانییو ڕۆغزادیش حازرئەبن • لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٣١ شەڕ لە ئاوباریك دەستپێدەکا • کەریمبەگو داودبەگی برایو محەمەدئەمین بەگ[٩] سەرکردایەتی شۆڕشگێڕەکانی تیرەو لقەکانی جاف وەرئەگرن لەگەڵ هێزی شێخمەحموودا یەکانگیر ئەبن، لەو کاتەی شێخ مەحموود لە ماڵ شێخمەجیدی تاڵەبانیدا هەر لەسەر

---

(٩) محەمەدئەمین بەگ لە شاری بەغدا وەفاتیکرد . بڕوانە : مینەجاف بەغدا ١٩٩٠ ، ل : ٣

مینەجاف دوو کوڕی بوە : سەرتیپو ، حەمە . دووکچیشی بوە : هەتاوو ئافتاو ، ئافتاوو حەمە جوانەمەرگ بوون . سەرتیپ ئێستە دانیشتووی کەلارەو جێگەی باوکی گرتوەتەوە .

نانخواردن لەپڕ لە لایەن فەوجێك سەربازی عێراق‌و ژمارەیەکی زۆر پۆلیس‌و لەشکری چەند پیاوی سەربەدەوڵەت‌و تەیارەی ئینگلیزەکان پەلەمار دەدرێن‌و دەوریان دەگرن • هێزی سەرەکیی میریی بەسەرۆکایەتیی حاجی رەمەزان • جەنگاوەرانی کوردیش ئەکەونە بەرەنگاری کردنەوە ، ئەو رۆژە تا ئێوارە شەڕێکی گەرم‌و خوێناویی بەردەوام ئەبێت ، شۆڕشگێڕان دلێرانە هەلمەت ئەبەنەسەر دوژمن‌و تەنگیان پێ هەڵئەچنن‌و ناچاریان ئەکەن پاشەکشێ بکەنەوە • لەم شەڕەدا دوو چەکداری ئازای شێخ مەحموود بە ناوی جەمال‌و جەلال ئەکوژرێن‌و تەرمەکەیان ئەبەنەوە سلێمانی • لە هێزی جافی گەرمیان مەجیدی مایەخان‌و محەمەدئەمینی ئەلەیارە ئەکوژرێن • حسەین‌سوورکەیی رۆغزادیی بریندار ئەکرێت •

لەم شەڕەدا داودبەگی فەتاح‌بەگ برای بچووکی کەریم‌بەگ ئەوپەڕی ئازایەتیی ئەنوێنێ • تا ماوەیەکی زۆری پاش ئەو شەڕەش کەریم‌بەگ هەر لەچیای دۆڵەکانی ناوچەی جافدا بە یاخێتیی ئەمێنێتەوە پاش ئەوەی شێخ مەحموود لە نیسانی ١٩٣١دا کەوتە دەست میریی‌و بۆ خوارەوەی عێراق دوورخرایەوە کەریم بەگیش چارەی نەما خۆی دا بەدەستەوە •

شەڕی ئاوباریك نموونەی قارەمانێتییەکە کە مێژووی کورد هەتاهەتایە شانازیی پێوەبکاو نەوەی کورد هەتاهەتایە بە شانازییەوە بیگێڕێتەوە[١٠] • ئەوەی شایانی باسە تیرەکانی جاف بەتایبەت تیرەی رۆغزایی بە سەرۆکایەتیی خەلیفە یۆنس‌و حەمەعەلی رۆستەم‌و ، تیرەی سماعیل‌عوزەیریی بەسەرۆکایەتیی مەحموودی فاتێ لە شۆڕشەکانی شێخ مەحموود بەشدارییان کردوە[١١] •

---

(١٠) بڕوانە : وتاری د. حەسەن‌جاف بە سەردێڕی چەند تێبینییەك دەربارەی شەڕی ئاوباریك ، رۆژنامەی عێراق ، ژمارە ٢٧٢٥ سالی ١٩٨٥ •
گۆڤاری رۆژی نوێ ، ژمارە ٧ •
هەروا بڕوانە : شۆڕشەکانی کورد ، عەلائەدین سەجادیی ص : ١٢٧ •
(١١) بڕوانە : چیم‌دی ،ئەحمەدی خواجە ، ١٩٦٦ ، بەرگی ٢ ، ل : ١٣ •

کـەریم‌بەگ ڕۆژی چـوارشـەمەی ڕەمـەزانی ١٣٦٨ك کە ئەکـاتە ١٩٤٩/٧/١ز لە شـاری کفـریی کۆچی دوایی کـردوەو ، تەرمەکەیان لـە گۆڕستانی سەیدخەلیل نێژراوە •

خوالێخۆشبوو پیرەمێردی هێژا بەم بەیتانە مێژووی وەفاتی کەریم‌بەگی بە تەئریخی کۆچییو زایینیی تۆمارکردوە • بەیتەکە ئەمەیە :

ئیلهامی خوا کەریمـە لەرووی خۆشـەویستی‌یـە
مژدەی کەریمی ئـەو بوو کەریمی بەهـەشتی‌یـە

کە ئەکاتە ١٣٦٨ك بەزایینیش بەم بەیتە تۆماری‌کردوە :

کەریم‌بەگ ئێلەکەت شینییە لە شوێنت • ١٩٤٩ •

ئەوەی‌شایانی باسەژمارەیەك لە شاعیرانو زانایانی کوردی بەناوبانگ مەرثیەو شیوەنیـان بـۆ کەریم‌بـەگ کـردوە وەك عەلی‌کـەمال باپـیر ، شێخ‌سەلام ، شێخ ئەحمـەدی شاکـەلیی[١٢] •

کەریم‌بەگ سێ ژنی هێناوە :

١ ـ دورسون‌خانم کچی حەمەهەسەنی سەرەك‌هۆزی تەرخانیـی • دایکی مینەجافی شاعیری بەناوبانگ‌و حەبیبەخانمە •

٢ ـ فەهیمەخانم کچی حاجی عەبدولکەریم ئەفەندی وەنداوی‌یە ، کە یەکێ لە پیاوماقوولانی شاری کفریی بوە • لە فەهیمەخـانم چوار کـوڕی بوە مستەفابەگ‌و عەلی‌بەگ‌و حەسەن‌و فەتاح • دوو کچیش زێباو ئیقباڵ •

مستەفابەگ شەش کوڕی هەیە : ئەندازیار هەڵگورد ،شاهۆ،ئەلبورز، ئەمین ، ئاریا ، سەروەر • دوو کچ : سوهەیلاو ، نەسرین •

٣ ـ ناهیدەخانم کچی وەسمان‌پاشای جـاف ، لـە عادیلەخـانم کـە ئامۆزایشی بوە • لەم ناهیدەخانمە نەوەی نەبوە •

---

(١٢) بڕوانە : گۆڤاری گەلاوێژ ، ژمارە ٧ ، ساڵی ١٠ تەمووزی ١٩٤٩ .

# حەمەبەگی فەتاح بەگی حەمەپاشای جاف

## ١٩٠٤ ـ ١٩٣٤

حەمەبەگ سێهەمین کوڕی فەتاح بەگە ، پیاوێکی لێهاتوو زیرەكو هۆشیارو جەربەزە بوو ، خوێنەوار بوو ، خوێنەوارێکی بەپێی قۆناغزانیاریی لە پلەیەکی بەرزا بوو • وەك حەمەسەعید جافی کوڕی ئەیگێڕێتەوە[1] کە رۆمانێکی زۆر نایابی بە ناوی طاهیرو طاهیرە دانابوو ، بەڵام لە هەڵکەوتی زەمانەدا تیاچوو •

حەمەسەعیدبەگ باوکی خوسرەوجافو ، خوالێخۆشبوو نەبەرد جافو ، کیسراجافو ، ژیانو ، جوان جافە • خوسرەو کوڕە گەورەی حەمەسەعیدبەگ هەم لە ئەندازیاریی‌و هەم لە رۆمان‌نووسیدا خولقێنەرەو بەرهەمەکانی پڕ بەرەکەتەو تەقدیسی کتێبخانەی کوردی کردوە • یەکێ لە شاهکارەکانی (دائرةالمعارف)ی کوردیەو ، رۆمانی پاشایان کوشتو رازو گەماڵو کۆردەرەیە •

حەمەبەگ دوای ئەوەی حوکوومەتی عێراق دامەزرا کردیان بە ئەندامی دامەزراندنی پارلەمان لە ساڵی ١٩٢٩ دانیشتوانی قەزای کفریی لەگەڵ سەعیدوەنداویدا هەڵیان‌بژاردن بۆ ئەنجومەنی پارلەمان لە بەغدا پێوەندیی

---

(١) حەمەبەگ کوڕێك‌و دوو کچی هەبوە . محەمەدسەعیدجافو بەهیەو پەریخان . پەریخانیان کۆچی دوایی کردوە . محەمەدسەعید جاف ساڵی ١٩٢٦ لە دێی کەلار هاتۆتە دنیاوە . یەکێکە لە رۆشنبیرە ناسراوەکانی کورد ژمارەیەکی زۆر وتارو نووسین‌و چیرۆکی هەیە . لە پەنجاکانەوە شوێن‌دەستی لە نووسیندا دیارە . ئێستاکە سەرگەرمی نووسینی یادداشتەکانیەتی . لە راستیا مەوسووعەیەکی یەکجار بەکەڵك دەردەچێ.

لەگەڵ رۆشنبیرانی ئەو سەردەمەی کورد ئەکاو لەگەڵ ئەو مرۆڤانەدا بە نامەنووسین هەوڵئەدات کە مافی رەوای گەلی کورد بەداربەدەستانی ئینگلیزو عێراق بسەلمێنن‌و تەنانەت یادداشتیان بۆ (عصبه الامم) نووسیوەو لەو نووسینانەدا داوای حوکوومەتی فیدرالییان بۆ کوردستانی عێراق کردوە ٠

لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٢٩ نوێنەرانی پارلەمان : عەبدوڵلا محەمەد موفتیی نوێنەری لیوای موصڵ ، جەمال‌بابان نوێنەری لیوای هەولێرو ، محەمەدسەعید حاجی حسەین‌و محەمەدجاف نوێنەرانی لیوای کەرکووك‌و ، سەیفوڵلاخەندان‌و صەبری عەلی‌ئاغا نوێنەری لیوای سلێمانی یادداشتێکیان دایە سەرەك‌وەزیران عەبدولموحسین سەعدوون ٠ لەو یادداشتەدا لە بارەی بەجێنەهێنانی ئیدارەی حوکمی هەرێمی کوردستان نارەزایی خۆیان دەربڕیوەو داوایان کردوە کە ئامۆژگاریەکانی (عصبة الامم) لەو بارەوە بەجێبێنن[٢] ٠

لە مانگی شوباتی ساڵی ١٩٣٠ نوێنەرانی کورد دووبارە یادداشتێکیان لە بارەی کێشەی کوردەوە داوە بە مەندووبی سامیی بەریتانیاو هەروەها لە مانگی مارتی ١٩٣٠دا بۆ بەجێهێنانی مافی گەلی کورد نامەیەکی تریان بۆ سەرەك‌وەزیران نووسیوە٠ [٣]بە بۆنەی ئەوەوە بە یاداشتێکی گرنگ

(٢) یادداشتی سەرەوە لە راپۆرتێکی دەوڵەتی بەریتانیدا نووسراوە کە لە بارەی عێراقەوە لە ساڵی ١٩٣١دادراوە بە ( عصبة الامم ) بڕوانە : رۆژنامەی ( العهد الجديد ) العدد ٢٨٥ ٢٣ تموز ١٩٨٣ ٠ **تاريخ العراق الحديث** ، عبدالرزاق الحسني بغداد ٠ ص : ٣١٢ ٠
هەروەها : چیم‌دی ئەحمەدخواجە بەرگی ٣ل : ٥٢ ، سلێمانی ، ١٩٧٠.

(٣) هەرچەندە مێژووی وەزاراتی عێراق ناوی ئەو کەسانەی کە یادداشتی سەرەوەیان ناودوە ، بڵاونەکردوەتەوە ٠ بەڵام رووداوەکانی ئەو سەردەمەی کوردستان ئەو راستیەمان بۆ دەرئەخا کە محەمەدجاف یەکێك لە مۆرکەرانی ئەم نامانەی سەرەوەبوە ٠ بڕوانە : تاريخ الوزارات العراقية ٠ عبدالرزاق الحسني ٠ ج/٢ ٠ بغداد ، ص : ٤٧ — ٥٣ ٠

ئەژمێرریت[٤] .

نەخشی حەمەجاف لە کۆنگرەی مەندووبی سامیی ئینگلیـزدا لەگـەڵ کوردەکانی سلێمانیو کەرکووكو هەولێر لـە شـاری کـەرکـووكدا زۆر گرنگبوەو ، دەقی وتارەکەی ئەو کۆنگرە سەنەدێکی پڕ ئەرجە لە مێژووی میللەتی کوردا[٥] .

ئەحمەدموختار جافو[٦] محەمەدجاف خاوەنی یەك بیرو ئەندیشە بوونو بەیەکەوە زۆر هەوڵیاندا کە بڕیاری (عصبة‌الامم) بۆ کورد بەدیبێتو هەر

---

(٤) شاعیری کورد ئەسیریی ئەم نوێنـەرە کوردانـەی دەستنیشانکـردوەو ئەڵـێ :

شەش مەردی نیشتمانی لە شەش گۆشـەی وەتـەن
هێشكگرن بەگیانو بـە دڵ هـەوڵو رەنـج دەدەن
سـەردەستەیـە سمـایلی سۆران ، جـەمالبابان
نـەوزادی پـژدەر صـالحبـەگی جـوان
بێتـو کەسـێ بلـێ : چـۆنـە حـەمـەدبـەك ؟
سـەرداری جافـە نایـەگوفتـارو ناوونیشـان

**(٥) بڕوانە : گۆڤاری ژیان . ژمارە ٢٧٥٥، ڕێکەوتی ڕۆژی ١٩٣٠/٨/١٤ .**
هەروا بڕوانە : مأساة بارزان المظلومة ، معروف جیاوك بغداد ، ١٩٥٤ ، ص : ١٠٠ – ١٠١ .

(٦) ئەحمەدموختار کوڕی وەسمانپاشا کوڕی محەمەدپاشای جافە . ساڵی (١٣١٦ك ١٨٩٨ز) لەدایك بوە . دایکی عادیلە خانموکە یەکێـك بوە لە ژنە هەڵکەوتوو دیارو بەدینەکانی کورد ، کە دەستێکـی باڵای بـوە لـە دامەزراندنی هەندێ دیمەنی شارستانێتیی لە ژیانی دانیشتوانی سلێمانیو هەڵەبجەو تا رادیەك عەشائیری جافدا . ئەحمەد لـە سـاڵی ١٩٢٢دا قایمقامی هەڵەبجە بوەو لە ١٩٢٤دا بوە بە نائیب لە پەرلەمانی عێراقدا ، بەڵام دوایی بەو چەشنەی خەڵکی ئەیزانن وازی لە هەموو ئەمانە هێناوە ، شاری بەجێهێشتوەو شۆڕشێکی بەرپاکردوە . چون ئەحمەد موختار لەو بیرو باوەڕەدا بوو کە دەبێت هەموو نەتەوەی کورد دەستبەدەستی یەکدا بکەنو لە پێناوی سەربەخۆییدا خەباتێکی بێوچان دەستپێبکەنو ،

←

بۆ ئەو مەبەستە لەگەڵ رۆشنبیرانی کوردا یادداشتو نامەو تەلگرافیان دا بە (عصبة الامم) کە ویلایەتی موصل لە تورکیا جیابێتەوەو لەو بارەوە درێغیان نەکرد ، بەڵام لە پاشان بۆیان دەرکـەوت کە دەوڵەتـی بەریتانیا نایـەوێ کێشـەی کـورد بە بارێکـا بکەوێو ماوەنـادات لە رێگـا ی گفتوگـۆو نامەنووسینەوە بە ئاشتیی بڕیاری (عصبة الامم)بۆ گەلی کورد سەربگرێت . بەم هۆیەوە ئەم دوو زاتە کەوتنە تەقەلاو خەباتێکی بێوچانەوە کە شۆڕشێکی چەکداریی بەرپابکەن .

لەو کاتەدا ئەحمەد موختار بەمەبەستی هاندانی جەماوەری کوردستانەوە ئەم پارچە شیعرەی وتوە[7] .

---

تا رۆژی سەرکەوتن لەو رێگایە لانەدەن . لـە تەمەنی ٣٨ساڵیدا بـە گوللەتفەنگی دەستێکی پیس لەسەر ئاوی سیروان کوژراو جوانەمەرگ بوو .

بۆ زانین سەبارەت بە شەهید ئەحمەد موختار جاف بڕوانە : دیوانـی ئەحمەد موختار جاف . د.عیزەدین مستەفا رەسوول . بەغدا ، ١٩٨٦ ، ل : ٢٧مێژووی ئەدەبی کوردی عەلادین سەجادی ل : ٥٤٥ .

هەروا بڕوانە : وتاری شوانگەرمیانیی . بەسەردێری شیعرێکی ناتەواو مۆمێکی نیوەتەمەن . گۆڤاری مامۆستای کورد ، ژمـارە : ١٤ بەهـاری ١٩٩٢ ، هەمان سەرچاوە ، وتاری حەسەن گەرمیانی بە سەردێری خوایە لە دۆستانم بمپارێزە دوژمنانم لەسەرخۆم . ژ :١٧-١٨بەهارو هاوینـی ١٩٩٣ ، هەروا شیعرو ئەدەبیـاتی کـوردی ، رەفیـق حیلمـی ، سـاڵی ١٩٤٢ .

(٧) محەمەدجاف لە کۆتایی بیستەکاندا پەیوەندیی لەگەڵ چەند رۆشنبیرێکی کوردی ئەو سەردەمەو مرۆڤی ژیری ناوچەی کفریدا هەبوە ، بۆ ئەوەی پارتێك پێکبێننو لە ئەنجامدا کۆمەڵێك بە ناوی(پارتیئازادیی کوردستان)یان پێکهێنا، ئەندامانی ناسراوی ئەم پارتە بریتیبوون لە :

١ ـ رەئووفبەگی جەلالی کەرکوکیی .
٢ ـ ئیبراهیمئەدهەم .
٣ ـ شێخ محەمەدی گولانیی .
٤ ـ میرزا تۆفیق قەزاز .
٥ ـ ئیسماعیلبەگی رەواندزیی .

ئەم قەراری عوسبەیە خەڵقی ئەڵێن بۆ کـورد ئەبێ
هەر قسەی رووتـە قسـەش ناچێتە نـاو گیرفانـەوە

هەروەها خۆیشیان خولیای شۆڕشی چەکداریان کەوتەسەرەوە • بۆ بەجێهێنانی ئەو مەبەستە لە پێشدا خەریکی دانانی پارتێکی رامیاریی بوونو، لە ناو عەشایردا کەوتنە جموجـوڵو لـە ریزی جافـی کۆچـەردا بنکـەی

---

٦ ـ حسەین حوزنیی موکریانیی •
٧ ـ ئەحمەدموختار جاف •
٨ ـ عەلی کەمال باپیر •
٩ ـ جەلال صائیب •
١٠ـ جەمال بابان •
١١ـ سەیفوللا خاندان •
١٢ـ سەیدمحەمەدی جەباریی •
١٣ـ حازم شەمدین ئاغای زاخۆ •
١٤ـ مەعرووف جیاووك •
١٥ـ شێخ صاڵحی قەرەداغی •
١٦ـ عارف جیاووك •
١٧ـ شێخ جەمال تاڵەبانیی •
١٨ـ شێخ سلێمانی شاکەلیی •
١٩ـ مەلاسەعیدی موفتی کفریی •
٢٠ـ شەریف سەعیدی هەولێر •
٢١ـ سەعید وەنداویی •
٢٢ـ صاڵح زەکی بەگ •
٢٣ـ محەمەدئاغای عەبدوڕەحمان ئاغای سلێمانیی •
٢٤ـ تۆفیق ئاغای گەلاڵیی •
٢٥ـ وەستاصاڵحی بەرگدوور لە کفریی •
٢٦ـ رۆستەمی محەمەدی مەحموودی رۆغزادیی •
٢٧ـ رۆستەمی محەمەدی فەتاحی رۆغزادیی •
٢٨ـ رۆستەمی حەسەنی میکایەلیی •••

بەڵام بە هۆی ئەوەوە برێك لە ئەندامانی ئەم پارتە بوونە کارمەندی دەوڵەتی تازەی عێراقو چەند مرۆڤێکیشیان کۆچی دواییان کرد ، ئـەو پارتە نەیتوانی رۆڵێکی باشو دەرکەوتوو ببینێتو زۆری نەخایـان رێکخراوەکەیان تێکچوو •

شۆڕشیان پێکهێناو ، لە ڕێگای ئێرانەوە ویستیـان پەیوەنـدیی لەگـەڵ دەولەتی ئەلمانیدا بگرن • بۆ ئەو مەبەستە چەند جارێك لە شـاری قەسـری شیرین‌و ناوچەی هەورامانەوە پەیوەندییان لەگەڵ کاربەدەستانی دەولەتـی ئێراندا گرت •

ئەم سیاسەتە دژی ئینگلیزەی ئەحمەدموختار بوو بە مایەی کوژرانی لە لایەن دەستەیەکی نەفامەوە لەسەر ڕوباری سیروان کوژرا[8]• هەردوکیان لەگەرمەی‌تەلاش‌و هەوڵدانی بەرپاکردنی شۆڕشدا بوون چەرخی چەپگەرد بە پێچەوانەی نیازو ئاواتیانەوە وەستا لە ماوەی نۆ مانگـدا یـەك لە دوای یەك هەریەکە بە دەردێکی ناوەخت کۆچی دواییان کرد •

بەڵگەیەکی تر لە بارەی تێکۆشانی محـەمەدجافـەوە بـۆ بەدیهێنانـی بڕیاری (عصبة الامم) ئەم نامەیە کە لە کاتێکدا لەگەڵ مەعرووف جیاوکـدا ئەندامی پارلەمان بـوون • ئـەم یادداشتەیـان داوە بە مەنـدووبی سامیـی بەریتانیی سیرفرانسیس همفریز • ئەم نامەیە بە پێنووسی مەعرووف جیاووك نووسراوەتەوەو دەقی ئەم نامە حەمەسەعیدجاف لە سامانی کوڕی مەعرووف جیاووکی وەرگرتوە •

دەقی نامەکە :

« فەخامەتی مەندووبی سامیی سیرفرانسیس همفریز زۆرگەورە •

لە پاش عەرزی ئیحتیرام :

بە ناوی میللەتی کورد عەرضی خۆش‌ئامەدیـی جەنـابی گەورەییتـان ئەکەین • ئومێدەوارین کە ئەم عەرضەمان لـە لای فەخامەتتـان پـەزێرای قەبووڵ بێ‌و بە حوسنی نیەتتان تەئویل‌بکرێ •

ئێمە کە ناردراوی (مندوب)ی کوردین بە لازمان زانیی ئەوی لـــە

---

(8) بڕوانە : دیوانی ئەحمەدموختارجاف ، ئامادەکردنی د.عیزەدین مستەفـا ڕەسووڵ ، بەغدا ، ١٩٨٦ ل : ٢٣ . هەروەها : شیـعرو ئەدەبیاتـی کوردیی ، ڕەفیق‌حیلمی ، بەغدا ، ١٩٨٣ ، ل : ١٣ .

هەناوی هەر کوردێکدا ئەکوڵێو جۆشانەیە عەرضی جەنابی گەورەیی‌تان بکەین ، مەعلوومی جەنابی عالیتانە کە کوردان لەو ڕۆژەوە خۆیان خستـــە پەناهی حوکوومەتی بەریتانیای گەورە دائیم موتەرەقیبی سیاسەتی بوون‌و [بەو بۆنەیەوە] هەرگیز موخالیفی ئەم سیاسەتە چشتێکیان لێ پەیدانەبوو ،بە ئیعتیقادێ کە ئەم سیاسەتە دەستگیری حوقووقی کـوردان ئـەبێ • ئـەم حوقووقە کە بە موعاهەدات‌و موقەرەراتی( عصبە الامم ) موئەیـەد بـووەو دیسان هەر کوردێك وای ئومێد ئەکردو ئیستـەش ئەمەل ئەکـا کە ئـەم حوقووقەی موقەرەرەی بە ئاهەنگ‌و تەوازونێکی راسـت‌و موفیـدو زۆر ڕووناك‌و صەریح بچێتە پێشەوە •

فەقەط چی سوود لەم موددەتی چەند ساڵەو خوصووصەن لەم ڕۆژانە صەدای هات‌و هاواری قەومەکانی ترو تەوەقوف‌و تاریکی سیاسەت هەموو کوردێکی پەشۆکاندوە ، چونکە لەم ئەتوارو وەضعیەتە وا دەفام دێتەوە کە حوقووقی کوردان زۆر لە سستییەو بە زوبانێکی فەصیح لە دائیرەیێکـی تەنگ‌و تاریك لە ژێر بارێکی زۆر گران ناڵانە • میللەتیش کە خزمەتکاری سیاسەتی فەخیمەیە بە دڵێکی ئاتەشین‌و سۆزان مونتەظیری لوطفی عالیتانەوە هەرچەند ئەسلافی فەخامەتتان ، وەکوو ( سیر هانری دوبسن ) بە موژدەی خۆش میللەتی صەبرو تەسکین کردبوو ، ئۆمێدمان وایە کە عەهدی جەنابی سامیتان بە عینایەتی گەورەییتان عەهدی ڕووناکیی حوقووقی کوردان بێ •

ئیتر زۆر حورمـەت‌و ئیشی کـوردان پێویستی مەرحەمـەتی جەنـابی گەورەییتانە ، قوربان[9] •

| ناردراوی کەرکووك | نارۆدراوی هەولێر |
| --- | --- |
| حەمەجاف | مەعرووف جیاووك |

حەمەجاف لە ڕۆژی ١٩٣٤/٥/١ دا لەتەمەنی ٣٩ساڵیدا بە نەخۆشیی ریخۆڵەکوێرە کۆچی‌دوایی کرد •

---

(٩) بڕوانە : گۆڤاری ڕەنگین ژمارە ٦٣ی‌ساڵی ١٩٩٤ ل : ١٨ •

# داودبـەگی جـاف

داودبەگ لە ساڵی١٩٠٥زدا لە میرەدێ لەدایك بوە • ئەم زاتە پیاوێكی شۆخو شەنگو گفتولفت شیرینو ئازاو چاونەترسو قسەلەڕوو بـوە • فەراسەتێكو زیرەكییەكی تایبەتیی تیـا بوە • باوەڕێكـی زۆر بەهێزی بـە كوردایەتیی هەبوەو لەو بڕوایەدا بوە كە كـورد ئەگـەر دەستی تەفـرەقەو دوودڵییو جیاوازییان لە نێواندا نەبوایە زوو بە قۆناغ ئەگەیشتن • هـۆی هەرەسەرەكیی دواكەوتنی نەتەوەی كورد هەر ئەم دەردەكوشندەیەیە •

داودبەگ زمانی كوردیو عەرەبیـیو فارسيو توركیـی بـەڕەوانیی دەزانیو ، زۆربەی شیعری شاعیرانی فارسی زمانی لەبەربـوو • داودبەگ شۆڕەسواری شەڕی ئاوباریكە • لەو شەڕەخوێناوییەدا لەگەڵ كەریـمبەگی براگەورەییو حەمەمینبەگی برازایدا ئازایەتیەكی زۆریان نواند ، تا رادەیەك دوای تەواو بوونی شەڕ بە سوودی شۆڕشگێڕانی كورد بە سەرۆكایەتیـی شێخ مەحموودی نەمر • شێخ مەحموود لە پیاهەڵدانی جەنگاوەرەكاندا كـە هێزی دوژمنیـان شكانـد ، فەرمووی : « داوود شێرە شێـر »[١٠] ئەمـەی ئاشكرایە بەگزادەكانی جاف تادواهەناسە لەگەڵ شۆڕشی شـێخ مەحمـوودا مانەوە •

بۆ روونكردنەوەی چەند هەڵوێستێكی ئازایانەی داوودبەگ پێـش شەڕی ئاوباریكو ، پاش ئەو شەڕە كورتە باسێك ئەكەین :

كاتێ كە میریی لە نیازی كەریمبەگو براكانی لە سـاڵی ١٩٣١دا كـە ئەیانەوێ هاوكاریی لەگەڵ شێخ مەحـمووددا بكەن ، بـۆ بـەرگریی ئـەم

---

(١٠) بۆ زیاترزانین لە بارەی شەڕی ئاوباریك بڕوانە شۆڕشەكانی كـورد ، عەلائەدین سەجادیی ل : ١٣٨ . هەروەها : رەنگدانەوەی شەڕی ئاوباریك لە شیعری كوردیدا ، كاروان ، ژ : ٨٧ ، حوزەیرانـی سـاڵی ١٩٩٠ ، ل : ٣٢ ـ ٤٢ .

هاوکارییە میریی دەستی کردە پیلانگێڕانو نەخشەکێشانو بۆ بە ئەنجامگەیاندنی نەخشەکەیان مودیر ناحیەی شیروانە رۆیشت بۆ لای کەریمبەگ لە دێی کەلار ، نامەیەکی رەسمیی کفریی داپێی کە تیایدا داوایان لێ کردبوو بچێ بۆ کفریی بۆ راوێژکاریی •

کەریمبەگو براکانی کاتێ گەیشتنە کفریی میریی گرتنیو خستنیە زیندان ، لەو کاتەدا داودبەگ لەگەڵ محەمەدئەمینبەگدا بۆ ئامادەکردنی عێلیجاف ، بۆ بەشداربوون لە شۆڕشی شێخمەحموودا رۆیشتبوون بۆ ناو خێڵاتی جاف • کاتێ کە خەبەر گەیشتە داودبەگ کە کەریمبەگو براکانی گیراون ، بە پەلە لەگەڵ چەند چەکدارێکی جافدا خۆی گەیاندە ناوچەی سەرقەڵا ، چون بیستبووی کۆلۆنێل لاینی ئینگلیز راوێژکاری حوکوومەتی عێراق بۆ هەرێمی کوردستان ، لە کەرکووکەوە هاتبوو بۆ کفرییو بەو ئامانجەوە پەیوەندیی لەگەڵ سەرەك هۆزەکانی جافدا بکا کە پشتیوانیی لە شۆڕشی شێخ مەحموود نەکەن • داودبەگ بەو سوارانەوە ئابلووقەی سەرقەڵا ئەداتو کۆلونێل لاینو قایمقامی کفریی ئەگرێتو ، پێیان ئەڵێ : تا براکانم بەرەڵڵا نەکەن ئێوە لای هۆزی جاف بارمتەنو ، ئەگەر درێژە بە زیندانیکردنیان بدەن ژیانتان ئەکەوێتە مەترسییەوە •

ئیتر بەو جۆرە کۆلۆنێل لاین ناچار دەبێ لە سەرقەڵاوە ئوتومبێلێ بنێرێ بۆ کفریی ، کە کەریم بەگو براکانی لە زیندانەوە بێنێ بۆ لای داودبەگ • داودبەگ پاش ئەوەی براکانی بە چاوی خۆی ئەبینێ لاینو قایمقام بەرەڵڵا ئەکاتو ، دوای ئەم رووداوە کەریمبەگو براکانی ئەچنە پێشوازیی شێخ مەحموودەوە ، دوای ئەوەشەڕی ئاوباریك دەقەومێ کە لە پێشەوە باسمانکرد •

هەروەها لەساڵی ١٩٤٣زدا شەڕێك لە نێوان جافو تاڵەبانیدا لەسەر ماڵو موڵكو زەوی دەقەومێ•لاین ئەو کاتە راوێژکاری سوپای بەریتانیا بوە

له کەرکووك • بە هۆی قایمقامی کفرییەوە داوای هاتنی کەریم بەگ و داوودبەگ ئەکا • کە لە رۆژی ٢/٨/١٩٤٣دا لە دایرەی لاین ئامادەبن • کەریم بەگ و داوودبەگ دەسبەجێ ئەڕۆن بۆ کەرکووك • ئەو کاتە شەفیق ئەحمەدئاغا سکرتێری لاین بوو،لە شەفیق ئاغا ئەپرسن:هۆی داواکردنەکەیان چیە ؟ لە وەڵامدا ئەڵێ : پەیوەندیی لە گەڵ کێشەی ئێوەو تاڵەبانیدا هەیە • هەرچۆنێ بێ کەریم بەگ و داوودبەگ ئەچنە لای لاین • ناوبراو زۆر بە گەرمیی خێراتنی کەریم بەگ ئەکات ، بەڵام بە پێچەوانەوە بەرانبەر بە داوودبەگ زۆر گرژو مۆن ئەبێ • لاین بێ پێچ و پەنا وتی : داوودبەگ تۆ پیاوێکی زۆر خراپ و ئاژاوەگێڕی • باشم لە یادە لە ناوچەی کفریی من و قایمقامت دەسگیرکرد ، ئێستاش بە ئارامیی دانانیشیت و هەوڵ ئەدەی لە قەزای کفریی و ناوچەی جافدا ئاژاوە بنێتەوەو ئەم شەڕەی لە نێوان تاڵەبانی و جافدا رووی داوە تۆ هەڵت گیرساندوە • ئەگەر هەواڵی ئەم شەڕی تاڵەبانیی و جافە بگاتە گوێی گۆبلزی وەزیری پڕوپاگەندەی ئەڵمانیا یەکسەر ئەڵێ شۆڕش دژی حوکمی بەریتانیا لە عێراق پەیدابووەو ! ئەیکاتە بەڵگەیەکی سیاسی دژی بەریتانیا • تۆ پیاوێکی رەق و سەرکەشی و پیاوی رەقیش گورج ئەشکێت • وا ئاگادارتان ئەکەم ئەگەر جارێکی تر شەڕ لە نێوان جاف و تاڵەبانیدا رووبدا دوورتان ئەخەمەوە بۆ ئەفریقای باشوور ، ئەگەر تۆ بە چەکتا ئەنازیی من سەدان تۆپ و فڕۆکەم هەیە •

داوودبەگ لە وەڵامیدا وتی : جەنابی لاین ، من رێگام لە جەنابتان گرت خۆ بۆ چەتەگەریی نەبوو ، خوانەخواستە رووتتان کەمەوە یان نیازێکی خراپی تر • گرتنی ئێوە لە لایەن منەوە هۆیەکی رامیاریی هەبوو • چون ئەو کاتە ئێمە هاوپەیمانی شێخ مەحموود بووین و ئەم مەسەلەیەش هیچ پەیوەندییەکی لەگەڵ شەڕی ئێمەو تاڵەبانیدا نیە • ئەم شەڕە من هەڵم نەگیرساندوە ، بەڵکو تەماحی شێخ وەهابی تاڵەبانیی بەرپای کردوە •

چون ئەیەوێت موڵکی باوباپیرمان داگیربکاتو ، ئێمە تا دواتنۆکی خوێنمان لەسەر مافی خۆمان بەر گری ئەکەینو ، کە هەڕەشەم لێ ئەکەیت کە چەکت هەیەو تۆپو تەیارە ، بێگومان تۆ ئەتوانی هەموو شتێك لەگەڵ ئێمە بکەی ، چون تۆ نوێنەری بەریتانیای گەورەی کە حاکمی عێراقە ئیمڕۆ ، بەڵام ئەگەر ئەم سیفەتەت لێ لابەن تۆ ناتوانی هیچم لێ بکەیت ، چون دڵت بەوە خۆشە ئازاری ئێمە بدەیت فەرموو ئەمر بکە هەرچی زووتر بمانگرنو دوورمـان بخەنـــەوە !

داوودبەگ لە سەرەتای چلەکاندا کە نوێنەری کەرکـووك بوو لــە پەرلەمانی عێراقدا لەو کاتەدا بۆ چارەسەرکردنی زۆر لایەنی دواکەوتـووی باری ژیانو گوزەرانی کۆمەڵایەتیی کوردەواریی قسەی خـۆی بێپـەروا کردوەو ترسی نەخستوەتە بەر خۆی ، تەنانەت خوێندەوارانو رۆشنبیرانی کورد هەڵوێستی خۆیان لە زاری ئەوەوە بە میریی ئەگـەیانـد • کە میـریی بڕیاری لە سێدارەدانی چوار ئەفسەرەکەی دا ، هەندێ لە پیاوماقوولانـی کورد شەوو رۆژ خەریکی ئەوەبوون ملی ئەو نیشتمانپەروەرانە لە پەتـی دوژمن رزگار کەن ، داوود بەگ پێشڕەوی ئەو هەوڵدەرانە بوو • کە کار لەکار ترازا خوڕخوڕ فرمێسکیبۆ ئەڕشتن •

داوودبەگ پشتوپەنایەك بوو بۆ گەلێ لە نیشتمانپەروەران ، ئەوەبوو هەر لە چلەکاندا توانیی بەڕێز حەمەئەمین دەربەندفەقـەرەیی لـە مەترسیی رزگار بکاتو لـە پەنجاکانیشـدا بۆ مامۆسـتای جوانـەمەرگ حەسـیب محەمەدبەگ هەوڵێکی زۆری داو دەنگی گەیاندەکاربەدەستان(١١) •

داوودبەگ لە ساڵی ١٩٥٩دا لەگەڵ عەبدولکەریم قاسم تێکچوو کـە ناسیاری بوە بە بۆنەی تێکچوونی ناوچەکەیانەوە ، عێراقی بەجێهێشـتو چوە خاکی ئێرانەوەو لـەوێ زۆری رێز لێگیـرا ، بـەڵام کاربەدەستانـی

---

(١١) گۆڤاری رەنگین ژمارە (٤١)ساڵی ١٩٩٢ ل : ١٦ ـ ١٨ •

حوكوومەتی ئێران دەسەلاتو هاتوچۆی كوردی بۆ ماڵی داوودبەگ بـۆ قووتنەچوەو ، وشیارییان خستۆتە سەری كە رێگە نەدا كورد هاتوچـۆی بكەن • بەلام داوودبەگ بەوپەڕی ئازاییەوە لە وەلامی سەرۆكی ساواكی غەربی ئێراندا ئەلێ : من نامەردیم لە عێراقدا قوبووڵ نەكرد ، بۆیە بوومـە پەناهەندەی ئێوە ، بڕوا بكە نامەردیی لای ئێوەیش قوبووڵ ناكەمو هەرچی زووتر ولاتەكەتان بەجێ ئەهێڵم • سەرەنجام كە مەسەلەكە تەشەنـەی كـرد ناچار وازیان لێ هێناو بە زەرەری ئەوان كارەكە دوایی هات •

لە ساڵی ١٩٦٦زدا لە ماوەیەكی كورتدا داوودبەگ تووشی نەخۆشیـی خوێنڕژانی گەدە بوو و لە بیمارستانی (میهری‌تاران)دا كۆچی دوایی كردو ، لەسەر وەسیەتی خۆی تەرمەكەیان هێنایـەوە بۆ كوردستانی عێـراقو لـە گۆڕستانی بنەماڵەی بەگزادانی جافو خێڵی جافدا بەخاك سپێردرا •

داوودبەگ لە ژیانیدا سێ ژنی هێناوە ، دوانیان لە بەگزادەی جـافو یەكێكیان لە تاڵەبانیەكان • سەرداربەگ كـوڕە گەورەیەتی بەڕاستیـی توانیویەتی جێـی باوكـی پڕكاتـەوە • براكـانی تری برتـین لـە : دارا ، سالار[12] ، سەربەست ، سەروەت ، سەریـاس ، شەهریـار ، سەرچـڵ ، نەوزاد • چوار كچیشی هـەن بە ناوی : گـەلاوێژ ، خورشیـد ، تابـان ، سەرگـوڵ •

زۆركەس لە بەگزادەكانی جـاف ، وەك خوالێخۆشبـوو حەسـەن فەهمی جاف كە ئەدیبو نووسەرێكی زەبردەستی كـوردبوو ، هـەروەهـا ئەحمەدبەگی حەمەسالحبەگ[13]، بورهان‌جاف، ئەنوەری جەمیل‌بەگی جاف

---

(١٢) سالاری خوالێخوشبوو كەپیاوێكی هەڵكەوتوو بوو لە سـاڵی ١٩٧٩ دا لە لایەن حوكوومەتی ئێرانی خومەینی‌یەوە بێ‌گوناه كوژرا .

(١٣) حەمەصالحبەگ دوو كوڕی بوە ئەحمەدبەگو عیزەت بەگو لە بنەماڵەی بارامبەگییە ، ساڵی١٨٩٧ك لە دایك بوەو ، تەمووزی١٩٧٣ لە بەغـدا كۆچی دوایی كردوە . ئەم زاتانە كوڕو كچین : حـەمەڕەشیـدبـەگ ، جەمیل‌بەگ وەفاتیان‌كردوە . محەمەدئەمین بەگو پەروێزبەگو حەمەدبەگو هۆشیاربەگ

...له رووداوەکانی شۆڕشی مایسی(١٩٤١)دا که لەو بڕوایەدا بوون هەل‌و مەرجێکی باش بۆ کورد پێکدێنێ بە نامەو تەلگراف تەئییدی ئەو شۆڕشەیان کــــــردوە .

وە لــە پـارتە کوردیـەکانـا وەك حـیزبی‌هیواو بزوتنـەوەی کوردا هاوبەشییان‌کردوە . لەم زاتانە ئەتوانین ناوی مستـەفابەگی کەریم‌بـەگ‌و خوالێخۆشبوو ئەنوەرجاف‌و ، مینەجاف‌و ، مەحموود بەگی رەزابـەگ‌و ، شەوکەت‌بەگی ئەحمەدبەگی مەحموودپاشـاو ، بورهان‌جـاف‌و عەلی‌بـەگی حسەین‌بەگی حەسەن‌بەگ ناوببرێن(١٤) .

زۆربەی کوڕانی ئەم زاتانە لەم رۆژانەدا بێ‌لایەنن‌و خەریکی ژیانـــی ئاسـایی خۆیـانن .

دکتۆر حەسەن جاف

---

لەحەیاتان . کچەکانی : رەعنا ، ئەختەر ، پەریخان ، نەسرین شەونم . عیزەت‌بەگ ئـەم‌زاتانـەی لێ‌بەجێ‌ماوە : ئەمجەدبـەگ ، ماجیـدبەگ ناجی‌بەگ ، بەهجـەت‌بـەگ ، لـە کچیش : طەلعـەت‌و ، بـەدیعـەو ئامنەو ، عالیەو ، پەروین .

(١٤) بڕوانە: بیرەوەریەکانی ژیانم ، مسقەفا نەریمان ل ٨٣ - ٩٢ هەروەهـا رەنگین ژمارە ٦٦ ساڵی ١٩٩٤ وتاری فائیق هۆشیار ، یەکەم ئاهەنگی جەژنی نەورۆز .

(١٥) لە بەڵگەنامەگانی (میرزا ملکم خان)دا هەندێك زانیاریی هەیە کە تیشك ئەهاونە سـەر هەندێ باری ژیانی محەمەدپـاشـای جـاف‌و لە کاتـی کتێبەدا بوێرابوو ، بۆ ئـەوەی خوێنـەر ئاگاداری ئەوانـەیش بێـت‌و سوودیشیان لێ‌وەربگیرێت .. لێرەدا تۆماری دەکەین :

«...ولی بار رسما تبلیغ میشود و بابعالی خالی از مناسبت ندیده در تلغرافنامه مزبوره صریحا مندرج داشته است که از امور معوقـــه متراکمه است فقره جناب شیخ عبیدالله افندي ومسئله محمد بیگ جاف وچون اطلاع خاطر محترم جناب مستطاب اشرف از مراتب لازم بود به ترقیم وتصدیع این مراسله پرداخت زیاده زحمت نمی‌دهد ٢٥ شهر ذی حجه ١٢٩٠ امضاء» .

لە جێگەیەکی دیکەدا هاتوە :

«...اما مسئله محمد بیگ در این باره دوستدار بهیچوجه نمی‌داند دولت عثمانی چه ایرادی به اولیای دولت علیه ایران وارد می‌توانند آورد . اولا عشیرت جاف ورؤسای آنها تبعه خالصهٔ دولت عثمانی نبودند بلکه فیما بین دولتین متنازع فیه بودند . چندی در خاك عثمانی توطن کردند حالا بعضی از آنها بمیل خاطر خودشان بدون هیچ قسم تشویق‌و ترغیب بوطن اصلی خود معاودت نمودند و دولت ایران تا امروز بهیچوجه اسبابی که موجب امید کامل آنها تواند شد محض ملاحظه حسن همجواری با دولت علیه عثمانی فراهم نیاورده‌است لیکن کارگزاران دولت علیه عثمانی هر قسم عشیرت صحیحه‌و [ب] خالصه دولت علیه ایران که بخاك عثمانی رفته‌اند فورا کمال تصاحب و حمایت را از آنها نموده نظیر انواع تلطفات و نوازشات می‌دارد و هر قدر مطالبه او با تبعید آنها از سرحد ایران می‌شود بهیچ قسم تمکین نکرده چنانچه اگر سیاهه اسامی این قبیل اشخاص را بخواهید دوستدار حاضراست که با اسم و رسم و تاریخ‌و موقع با سواد تحریرات رسمیه که مباده‌له شده است باستحضار آنجناب جلالتماب برساند در اینصورت که سفارت ایران اینقدر امور معوقه درخاك عثمانی داشته باشد و این طور فضاحت‌و قباحت از عبدالرحمن اقای هرتوشی با تجاوز حدود در خاك بوقوع رسیده باشد و اینقدر از تبعه و عشایر صحیحه ایران‌را تصاحب نموده در سرحد اسکان بدهند ایا در نظر انصاف جای این دارد قرارنامهٔ که باید مبنای رفتار طرفین بدون عایق‌و سکته واقع شود . مشروط بجزئی امورات معوقه سفارت و فقره شیخ عبیدالله‌و محمدبیگ جاف که قرار همه از روی کمال حسن نیت‌و حقانیت داده‌شده است بشود و دوستدار یقین دارد که وکلای دولت عثمانی بعد از اطلاع از مضمون این مراسله تجویز این نوع شروط وقیدرا نکرده از برای اجرای هر نوع منظورات حقه خودشان در ایران اقدامات منصفانه در امورات متعلقه به ایران را شرط خواهند دانست لاغیر» .

( مجله بررسیهای تاریخی ش ۱ سال ۵ اسنادو نامه‌های تاریخی ، مجموعه اسناد میرزا ملکم‌خان ناظم‌الدوله ص ۵ـ٦ ) .

## چەند وێنەیەك

وێنەی چەند لاپەڕەیەك لە دەستخەتی ( تەئریخی جاف ) کە خەتی خوالێخۆشبوو ڕەزابەگی جافە ·

ڕەزابەگی فەتاحبەگی حەمەپاشا مرۆڤێکی خوێندەوارو خەتخۆش بوە · ئەم نەوانەی لێ بەجێماوە : ~~خوالێخۆشبوو~~ خالیدبەگ ، مەحموودبەگ ، عەلیبەگ ، قادربەگ ، بەهرامبەگ · ئەمنەخانم ، حەپسە ، ڕەعنا ، خدیجە نیهایەت ، پەروین ·

محمد پاشا بە مقداریکی کم سوارەوە و فتاح بگی گوری لەگلیا
الی احدیتە چیمنی برایم بگین اوفرقەی جافە لە شاطری کە پیادە کانیا
لەحسیدا امری پالیان لەچیمن الی و ئیتیان خراب الی بە محمد پاشا
ام خبرە اون محمد پاشا اهیچ نادای الی جاف خیانتی وا
لەتک منا ناکن و ناتوانن جسارت و ایکن گورە اوفرقە لەتک
صد سوارا ویت بولای محمد پاشا بم فکرە اگر بتوانن دست بوشلین
وقتی کە تین ار وان فتاح بگ گوری بە هشتا سوارن محمد پاشادە
الەوی کە امە ایلین قرانی ابنە لای محمد پاشا وای ابانی و عموییان
وی پیا اون الان امە فتنەی جافە وەایمە ئمە برین و خرمان بیە
ایمە عبدی توین و عبدلی لەتک حاجی شونید ناتوانی خیانت
لکا عصوم دست دی ماچ اکن کە ام بختانە بوبانە گردوین
لەون دریمە محمد پاشاش پیان الی من هیچ وقت خیانە دا
لەابوە ناکم دروندەوە بو مالی خویان محمد پاشا براور ورتە
فتاح بگ لەتک حفتا سوار لەسوارە کانی انیرتە بوقشتاملە
الی خوشیم پیانی ایمە گفتی والی گرگرت بوی نوسیوم
چادوم پی بلوی هرچند فتاح بگ تقلاش اکا پاشو بمینوە
وپیانی لەنکەدا یم تا گفتی منە نایە سپار چونکە اجل

هویانی ... کوردستانا که زور به ده‌سته‌لات و اقتدار و صاحب

امر بون ... گم نکردایه و داخل صحیفه تاریخ بووایه‌ان یوایمه‌ش تسهیلات

ده بو خصوصا بومن که ام کیتبه ام نوسم ناره‌حه‌تی یه کم نه‌ده بو ده

له کمال سهولت دا بوم تواو ده بو ام مه‌تی په‌ڕی امر دکه زمان

زانینه و حکومتی فخیمه‌ی انگلیس که هاتوته عراق بواسطه‌ی تلاشی

ام حکومته‌وه که بو زیادی زانین و کردنه‌وه‌ی مکتب و پیگه‌یاندن

منداله‌کانی عراق له کورد و عرب براستی شایان توصیفه اما من

خوم دوره‌ی مکتب و تحصیلم تی په‌ڕاندووه اسف بو حالی له‌مه‌وبر

آیا بو خوم و آیا بو باتی تی په‌ڕی ده‌کان وامه‌م به مصلحت زانی

بو تسکینی خوم واه وانی تریش بو عشرتی جاف که عشرتی ایمه‌یه

وله‌وان ایمه جودی بوینه‌ته‌وه و مدتی حوت صد سال

له‌مه‌وبه‌ر باوک و باپیری ایمه له‌وان استفاده‌ی مالی د

دولت و نفوذیان کردووه هم بو ناوی اه‌وان و بو ناوی

بعض له اجدادی خوم بینیته‌وه بیکه‌م به کیتبی و ناوی

له راستەوە بۆ چەپ : داودبەگی جاف ،رەزابەگی جاف ، کەریم بـەگـی جاف ، عەبدورِەحمان بەگی جاف .
ئەم وێنە ساڵی ~~١٩٨٣~~ لە کەلار لە لایەن ( ادموندس)وە گیراوە .
١٩٢٩

# تەئریخـــی جـاف

••• خۆیان کە لە خاکی کوردستانا ، کە زۆر بەدەسەڵاتو ئیقتیدارو صاحیب ئەمر بوون ، گومنەکردایەو ، داخلی صەحیفەی تەئریخ‌بوایەن ، بۆ ئێمەیش تەسهیلات ئەبوو • خوصووصەن بۆ من کە ئەم کتێبە ئەنووســـم نارەحەتییەکم نەئەبوو ، لە کەماڵی سوهوولەت‌دا بۆم تەواوئەبـوو • ئەمـە تێپەڕی •

ئەمڕۆ کە زەمانی زانینەو حوکوومەتی فەخیمەی ئینگلیس کە هاتۆتـە عێراق ، بە واسیطەی تەلاشی ئەم حوکوومەتەوە کـە بۆ زیادیـی زانیـن‌و کردنەوەی مەکتەب‌و ، پێگەیاندنی منداڵەکانی عێراق لە کوردو عەرەب[1] بەڕاستیی شایانی تەوصیفە • ئەمما من خۆم دەورەی مەکتەب‌و تەحصیلـــم تێپەڕاندوە • ئەسەف بۆ حاڵـی لەمەوبـەر ، ئایـا بۆ خـۆم‌و ئایا بۆ باقـی تێپەڕیوەکان • وە ئەمەم بە مەصلەحەت زانی بۆ تـەسکینی خـۆم‌و ئەوانی تریش بۆ عەشـرەتی جـــاف ، کـە عەشرەتـی ئێمەیـەو ، لە ئـەوان ئێمـە جوێ‌بووینەتەوەو ، موددەتی حەوتصەد ساڵ لەمەوبەر باوكو باپیری ئێمـە لەوان ئیستیفادەی ماڵو دەوڵەت‌و نوفووذیان کردوە ، هەم بۆ ناوی ئەوانو بۆ ناوی بەعزێ لە ئەجدادی خۆم بمێنێتەوە بیکەم بە کتێبێ‌و ، ناوی بنێم ( تەئریخی‌جاف ) •

وە ئەم کتێبە بە سێزدە فەصڵ بەیانی ئەوضاع‌و ، ڕەووش‌و ، حەرەکاتی گەورەکانی جاف‌و ، عەدەدی نفووسی جاف‌و ، طایفەکانی جاف لە خاکـــی

---

(١) لێرەدا (دەیکا)یەك هەبێت باشترە .

ئێرانو عیراق‌داو ، هاتنی جاف له ئێران بۆ کوردستانی بابانو ، گەڕانەوەیان بۆ ئێرانو ، دووباره هاتنەوەیان بۆ وڵاتی بابانو ، شەڕێ که له بەینی خۆیانا واقیع بوەو ، لەگەڵ ئەو طایفەو عەشایرانەی که دراوسێیان بوون ؟؟ بوویانەو ، جێگەی کوێستانیان له ئێرانو ، جێگەی زستانیان له لیوای سلێمانیو لیوای کەرکووكو ، جێگەی ئەو طایفەکانی ئێرانیان له ویلایەتی کرماشانو سنه ، که مەشهووره به وڵاتی ئەردەڵان ، تێدا بەیان بکەم •

## فەصڵی ئەوەڵ :

بەیانی عەدەدی طایفەکانی جاف له ئێرانو له کوردستانی باباندا که داخڵی عێراقه • ئەم عەشیرەته به عومووم پێیان ئەڵێن جافو ، ئەم طایفانه ئیسمیان ئەمەیه :

طایفەکانی جافی بابان :

ئیسمی فیرقه : میکایەڵی ، شاتری ، رۆغزادی ، تەرخانی ، باشکی ، هاروونیی ، صەدانیی ، کەماڵەیی ، بەداخیی ، عەمەلە ، عیسایی گەلاڵی ، نەورۆڵی ، یەزدانبەخشی ، وەلیی ، نەژوێنی ، مەسۆدیی ، شێخ‌ئیسماعیلیی ، صۆفی وەند ، تاووگۆزیی ، میراولیی ، پشتماڵه ، سمایل‌عوزێری ، بێسەری ، چووچانی ، تیلەکۆ •

ئەم چەند طایفه له جافەکانی ئێران جوێ بوونەوەو هاتوونه شارەزوورو خاکی بابان ، که داخڵی عێراقەو ، طایفەکانی جاف که له ئێران ماوەتەوە ئەمەیه[۲] که ئەینووسم :

قوبادیی ، باوەجانیی ، ئیمامیی ، یەناخیی ، قادرمیروەیسیی ، طایشەیی ، کۆیك ، نێرژی ، دەروێشیی ، وەڵەدبەگیی ، دەلەژێریی ، کۆکۆیی ، زەردوویی ، عەلی‌ئاخەیی ، پەپڵیی ، تاووگۆزیی ، دووڕوویی ، کوێرەکیی •

---

(۲) ئەگەر لێرەدا بنووسرێ :(ماونەتەوە ئەمانەن که ئەیان‌نووسم) باشتره •

# فەصڵی دوەم

ئەم طایفانە لە ناو خۆیانا چەند فیرقەیەو ، ناوی گەورەی فیرقەکانی کێن ؟

میکایەلیی چوارفیرقەیە : محەمەد ئەلیوەیسیی ، رەشوبۆریی ، شوانکارە ، ئالیی‌بەگیی .

فیرقەی محەمەد ئەلیوەیسیی ، تەخمینەن دانیشتووو گەڕیاویان هەزار ماڵ ئەبن . حەوصەدیان گەڕیاونو ، سێصەد ماڵیان دانیشتوون . گەورەیان رۆستەمی حەسەنی حاجی قادرەو ، میرزای حاجی حسەینەو ، عەلی حاجی قادرە .

دانیشتوەکانیان لە ئاژداغی دەلۆو ، کچانو ، طەرەفی ژاڵەو ، رەباطو کارێزەو ، کۆیكو ، ناحیەی تانجەرۆ ، چ لە طەرەفی عەربەتو ، قەراڵییو ، چ لە طەرەفی نەمەڵو ، بێ‌پوورەو ، قسرد ، دائەنیشن . تەخمینەن ئەم فیرقە سێصەد سوارو سێصەد پیادەی موسەللەحیان ئەبێ . لە رێگەی زوستانەیانەوە کە سەگرمەو دەربەندئاوداری باصەڕەیە ئەچنە قەرەداغو ، لەوێوە ئەچنە ناحیەی تانجەرۆو ، لە رێگەی پووشێنەوە داخڵی ناحیەی سرۆچك ئەبنو ، لە رێگەی گزی‌تاری‌دەرەوە ئەچنە قزلجە ،کە ناحیەی پێنجوێنە . لە طەرەفی سەری باپیرە ، کە شیمالی پێنجوێنە ، رەش‌دەوار هەڵئەدەن . لەوێوە ئەچنە چەمی بێسانو رەشیدو ، لە چەمی بێسانەوە

داخلی خاکی ئێران ، که مەحەلی هاوینو،[٣] ناوی نەکەرۆزو کەلی خانە لە بەینی بانەو سەقزدایە ئەمێنن •

فیرقەی دوەم کە رەشوبۆرییە : ئەم طایفە وەکوو محەمەدئەلی‌وەیسیی بوون • سی سال لەمەوبەر خۆم بۆ تەکالیفی عەشیرەتیی چوومەتە ناویان ، زۆر بە تفاقو دەوڵەمەندو صاحێب‌سوار بوون • بیست ساڵ لەمەوبەر لە تەك عەسکەری تورکا بەشەڕ هاتن ، نزیکی بیست عەسکەریان لە تورکەکان لە شارباژێڕ کوشتو ، تورکەکانیش لەوان نزیکی بیست‌کەسێکیان کوشت • لەم خوصووصەوە دووچاری فەرتەنەیەکی گەورە بوون • بەشی گەڕیاویان زۆر کەم بۆوەو ، زەرەری مەڕو بزنو باقی حەیواناتیان بوو ، مەئموورەکانی لیوای سلێمانی بە چاوی دوشمنیی تەماشایان ئەکردن • زۆر نوقصانیی هات بەسەریانا • ئێستە گەڕیاویان دووصەد ماڵ ئەبێو دانیشوویان سێصەدو بەڵکو چوارصەد ماڵیش ئەبێو ، ئەمانە لە طەرەفی مەملەحەو قەیتوولو ، دەرەبایزو ، ئیمامشاسوارو ، صەدوبیستو ، زرگوێزەڵەو ، زرگوێز لە ناحیەی تانجەرۆ دائەنیشنو ، گەڕیاویان لە رێگەی دەربەندئاودارو سەگرمەوە ئەچنە قەرەداغو ، لەوێوە ئەچنە ناحیەی تانجەرۆو ، لە پشت سلێمانیو وێلەدەرەوە ئەچنە شارباژێڕو ، لە چەمی ئاشانەوە ئەچنە سەر رێی پیرێژن گلێنی تاریدەرو ، لەوێوە داخلی ناحیەی قزلجە کە پێنجوێنە ئەبنو ، لەوێوە ئەچنە سەر باپیرەو ، لەسەر باپیرەوە ئەچنە چەمی رەشیدو بێسانو ، داخلی خاکی ئێران ئەبنو ، لە مەوقیعی حەمەئەلی‌وەیسیی ، لە بەینی سەقزو بانەدا دائەنیشنو ، گەورەی ئەم فیرقە محەمەدخان سلێمان ئەحمەدخیبالییو ، فارسی عەزیز مەردانو مەجیدمەردان و مەحموودیوسفە

(٣) لێرەدا (ئەبن)ێك ببێ باشە •

ئەمڕۆ صەد سواریان ئەبێو ، دووصەد پیادەی سیلاحداریـان ئـەبێ زۆر لە زەمانی پێشـوو کـەمترن •

فیرقەی سێیەم کە شوانکارەیە : ئەم فیرقە صەدو پەنجا ماڵ گەڕیاویان ئەبێو ، دانیشتوویشیان صەدو پەنجامال زیاترە • دانیشتوویـان وان لـە هەشەزینو ، کوورەگەچینەو ، گۆپتەپەی سەنگاوو ، ژاڵەو ، دوودەرو ، لە ڕێگەی ڕەشوبۆرییو حەمەئەلی وەیسیوە ئەچنە سلێمانی ، لە طەرەفـی ئاوبارەو ئاشەسپیی ئەبنو ، لەوێوە بە گۆیژەدا ئەچنە گەڕەدێو ، چەمـی ئاشانو ، داخڵی ناحیەی پێنجـوێن ، هەروەکـوو حەمەئـەلیوەیسیـیو ، ڕەشوبۆریی ئەچنە خاکی ئێرانو لەجێی ئەوانا دائەنیشنو ، گەورەی ئـەم فیرقە ڕەمەزانی بەخشەو ، ناصری مەحموودە ، صەدسوارو صـەد پیـادەی تفەنگداریان ئەبێو ، ئەم فیرقە لە ناو میکایەڵیدا زۆر ئازاو دڕن •

فیرقەی چوارەم : ئالیبەگییە • ئەم فیرقەیە گەڕیاویان صەدو بیست ماڵ ئەبێو، دانیشتوویان لە سەنگاوو لە تانجەرۆ صەدو پەنجا ماڵ ئەبێ • حەفتا سوارو هەشتا تفەنگداریان ئەبێ • گەورەیان حەمەصالحی حاجـی نـادرو حەمەخورشیدی حاجی شاسوارو حەمەطالیبی برایەتی • ئەمانە عەینـەن وەکوو حەمەئەلیوەیسییو ڕەشوبۆریی ئەچنە تانجـەرۆو ، لـەو ڕێگـەوە ئەچنە پێنجوێنو خاکی ئێران • ئەم فیرقە پیاوی موسوڵمانیان زۆر بوو و ، خۆم گەورەکانیان کە دیومن زۆر پیاوی چاك بوونو ، حەزرەتی مەولانـا خالید ، کەئیحتیاجی بە تەعریف نیە ، لـەم فیرقـەی میکایەڵییەیـە ، کـە ئالیبەگییان پێ ئەڵێنو ، شاعیری مەشهووری کورد کە جـەنابی (نالی)یـە ئـەویش لـەم فیرقەیـە •

وە بەعزێ فیرقەی تر وەکوو میرەیی ، کاکلی ، ڕژدەیی ، ئاخەسووریی، ئەمانەش میکایەڵیـنو ، ئەمانـە لەبەر کەمـیی لە نـاو باقـیی فیرقەکـانا شارراونەتەوە • عموومیان تەخمینـەن دووصـەدو پەنجـا ماڵ ئەبـنو ،

نیوەیان دانیشتوو ، نیوەیان گەڕیاونو ، بە ئیعتیباری عوموم پێیان ئەڵێن میکایەلیی • ئەم طایفە سی سال لەمەوبەر زۆر تەرەقییان بوو، لە حەد بەدەر دەوڵەمەند بوون • خۆم لە فکرم دێ باوکم کە فەتاح‌بەگە لە تەك عەبدوڵلاپاشادا کە بەشی گەورەی میکایەلیی لەحسابی تەقسیماتی ئێلی کە لە بەینی بەگزادەدا کرابوو عایدی عەبدوڵلا پاشابوو، بۆ ژمارەی بزنو مەڕیان چوونە ناو میکایەلیی عەدەدی حەیوانیان گەیشتە صەدوبیست هەزار سەرو ، خۆم لە باوکم ئەبیست ئەیفەرموو : سی‌هەزار سەر شارراوەیان زیاتر بوە • ئێستە ئەو دەوڵەتەیان نەماوەو لەو سەرەدا[٤] تەخمینی میکایەڵییان بە پێنجیەکی عەشرەتی جافی مرادییان[٥] ئەکردو ، تەخمینەن صەد ماڵی وای تێدابوو کە هەزار لیرە پارەی نەقدی ببێو ، زۆری سەرخێڵەکانیان حاجی بوون ، پارەی زۆریان بوو ، ئەچوون بۆ حەج • سی ماڵی وا لە ناو میکایەڵییا بوو کە صاحیبی رەووگ بوو ، یەعنی کە صەد مایني یەڵخیی بوو لە صەحرادا • ئێستە لەو ماڵانە چواریان نەماوە • حاجی قادر ، کە باوکی حەسەنی حاجی قادرە ، بە تەنها سێصەد مایني یەڵخیی بوە ، لەمەوبەر کە وەها دەوڵەمەند بوون پیاوی چاکیان زۆر بوو ، ئەمما ئیستە کە فەقیر بوون خراپیان زۆرە • ئەوسا دزیان نەبوو ئیستە پەیدایان کردوە • وەقتە بنووسم بەقەدەر گەلاڵیی دزیان هەیە •

طایفەی دوەم : شاتریبە • ئەمانیشە طایفەیەکی گەورەن لە ناو جافدا لەناو خۆیانا بە چوار کۆمەڵ ناوئەبرێن : کۆمەڵی برایمیی ، میروەیسیی ، وردەشاتریی ، یوسوجانیی • کۆمەڵی برایمیی ئەبن[٦] ، دووصەد ماڵ گەڕیاوو دانیشتووشیان صەد ماڵ ئەبن • گەورەیان حەمەی مەحموودو

---

(٤) (لەو سەردەمەدا)یەو ، بە هەڵە وانووسراوە .
(٥) ئەگەر (مرادیی)بێ رەساترە .
(٦) ئەم (ئەبن)ە نەبێ باشترە .

حەمەی برایمە • دانیشتوەکانیان لە باوەنوور داخڵی ناحیەی شێروانەو ، لە دزیایش لە ناحیەی وارماواو ، لە کەلی دووڕانو ئەطرافیان لە ناحیەی خورماڵ دانیشتوون • ئەمانە کەڕیاویان لە ڕێگەی ملەخوڕنوو لەو کانیئەللاوە دەچنە چوار مڵان لە ناحیەی سەنگاو • وە لەوێوە لە ملەی پەیکولییەوە ئەچنە ناحیەی وارماواو ، لەوێوە ئەچنە ناحیەی خورمال لە لای سەیدصادق لە شارەزوورو ، لە ڕێگەی چەقانو چەوتانەوە ئەچنە ملەکەوەو ، لەوێوە داخڵی ناحیەی پێنجوێن ئەبن لە بەردەمی مەسوود • بەرامبەری پێنجوێن ئەبەزنو ، لە خەڵووزەوە ئەچنە شلێرو ، لەوێوە ئەچنە خاکی ئێران ، لە ڕێی سوورەتووان ئەچنە جێگەی خۆیان ، کە کۆڵو دۆزەخدەرەو کانیفەرانگێزە • دە سەعات لە سنەوە دوورە •

کۆمەڵی دوەم : میروەیسیی ، گەڕیاویان دووصەد ماڵ ئەبیو ، دانیشتوویان صەد ماڵ ئەبێ • حەمە فەرەجی ئاغەو قادری پیروەیس گەورەیانن ، ئەمانە عەینەن وەکوو برایمیی لەو ڕێگەوە ئەچنە ئێرانو ، لە کەژی سوڵطانئاخزۆتی ئەمێننەوەو ، ئەمانە شانزە سەعات لە سنەوە دوورنو ، دانیشتووی ئەمانە لە ناحیەی شێروانەو لە دزیایش ، کە داخڵی ناحیەی وارماوایەو ، لە قەرەتەپە ، کە داخڵی ناحیەی خورماڵە ، دانیشتوون

کۆمەڵی سێیەم : وردە شاتریە • گەڕیاویان صەدو پەنجا ماڵ ئەبنو ، دانیشتوویان هەم صەدو پەنجا ماڵ ئەبن • ئەمانیشە لە ڕێگەی دوو کۆمەڵی پێشوو ئەچنە خاکی ئێران لە قاویلبەگو شاقەڵاو طەرەفی هەزارکانیی دائەنیشنو ، چواردە سەعات لە سنەوە دوورنو ، دانیشتوەکانیان وان لە ناحیەی شێروانە طەرەفی کانی چەقەڵو ، لە بانی خێڵانو کانیسارد کە داخڵی ناحیەی وارماوانو ، لە سوەیلەمشو هەیاس ، کە داخڵی ناحیەی خورماڵن • گەورەی ئەمانە فەرەجی حەمەی رەسووڵو ،

حەمەی خوسرەوو ، یەك دوو پیاوی ترن ، وەکوو حسەینی حاجی محەمەدو سلێمانی حەمەی رەسووڵ ٠

کۆمەڵی چوارەم : کەیوسوجانیە ٠ ئەمانە گەڕیاویان صەد ماڵ ئەبن و، دانیشتوویشیان صەدو بیست ماڵ ئەبێ ٠ ئەمانە لە ریلەی داری خلە کە ها بەسەر گژی سێدارەوە ئەچنە ناحیەی وارماوا ئەسەر رێی ئەو سێ کۆمەڵەکەی ترو ، لە عەینی رێگەی چەقان و چەوتانەوە ئەچنە پێنجوێن و لەوێوە ئەچنە خاکی ئێران و ، لە کوێستانی ئێران لە کەلی باو مێشوولە هەوار دائەنیشن و ، پانزە سەعات لە سنەوە دوورن ٠ وەلی و ، نەژوێنی و ، کەرۆیی ٠ ئەم فیرقە بچکەلانە صەدماڵی ئەبن هان لە ناو ئەم کۆمەلانیی(٧) شاتری یا وەکو شاتری حسێب ئەکرێن ، ئەم طایفە بە عومووم کە پێیان ئەڵێن شاتریی چوارصەد سوارو چوارصەد پیادەی تفەنگداریان هەیە ، گەڕیاوو دانیشتوویان ...(٨)

رۆغزادیی ئەبێ بە چوار فیرقە : کۆمەڵی حەمەجان ، کۆمەڵی سەرحەد ، کۆمەڵی رۆغزاد ، کۆمەڵی سمایڵ ٠ کۆمەڵی حەمەجان گەڕیاویان سێصەد ماڵ ئەبێ و ، دانیشتووشیان صەد ماڵ ئەبێ ٠ گەورەی ئەم فیرقە رۆستەمی حەمەی مەحموودو ، حەمەفەرەجی باوەجان و ، رەشیدی باوەجانە ٠ ئەمما بۆ ناو کۆمەڵی خۆی رۆستەم لە گشتیان گەورەترەو ، سلێمانی حەمەجان ئەویش گەورەیانە ئەمما وا لە ئێران دانیشتوە ، بوە بە صاحیبی هەشت نۆ دێ لە مەحاڵی خورخورەداو ، ئەم چوارصەد ماڵی گەڕیاوو دانیشتوە عومووم ئامۆزاو برازاو برای یەکن و ، د انیشتووی ئەمانە وان لە سەرقەڵا ، کە داخڵی ناحیەی شێروانەیەو ، هەم لە زەڕایەن و کانی ڕەش و محەمەدخانی ، کە داخڵی ناحیەی وارماوان ، دانیشتوون ،

---

(٧) ئەگەر (کۆمەڵەی) بێ باشترە .
(٨) لێرەدا هەست بە ناتەواویی دەکرێت .

ئەم کۆمەڵی حەمەجانە لە رێی کەوەڕێوە ئەچنە بۆرمحەمەد لە ناحیەی سەنگاوو ، لەوێوە ئەچنە کۆڕی‌ئەسپو طالەبانو ، لەوێوە لە کەلی پەیکولیوە داخلی هەردو ناحیەی قەرەداغو وارماوا ئەبنو ، لە کەنی گەورەقەڵاوە ئەچنە کانی‌ڕەش‌و زەڕایەنو ، لەوێوە لە رێی بنەجووت‌و دوودارەوە ئەچنە کەوڵۆزو ، لە کەوڵۆزەوە بە رێگەی هەرزەڵەدا ئەچنە پێنجوێن ، لە بەردەمی پێنجوێن ئەبەزنو ، لە خەڵووزەوە ئەچنە شەیدانو میشیاو ، وە لەوێوە بە رێی[درەرادا]ئەچنە خوسرەوخانو ،هانەتاڵەو ،مەولاناواو ، دەرەهوانو ، کەوکۆسان ،کە داخلی خوڕخوڕەو خاکی ئێرانە • وە ئەمانە هان لە بەینی سەقزو سنە[٩] پێنج سەعات لە سەقزەوە دوورن •

فیرقەی سەرحەد : ئەمانە صەد ماڵ ئەبن • ئەمڕۆ گەڕیاویان نیە هەموو دانیشتوون ، حەفتا ماڵیان وا لای خەلیفە یونس لە دزکەرەو ئەطرافیو ، سی ماڵیان وا لە قولیجانی سەرحەد • گەورەی ئەمانە خەلیفە یونس‌و ئەحمەدڕۆستەمی ئامۆزایەتی • وە ئەم صەد ماڵە گشتیان براو ئامۆزای یەکن‌و دوورنەکەوتوونەتەوە لەیەك • زەلام‌و سواری تفەنگداریان صەد کەس ئەبن • ئەمانە پانزە ساڵ لەمەوبەر گشتیان گەڕیاو بوونو ، لەم میقدارەش زیاتر بوون ، صەدوپەنجا ماڵ ئەبوون •

کۆمەڵی سێیەم : کە کۆمەڵی رۆغزادە ، ئەمانە صەدماڵ گەڕیاویان ئەبێو ، دانیشتوویان صەدو پەنجا ماڵ ئەبن ، دانیشتووەکانیان وان لە ناحیەی شێروانە[١٠] دێهاتی سەرقەڵاو ، لە ناحیەی سەنگاو لە تەپەگەڕووس‌و ،بەراوگەڵ‌و دێی ئەمینی کاکەمەدو ،کوردەمیرو ، لە ناحیەی تانجەرۆ لە دێی سێ‌تەڵانو قازاو دانیشتوونو ، گەڕیاویان وەکوو کۆمەڵی

---

(٩) (سنەدا) رەوانترە .

(١٠) (لە دێهاتی) بێ باشترە .

حەمەجان لە پەیکولێوە ئەچنە قەرەداغو ، لەوێوە داخڵی ناحیەی تانجەرۆ لە شارەزوور ئەبن‌و ، لە عەینی رێگەی کۆمەڵی حەمەجانەوە ئەچنە پێنجوێن‌و ، لەوێوە بە رێی شەیدان‌و مشیاوا ئەچنە جێگەی هاوینە کە سێوەسوورەو لە مەحاڵی‌خورخورەو ، چوار سەعات لە سەقزەوە دوورە ، گەورەی ئەمانە فەتاحی کامەران‌و ، وەثمانی ئەمین‌و ، حەیدەری عەزیزو ، تۆفیقی محەمەدی شاوەیسە •

فیرقەی سمایل گەڕیاویان حەفتا ماڵ ئەبن‌و ، دانیشتوویان هەشتا ئەبێ ، دانیشتوەکانیان وان لە ناحیەی شێروانە لە دێهاتی سەرقەڵاو ، بەشێکیان وان لە دێی قەڵاسوورە لە ناحیەی وارماواو ، بەشێکیان وان لە دووکان‌و دووکەرۆ لە ناحیەی قەرەداغو ، بەشێکی تریان وان لە محەمەدخانیی‌و مووان‌و قاڵیی‌جۆ لە ناحیەی خورماڵ • گەورەی ئەمانە مەدحەتی صاڵحی کاکەخان‌و ، رۆستەمی حەمەی فەتاح‌و ، عەولکەریمی رۆیتەنە • ئەمانە گەڕیاوەکانیان لە رێگەی کۆمەڵی حەمەجان‌و رۆغزادەوە بەپەیکولێدا ئەچنە قەرەداغو وارماواو • لەوێوە ئەچنە مووان لە ناحیەی خورماڵ‌و، لەوێوە بە رێگەی کەوڵۆسا ئەچنە پێنجوێن‌و ، لە شەیدان‌و مشیاوەوە داخڵی خورخورە لە خاکی ئێران ئەبن‌و ، ئەمانە لە طەرەفی عیساقاواو شەدەرە دائەنیشن‌و ، شەش سەعات لە سەقزەوە دوورن • ئەم چوار طایفە کە پێیان ئەڵێن رۆغزادیی گەڕیاوو دانیشتوویان بە هەیئەتی عومووم چوارصەدو پەنجا سوارو چوارصەدو پەنجا پیادەی تفەنگداریان ئەبێ‌و ، زۆر ئازاو مەزبووت‌و شەرکەرن‌و ، لە ناو عەشرەتی جافدا بە ئازایی مەشهوورن‌و ، زۆر صاحیب نانیشن‌و ، ئەمڕۆ پیاوی صاحیب‌پارەشیان زۆرەو ، زۆر مەیلیان لەسەر فەلاحەت‌و کەسابەت هەیە •

تەرخانیی طایفەیەکن ئەبن بە دوو فیرقە • بەشی ئەڵك‌و ، بەشی قاچۆڵ • گەڕیاویان سێصەد ماڵ ئەبن‌و ، دانیشتوویان صەدو پەنجا ماڵ ئەبێ‌و ،

دانیشتوەکانیان وان لە ناحیەی شێروانە لە طەرەفی سەرقەڵاوە ، لە دێی زەردەو توورانو کانیمارانو پیازەجاڕو ، لە ناحیەی قەرەداغا دێی هۆمەرقەڵا عیبارەتن لەوانو ، لە ناحیەی وارماوا لە چبووخو کانیکەوەو کەریمئاواو ، تەپەکەل دانیشتوونو ، گەڕیاویان لە ڕێی ڕۆغزادیوە ئەچنە ناحیەی سەنگاوو لە کەلی پەیکولیوە ئەچنە ناحیەی قەرەداغو وارماوا ، لەوێوە ئەچنە شارەزوور ، لە طەرەفی یەخشییو مالوانەوە لە عەینی ڕێگەی ڕۆغزادیوە ئەچنە پێنجوێنو ، لە شەیدانو مشیاوەوە داخلی خاکی ئێران ئەبنو ، جێی هاوینیان عیبارەتە لە باشورتیو ، کانامەدو ، قەرەخانو ، ئاڵغوزاغاجو ، ئەمانە شەش سەعات لە سەقزەوە دوورن ، گەورەی ئەم طایفە بە عوموم حەمەحەسەنو حەمەی شاسوارە • ئەم طایفە فیرقەیێکن لە ڕۆغزادیی ، یەعنی بە عوموم لە پێنج بران • تەرخانی کە بە ناو جیابوونەتەوە لە بەر ئەمەیە بەشی ئەلکی پیروەیس لە قەدیمەوە خزمەتکاری گەورەی جاف بوون وەکو بەگزادە بێو ، لە تەکالیفی عەشیرەتیی تەرخانکراون ، یەعنی لە تەکلیف رزگاربوونو ، خوصووصەن لە زەمانی ریاسەتو گەورەیی محەمەدپاشادا زۆر خزمەتی نومایانیان بە محەمەدپاشا بوەو ، بەم واسیطەوە ئیسمیان لە ڕۆغزایەتیی گۆڕاوەو ناوبراون بە تەرخانیو ، ئەم طایفە گەڕیاوو دانیشتوویان بە هەیئەتی عومومی دووصەد سوارو دووصەد پیادەی تفەنگدار ئەبن • ئەمانیش وەکوو ڕۆغزادیی زۆر ئازاو شەڕکەرنو ، ئەمڕۆ زۆریش دەوڵەمەندن بە حەیوانو بە نەقد •

باشکیی : کە یەك فیرقەن صەد ماڵ ئەبن • وە ئەم فیرقە لە (شەرەفنامە)دا ، کە لە هەزارو پێنجی هیجریدا تەئلیفکراوە ، ئەمیر شەرەفخانی بەدلیسی کە یەکێکە لە حوکمدارانی کورد ناوی بردوون ، ئەمانە دانیشتوویان زۆر کەمە ، عەینەن لە ڕێگەی ڕۆغزادیو تەرخانیوە ئەچنە شارەزوورو لە عەینی ڕێگەی ئەوانەوە داخلی خاکی ئێران ئەبن • لە

ناو تەرخانی لە باشورتی دائەنیش • ئەم طایفەیە زۆر کوردن‌و ، زوانیـان وەکو کوردی سێصەد سال لەمەوبەر وایە ، هیچ نەکۆڕیاوە • چل سوارو چل پیادەیان ئەبێ • ئەمانەش عەلاوەجاتی رۆغزادی‌و تەرخانین • گەورەیان خەلیفە حەسەن‌و مەحموودیاسینە •

هاروونیی : ئەمانیش ئەبن بە چوار فیرقە : کۆمەڵی سەلیم • کۆمەڵی نەدرشەیی • کۆمەڵی قارەمانی‌و خولامی •

کۆمەڵی هاروونیی : ئەمانە بە عومووم سێصـەد مـاڵ گەڕیاویـان ئەبێ‌و ، سێصەدیش دانیشتوویان ئـەبێ • دانیشتوەکانیـان لە ناحیـەی سەنگاو لە مەحاڵی پێبازاو لە ناحیەی وارماوا لە تووەقوت‌و ، جەرداسنەو ، گولان‌و بێسەڵمێن‌و ، کانی‌بەردینەو ، قەلبەزەو ، لە دێهاتێ ، کە تابیعـی مەرکەزی قەزای هەڵەبجەن ، دوو دێیان هەیە کە ناوئەبرێن بە قارەمانی‌و خولامیی‌و ، لە ناحیەی خورماڵدا تەپەزێڕینەو ، قوڵخوردو ، قەدەفەریی‌و ، ریشێن • دانیشتوەکانیان لەم دێهاتانە دانیشتوون‌و ، عایـدی ئەوانـەو . گەڕیاوەکانیان جێی زوستانیان پێوازەو ، لەوێوە لە رێی دەربەندیخانـەوە ئەچنە شارەزوورو ، لە شـارەزوورەوە لە عەینی رێی شاتریـوە ئەچنـە پێنجوێن‌و ، لە پێنجوێنەوە لە رێی کاسەکەلەوە ئەچنە دەشتی میل‌و چەمـی چنارو ، لەوێوە ئەچنە گژی سانئەحمەدو هەزارمێرگ‌و تەیناڵ‌و ، ئەم طایفە کەوتوونە غەربی جەنووبی سنەوەو ، دوانزە سەعات لە سنـەوە دوورن • ئەم طایفە گەڕیاوو دانیشتویـان دووصـەدو پەنجـا سواریـان ئـەبێ‌و ، سێصەدو پەنجا پیادەی تفەنگـداریان هەیـەو ، ئـەم طایفـە زۆر ئـازاو مەزبووتن • ئەمما زۆر حەز لە پیاوخراپیی ئەکەن‌و ، شەرەفنامەش وەکـو واشکیی ناوی بردوون • ئەمـانە گـەورەیـان عـەلی‌محەمـەدئەمیـن‌و ، ئەحمـەدی‌حسەیـن‌و ، عەبـدولکـەریمی حاجـی‌و ، عەبـدولحەمیـدی حەمەئەمینەو ، هەم حەسەنی حاجی قـادرو حەمەطاماسـە • ئـەم طایفـە

پانگزە ساڵ لەمەوبەر گەڕیاویان زۆر بوو • چوارصەد سواریان زیاتر بوو • لە تەك عومومی مەریوانیا دوشمن بوونو ، نزیکی حەفتا هەشتا لەسیان لێ‌کوشتنو لەمانیش زۆر کوژراو ، بە واسیطەی ئەم دوشمنایەتیەوە زۆر تەرەقییان کرد لە ماینو تفەنگو فیشەك • ئیستەیش دوشمنن ئەمما شەڕ ناکەن •

طایفەی صەدانیی ئەبن بەسێ فیرقە : سەید مورادیی ، ناودیریی صەدانیی • ئەمانە چوارصەد ماڵ ئەبن • گەڕیاویان زۆر کەمە • بە زەحمەت حەفتا ماڵ بێ[11] •دانیشتوویان زۆرترە • قیسمێ لە ناحیەی قۆرەتووانو ، باقی تریان لە ناحیەی خورمالا لە شیرەمەڕو ، گێلەكو ، شێخ‌مووساو ، ولۆسێنانو ، چەقەلاوا دانیشتوون • گەورەی ئەمانە خوسرەوی‌مچەو ، عەبدوللای رۆستەمی حەسەنە • گەڕیاوەکانیان لە رێگەی شاتریوە ئەچنە شارەزوور ، وە لە عەینی رێگەوە ئەچنە پێنجوێنو ، لەوێوە ئەچنە خاکی ئێران ، لە فەرهاداواو توودارو دووەیسە دائەنیشن ، ئەمانە لە سنەوە چوار سەعات دوورن • ئیستە زۆر بلاون ، ئەمما بەشی زۆری دانیشتوویان لە ناحیەی خورمالان • بە عوموم ئەم طایفە حەفتا سوارو صەد پیادەی تفەنگداریان ئەبێ • لە وەقتی خۆیدا طایفەیەکی گەورە بوون ، بە واسیطەی ئەمەوە کە گەڕیاویان کەم بوە ئیستە بچووك بوونەتەوە • وەکوو لەمەوبەر نەماون •

کەماڵەیی : ئەم طایفە ئەبێ بە چوار فیرقە : شیروانیی ، سووسکیی ، کەچەڵیی ، مەحموودخانە • ئەم طایفە دووصەد ماڵ گەڕیاویان هەیە ، وە صەد ماڵ دانیشتوویان هەیە • سی ماڵیان لە ناحیەی شێروانە لە گۆبان وە قەرەچیلو دوومیلان هەیە • باقیی تر لە قلرخو دێی خەرجانەو جۆلانن لە ناحیەی خورماڵو تانجەرۆدان • گەڕیاوەکانیان لە رێگەی داری خلەزە

---

(11) لێرەدا (دەبن)ێك لەبیرکراوە .

ئەچنە ناحیەی سەنگاوو ، لە کەلی پەیکولیوە ئەچنە قەرەداغو ، لە ریگەی سوورەوە ئەچنە شارەروور لە طەرەفی بیستانسوور لە ناحیەی تانجەرۆ ئەبنو ، لە ریگەی محەمەدئەلیوەیسیوە ئەچنە بەرزنجەو ، لە تاریدەرەوە ئەچنە ناحیەی پینجوینو ، لەویوە ئەچنە خاکی ئیران کەژی کەوتەرەش • وە لە بەینی بانەو سەقزدا دائەنیشن • ئەم طایفە بە عوموم سەد سوارو سەد تفەنگداریان هەیە ، زۆر ئازاو مەزبووتن لە ناو جافدا ئەدەبیان لی ئەکەن ، ئەمما زۆر وەحشین ، وەکوو سیصەد ساڵ لەمەوبەر وان ، ، ئەتوانم بنووسم لەم گۆڕیانەدا کە حوکوومەتی تورك رۆییو ،ئینگلیس هاتو ، حوکوومەتی عێراق تەشکیل کرا کەمتر خەبەریان بێو ، هەر تەکلیفێکی حوکوومەتی کە بێتە سەریان ئەیدەن بە دەست کوێخاکانەوە • هەروا ئەزانن خەرجو پیتاکی زەمانی رەئیسی جاف محەمەدپاشایە ! ئەمما لە خوصووصی نوێژو رۆژوو و ئەمانەوە زۆر قایمنو خەرافاتیان زۆرە • گەورەی ئەمانە سەمینی شاوەیسو ، فەتاحی مەحموودو ، مەحموودیئەمینو ، مەحموودیحەمەیعیسایە •

بەداخیی : ئەم طایفە دووصەد ماڵ ئەبن • گەڕیاویان ئەمڕۆ پەنجا ماڵ ئەبێ • دانیشتوویان لە ناحیەی قۆرەتوو و هۆرێنو شێخان زۆرە • وە لە ناحیەی شێروانە لە باوەنوور بیست ماڵێکیان هەیە • وە لە ناحیەی خورماڵ لە قەرەتەپە هەم هەن • ئەمانە وەکوو صەدانیی لە گەڕیان کەوتوون ، کەمیان ئەگەڕێن • سی سوارو پەنجا پیادەی تفەنگداریان هەیە • گەڕیاوەکانیان لە ڕێی شاتریوە ئەچنە شارەزوورو ، لە عەینی رێگەی شاتریوە ئەچنە پێنجوێنو خاکی ئێرانو ، لە کانی تەمرخان لە بەردەمی کەژی تۆراختەپە دائەنیشنو ، جێی زوستانیان هەواسانو قەرەچەمو قەڵاتەپەو ئەلیپەکانە لە ناحیەی قۆرەتوو • بەحثی جێگەی زوستانی ئەوانو صەدانیی لە بەحثی جێگەی بەگزادەی جافدا مەعلووم ئەبێ •

گەورەی ئەم طایفە بەسەر گەڕیاوەکانیانەوە حەمەعەلی مرادخانە • دانیشتوەکانیان هەرکەس گەورەی دێی خۆیەتی •

عەمەلە : ئەم طایفە ئەبێ بە سێ کۆمەڵ • جامبازیی ، ئاخەوەیسیی ، هۆزی حەمە • ئەم سێ کۆمەلە سێصەدو پەنجا ماڵ ئەبن • گەڕیاویان زۆر کەمە • باقی تریان دانیشتوون • ئەم طایفە بە واسیطەی ئەمەوە کشتیان سوارەی تایبەتیی رەئیس‌و بەگزادەی جافن ، کە بەگزادەکان بەسەر ملکەوە دانیشتن ، تەرکی گەڕیانیان کرد ، حالی حازر لە دێی کەلار لای خۆم‌و براکانم شەصت ماڵیان زیاتر هەیەو ، لە دەککەوقولە ، کە داخلی قەزای خانەقین ، لای حاجی ئیبراهیم بەگ‌و باقی‌و ، لە کۆکس ، کە داخلی قەزای کفری‌یە ، لای ئەحمەدبەگ‌و عەلی‌بەگ‌و حەمەڕەشید بەگ پەنجا ماڵیان زیاد هەیەو ، بیست ماڵیان دووبارە لە ناحیەی شێروانە لە تازەدێ‌و قولەسوتاو لای خۆم هەیە • باقی تریان لە ملکی حەسەن‌بەگی عەلی‌بەگی مەحموودپاشاو باقیی بەگزادە لە قەزای هەڵەبجە بە بڵاویی دانیشتوون • گەڕیاوەکانیان حەفتا ماڵیان ئەبێ • بەسەر گەڕیاوەکانیانەوە حاجی محەمەدو حاجی قادری سلێمانە • ئەمما گەورەیان لە عەشیرەتی‌دا فەتاحی رۆستەم‌و ئەمینی‌محەمەدو ئەحمەدی محەمەدئەمینە • سوارەو پیادەی تفەنگداریان ئەمرۆ لە دانیشتوو گەڕیاویان صەدوپەنجا زیاتریان هەیەو ، ئەمانیش گەڕیاوەکانیان لە رێی شاتریوە ئەچنە شارەزوورو پێنجوێن‌و ئێران‌و ، لە کوڵ‌و دۆزەخدەرەو سێ‌پەلکان دائەنیشن •

عیسایی : ئەم طایفە صەد ماڵێ ئەبن • پانزە ساڵ لەمەوبەر عومووم دانیشتوون ، لە ناحیەی شێروانەدا لە ژالەو باوەنوورو مامیل‌و سەیدمەحموودو بیبەڕەشەو ، گەڕیاویان نیە مەگەر دە پانزە ماڵێ نەبێ لە ناو شاتری‌دا • گەورەی ئەمانە فەرەجی کوڕی عەلی ئەمیرخانە • سێ سوارێك‌و سێ پیادەییکی تفەنگداریان ئەبێ •

گەلاڵیی : طایەفەیەکی گەورەن لە ناو جافدا • ئەمانە ئەبن بە حەوت کۆمەڵ : حدرووەیسیی ، بورە ، پشدەریی ، کەرمەوەندیی ، سەرلەچ ، سێزدەئاغای ئەلاییی • ئەم طایفە بە عوموومی هەزارو دووصەد ماڵ ئەبێ • دانیشتوویان زۆر ئەمە ، رەنلە بە بلاویی لە ناحیەی شێروانەو زەنگئابادو ناحیەی وارماوا لە حاصڵو چاڵەی ئەیجەلیل صەدو پەنجا مالیان ببێ ، وە لە خاکی ئێران لە مەحالی خوڕخوڕەدا پەنجا ماڵێکیان ئەبێ • باقیی تریان گەڕیاونو ، ئەمانە لە رێگەی سیدارەو داریحلەوە ئەچنە ناحیەی سەنگاوو لەوێوە بە ملەی پەیکوڵیدا داخلی ناحیەی وارماوا ئەبنو لە رێگەی شاتریوە ئەچنە پێنجوێننو ، لەوێوە بەسەر ریی رۆغزادیو تەرخانیدا داخلی خاکی ئێران ئەبن • جێی هاوینی ئەمانە لە مەحاڵی خوڕخوڕەو سوورمووسا دوورەقەلا گاوەکەچ ، و لە مەحاڵی دیواندەرە کەلی هەواس بەکو ، هۆبە توو و ، کەلەکانو [جیران مینکایە]ئەم طایفە چوارصەد سوارو پێنجصەد پیادەی تفەنگداریان بەزیادیوە ئەبێ • ئەمما زۆر دزن • بە عوموومیی ئەم طایفە خوویان دزییەو ، دزیی ئەمانە لە ناو عوموومی عالەمی کوردو عەرەبدا مەشهوورە • عادەتەن بوە بەخووی سەریان • دە دوانزەیێ لە ئاغاکانیان وەکو کوڕانی عەباسئاغاو شەریفیفەتاحئاغا نەبێ لەم خوە بێ بەشن ، باقیی تر گەورەو بچووك بەشدارن ، عادەتەن وەکوو دەرسو تەحصیل وەریئەگرنو ، عوموومی جاف ، بەگەڕیاوو دانیشتوویانەوە ، بە دەستیانەوە هەراسان بوونو جەردەییش زۆر ئەکەن •

لەمەوبەر خۆم فکرم دێ لە ئێران سواریان بە صەد سوار تاکو زەنگانو طەرەفی تەبرێز ئەرۆیینو کاروانیان ئەهاورد • گەورەی ئەم طایفە ئاغاکانەو بە سەر فیرقەی پشدەریو کەریمقوبادەو ، ئاغای مەعلوومیان محەمەد ئاغاو شەریفئاغاو تەوفیقئاغاو مصطەفائاغاو محەمەد داودی مەحموود ئاغایە •

نەورۆڵیی : ئەمانەیش طایفەیەکی گەورەن لە ناو جافدا ، بە سێ کۆمەڵ ناو ئەبرێن : کۆمەڵی پارچە • ساتیاریی ، بەشیحەمە • کشتیان هەزار ماڵ ئەبن • ئەمانە سی ساڵ لەمەوبەر عومووومیان گەڕیاو بوون ، لە ڕێگەی شاتریوە ئەچوونە کوێستان لە کەژی سانئەحمەد دائەنیشتن و زوستان لەم جیگەی خۆیانەدا ئەمانەوە • بنەڕانیان ئەهات بۆ گەرمیان بەشێکی بۆ قەزای کفریی وە بەشێکی تری لە کەوزەینالیی لە ناحیەی هۆرێن و شێخان ئەبوون • ئەمما ئیستە بە واسیطەی ئەمەوە جێگاکانیان ئەنهاری زۆرەو ئاودارەو تووتنی زۆریشیان ئەکردو ئەیکەن ، قانزاجی زەراعەتیان لە قانزاجی بزن و مەڕو حەیوان بەچاکتر زانی ، بە عومووم تەرکی گەڕیانیان کرد لە مەحالی گوندەو سەراوو پریس و بەرجۆگەی دەڵێن و دێهاتی ئەطرافی هەڵەبجە وەکوو حەسەنئاواو بامۆک و بەکراواو تریفە دانیشتوون •

جێگەی نەورۆڵیی دێهاتێکە کە تابیعی مەرکەزی قەزای هەڵەبجەیە • ئەم طایفە بە عومووم سێصەد سوارو حەوتصەد پیادەی تفەنگداریان ئەبێ ، گەورەی عومووومیان بەسەر هەموویانا عەبدوڵڵای محەمەدخواکەرەم و ، عەلی محەمەدمارف و ، قادری نادر ئەولحەمەدمحەمەدو ئەحمەدی ذولفەقارو خەلیفە محەمەدئەمین و ، حاجیمیرئەحمەدە •

یەزدانبەخشیی : ئەوانیش طایفەیەکی گەورەن لە ناو جافداو ، ئەبن بە سێ کۆمەڵ ، کۆمەڵی خاڵە ، کۆمەڵی بەگزادە ، کۆمەڵی مامەشەیی • بەشی خاڵە ناو ئەبرێن بە یەزدانبەخشیی • بە عومووم ئەم سێ کۆمەڵە حەوتصەد ماڵ ئەبن ، ئەمانیش ، وەکوو نەورۆڵیی سیساڵ لەمەوبەر گەڕیاوبوون ، ئیستە عومووم دانیشتوون ، فەلاحەت و زەراعەت ئەکەن لە شەمێران کە موڵکی حەسەن بەگی عەلی بەگی مەحموودپاشایەو ، کەوتۆتە جەنووبی قەزای ئەڵەبجەوە ، گەورەی عومووومیان محەمەدی سانئەحمەدو ،

ئەحمەدی حسەین‌و ، تۆفیقی فەرەج‌و ، ئەحمەدی سان‌ئەحمەدو ، مەحموودی حەمەی چراغەو ، جێگەیەکی زۆر باش‌و قایم‌و هەوا خۆشیان هەیەو ، کەژی زمناکۆیان بەدەستەوەیە ، کە جێگەیەکی زۆر سەخت‌و موهیممە • ئەمانە بە عومووم چوارصەد پیادەو صەد سواریان ئەبێ دایمە گەورەکانی جاف وەکو محەمەد پاشاو ، قادربەگ‌و سلێمان‌بەگ کوڕانی کەیخوسرەو بەگ ئەم طایفەیان بۆ ئیسنادگای خۆیان لە حوودوودی ئێران‌و بابانا دایان‌ناون •

وەلی‌و ، نەژوێنی : ئەم دوو طایفەیە صەد ماڵ ئەبن ، لە ناو شاتری‌دا وەکوو شاتریی حسێب ئەکرێن •

مەسۆدیی : ئەوانیش تابیعی رۆغزادیی‌و تەرخانین ، صەد ماڵێ ئەبن • حەفتا ماڵیان لە ناحیەی سەنگاو دانیشتوون ، گەڕیاوەکانیان هان لە ناو رۆغزادیی‌و تەرخانییا •

شێخ‌سمایلیی : طایفەیەکی زۆرن ، ئەوانەیان هان لە ناو جافدا ئەبن بە دوو کۆمەڵ • کۆمەڵێکیان پێیان ئەڵێن : شێخ سمایلی‌سوورەجۆو ، کۆمەڵێکیان پێیان ئەڵێن : شێخ سمایلی‌بنەجووت • هەردوو کۆمەڵەکە پێنجصەد ماڵ ئەبن • سێصەد ماڵیان کە تاقمی فەقێ ئەولایە وان لە سوورەجۆو ، دووصەد ماڵیان وان لە گرێزەو بنگردو سەراوو قالیجۆو موان‌و بنەجووت‌و بالان تەران • لە ناحیەی خورمالا دانیشتوون • مەڕو بزن‌و رەشەولاخیان زۆرزۆرە • فەلاحەتێکی زۆر چاك ئەکەن • بۆ گەنم‌و جۆو نۆك‌و نیسك‌و • تاقمی فەقێ ئەولا هان لە سوورەجۆ کە مولکی حسەین بەگی مەحموود پاشایە • ئەم دوو کۆمەڵە هاوینیان لەگەڵ جافدایە، یەعنی بە رێگەی رۆغزادیی‌و تەرخانیدا ئەچنە کەژی هەواس‌بەگ‌و هۆبەتوو • زوستانان لە باتی دەوار لە خانوودا دائەنیشن • بە هەردوولایان تەخمینەن صەدو پەنجا سوارو دووصەدو ، بەڵکە سێصەد ، پیادەی

تفەنگداریان ئەبێ • ئەم طایفەیە بەشی زۆریان هەزارو سێصەد ماڵ ئەبن هان لە ئێرانا • هاوین ئەچنە بەینی هەمەدانو قۆریەو زوستان بەعزێ سالی تێن بۆ دەوری سەرقەڵاو جێگیران ، کە لە موضافاتی قەسری شیرینە •

تاوگۆزیی : دوو طایفەن : طایفەکیان وان لە جوانڕۆو ، لازمە نە تەك جافی ئێرانا بنووسرێ • ئەم طایفەکەیان وان لە پشتقەڵای شەمێران • ئەمانە مولحەقاتی جافی مورادیی – کە عەشیرەتی ئێمەن – دووصەد ماڵ ئەبنو ، عوموومیان ئیددیعای سیادەت ئەکەن • هەموویان دانیشتوون • شاعیری مەشهووری کورد کە جەنابی مەولەویە گەورەی ئەم طایفەیە • صەد پیادەیەکی تفەنگدارو ، دە دوانزە سوارێکیان هەیە ، هان لە مولکی حەسەن بەگی عەلی بەگی مەحموود پاشادا • ئەمڕۆ گەورەیان سەیید محەمەدی سەیید عەبدوڵڵای مەولەوی یەو ، سەیید کاك ئەحمەدو سەیید مەحموودی کوڕی سەیید عەلی مەولەوی یەو ، شاعیری فاضیل جەنابی مەولەوی ئەگەر تەعریفی ئەو بنووسم لەم کتێبە جێی نابێتەوە • تەصنیفی ئەو لە عیلمی کەلامو لە عەقایدا بە زبانی عەرەبیو کوردیو فارسیی زۆرە •

میراولی : پەنجا ماڵ ئەبن هان لە قەزای هەڵەبجەو گەرمیاو نین • لە ئەطرافی نەورۆلیی پارچەدا دائەنیشن •

پشتماڵە : ئەمانە سێ تاقم بوون : پشتماڵەی حەمە پاشا ، کە بەگزادەی کەیخوسرەوبەگی یەو ، پشتماڵەی عەبدوڵڵاپاشا ، کە بەگزادەی بەهرامبەگی یەو • پشتماڵەی قادربەگی ڕۆستەمبەگی وەڵەدبەگ ، کە بەگزادەی وەڵەدبەگی یە • پشتماڵەی محەمەدپاشا سێصەد ماڵ ئەبوو ، خۆشم لە فکرم دێ کە سێصەد ماڵ بوەو ، سێصەد سواری تێدا بوە • ئەمانە گشتیان خزمەتکار بوون ، ماینو تفەنگیانو ئیدارەیان لەسەر بەگزادە بوە • مەڕو بزنیان نەبوە ، بۆ گەڕیانیان گاو ئێستریان بوە ، هەچی

مەصاریفاتیان بوە لەسەر بەگزادە بوە • وەکو عەسکەر بەخێوکراون بۆ ئیدارەی جافو ئەملاك •

پشتمالەی بەهرام بەگ ، صەدو پەنجا ماڵ ئەبوون ، عەینەن ئەوانیش بۆ بەگزادەکانیان وەضعیەتیان وەکو پشتمالەی محەمەدپاشا وابوونو پشتمالەی قادربەگی رۆستەمبەگ صەد ماڵ ئەبوون ، ئەوانیش وەکو دوو پشتمالەکەی تر وەکوو عەسکەر بۆ ئیدارەی جافو ئەملاك راگیراون• ئەمانە لە وەقتی خۆیا گەڕیاو بوون • لەو وەقتەوە کە بەگزادەکان دانیشتوون ئەوانیش بە خزمەتکاریی بەگزادەکان دانیشتوون •

سمایلعوزێریی : هەشتصەد ماڵ ئەبن • ئەمانە ئەبن بە چوار فیرقە : گۆمەیی ، قەرەوەیسیی ، میرئالایی ، سمایلعوزێریی ، ئەمانە گەڕیاونو لە رێگەی میکایەلیوە ئەچنە نەکەرۆزو ، کەلیخانو ، پیرهۆمەران ، لە بەینی بانەو سەقزدا دائەنیشنو جێی زوستانەیان بەعزێ ساڵ لە ناو میکایەلیدا دائەنیشنو • ئەمما جێی دایمییان ها لە بەینی سلێمانیو چەمچەماڵو سوورطاشا • ئەمانە سێصەد سوارو سێصەد پیادەی تفەنگداریان ئەبیو ، طایفەیەکی زۆر ئازاو بەغیرەتن • ئەمما صەد ساڵ لەمەوبەر لە جاف جیابوونەتەوەو ، ناو ئەبرێن بە ئێلیغەوارەو ، تەکالیفیان لەگەڵ جافدا نەبوە •

صۆفی وەند : ئەمانیش صەدماڵێ ئەبن ، پیاوی ئەولاپاشا بوون . ئەگەڕیان وەکوو جاف • ئیستە عومووميان دانیشتوون ، نزیکی شەصتماڵێکیان وان لە ناحیەی شێروانەو ، بیستماڵێکیان وان لە ناحیەی قەڵخانلوو ، بیست ماڵیان وان لە هووانە نزیکی سلێمانی •

بێسەرییو چووچانیی : ئەمانە چوارصەد ماڵ ئەبن وان لە ناحیەی سرۆچك لە دۆڵی گەلاڵ دانیشتوون بە زستانو ، لە هاوینا لە تەك جافدا ئەچن بۆ کوێستانی ئێران •

تیلەکۆ : صەدماڵێ ئەبن • پەنجا ماڵیان گەڕیاون وان لە ناو ڕۆغزادیی و تەرخانی‌داو ، ئەوی تری لە ناحیـەی شێروانـە دانیشتوون • ئـەم طایفـە هەشتصەد ماڵیان وان لە ئێران لە مەحالی خوڕخوڕەو باشماخا دائەنیشن •

## فەصڵی سێیەم

بەیانی طایفەکانی جاف لـە جوانڕۆ کـە داخڵی ئەیالـەتی سنەیـەو ، ئەوانەیان کە هان لە ئەیالەتی کرماشانا :

قوبادیی : هەشتصەد ماڵ ئـەبـن وان لـە جـوانڕۆدا گەڕیـاون‌و ، دانیشتوویشیان هەیە لە جوانڕۆو مەحاڵی خۆیانا • بە هاوین ئەچنە کـەژی شاهۆو بەنی‌گەز • ئەمانە ئێلی حەبیبوڵلاّخانن ، سێصـەد سوارو سێصـەد پیادەی تفەنگداریان ئەبێ •

باوەجانیی : ئەمانەش هەزارو پێنجصەد ماڵ ئەبن ، بە هاوین ئەچنـە بەنی‌گەزو شاهۆ لە تەك قوبادی‌دا ئەچنە چـەمی خاناشـوورو [ لوشـە ] ئەمانەش پێنجصەد سوارو پێنجصەد پیادەی تفەنگداریان ئەبێ ، ئەمانە بـە عومومیی رەعیەتی حەبیبوڵلاّخانن •

ئیمامی‌و یەناخیی : ئەوانیش پێنجصەد ماڵ ئەبن • ئەم طایفەش ئێلی حەبیبوڵلاّخانن‌و ئەمانیش بە هاوین ئەچنە بەنی‌گەزو شاهۆو زوستانان دێنە پشتی کەژی شنروێ بە رووی ئێرانا تا سەرچەمی سیروان دائەنیشن •

قادرمیروەیسیی‌و تایشەیی : ئەم دوو طایفەشە جافن‌و داخڵی ئەیالەتی کرماشانن • زوستان لە سەرقەڵاّو جێگیران تا ژووری فۆرەتوو دائەنیشن‌و ، بە هاوین ئەچنە دالاّهۆ • ئەم دوو طایفە هەشتصەد مـاڵ ئەبن بەگەڕیـاوو دانیشتوویان • گەورەی طایشەیی ئەلی سولطانە ، هەردوو لایان سێصـەد سوارو ، سێصەد پیادەی تفەنگداریان ئەبێ‌و ، گەورەی قادرمیروەیسیـی مستەفای مەحموودنەظەرە •

کۆیكو ، نێرژیی : ئەمانیش داخڵی ئەیالەتی کرماشانن ، بە زوستان لە زەهاو دائەنیشن‌و ، بە هاوین ئەچنە دالاهۆ • گەورەی ئەمانە رەزاخانی کوڕی یارەویس‌سولطانەو ، ئەمانە دووصەد سوارو دووصەد پیادەی تفەنگداریان ئەبێ‌و ، هاروونیی لە تەك ئەم دوو طایفەدا یەك رەگن ، لەیەك جیابوونەتەوە •

دەروێشیی‌و ، وەڵەدبەگیی‌و ، دەلەژێریی : ئەم سێ طایفەیە وەڵەدبەگییان پێ‌ئەڵێن ، هەرسێ طایفەکەیان شەشصەد ماڵ ئەبن • گەورەی ئەمانە بەهرام بەگی کوڕی فەتاح‌بەگی سەعید بەگە • ئەمانیش داخڵی ئەیالەتی سنەن • بە هاوین ئەچنە بەنی‌گەزو کرێوەو دەوڵەت‌ئاواو ، زوستان دێنە سەرقەڵاو جێگیرانو ، طەرەفی شەواڵدڕەو ، کەلی تیلەکۆ • دووصەد سوارو دووصەد پیادەی تفەنگداریان ئەبێ‌و زۆر ئازاشن •

کۆکۆیی‌و زەردۆیی : ئەم دوو طایفە وان لە جوانڕۆ ، سێصەد ماڵ ئەبن • پیاوی وەکیلی جوانڕۆ عەبدولغەفووربەگن‌و بە هاوین ئەچنە شاهۆو ، پەنجا ماڵیشیان وان لە قەزای هەڵەبجەو ، زەردۆییش محەللەیەکیان لە کرماشان هەیە •

عەلی‌ئاخەیی‌و پەپلیی : ئەم دوو طایفەیە دووصەد ماڵێ ئەبن ، عەلاوەجاتی وەڵەدبەگی‌و طایشەیی‌و قادرمیروەیسین •

تاوگۆزیی ئێران : پێنجصەد ماڵ ئەبن ، ئەمانیشە ئێلی حەبیبوڵلاخانی جوانڕۆن ، بە هاوین ئەچنە بەنی‌گەزو کرێوەو ، شاهۆ ، دووصەد سوارو دووصەد پیادەی تفەنگداریان ئەبێ • عومووميان پیاوی حەبیبوڵلاخانی جوانڕۆن ، لە تەك تاوگۆزیی خاکی عێراقا یەکێکن‌و ، زوستانیش دێنە نزیك پشت‌قەڵای شەمێرانو گومەو پشتە •

دڕۆیی : سێصەد ماڵ ئەبن‌و ، ئەمانیش بە هاوین ئەچنە شاهۆ ، گەڕیاون دانیشتوویشیان هەیە ، گەورەیان فەرەجی فەتاحە ، کە مەشهوورە

به فەرەچوڵڵاخان • صەد سوارو دووصەد پیادەی تفەنگداریان ئەبێ ، زۆر ئازاشن •

کوێرەکیی : صەدماڵێ ئەبن لە ناحیەی هۆرێن‌و شێخان دائەنیشن‌و ، لە بەر ئەمە لە پێش تەحدیدی حـودوودا داخلـی ئێران بـوە ، لە تـەنك جافی‌ئێرانا بەحشم‌کردن‌و ئەمانە گەڕیاو نین ، ئیستە داخڵی خاکی عێراقن •

حەبیبوڵڵاخان کە رەئیسی قوبادیی‌و ، باوەجانیی‌و ، تاوگـۆزیی‌و ، ئیمامیی‌و ، ئێناخیی بوە (٣٤)سی‌وچوار کوڕی بوە ، عومووميـان سـوار بوون ، نزیکی دە کوڕیان صاحێب پشتماڵەو بەشیان لە ئێلا بوە • سیانیان لە گشتیـان قابیلتـر بوون ، مصطفەفاخـان ، محەمەدبـەگ ، کـە لەقـەبی ئەمیر ئەسعەدە ، محەمەد تەقی‌بەگ • حەبیبوڵڵاخان بیست‌و پێنج سـاڵ لەمەوبەر مردوە • کوڕی گەورەی کە مصطفەفاخان بوە جێداری بوە ، زۆر تەرەقی کردو عومووەمی جوانڕۆی کەوتە ژێردەست‌و ، هەرچە جافـی جوانڕۆ بوو تەکلیفـی ئێلیـی‌و عـەشیرەتییان وەکـو طایفەکـانی خـۆیان ئەیاندایەو ، ئەو دێهاتانەی کە ئێستە وان بە دەسـت کـوڕانی جەعفـەر سوڵطانی حاکمی هەورامانی لهۆنەوە گشتی بەدەست مصطفەفاخانەوە بوون تاکو پانزە ساڵ لەمەوبەر • ئیقتیداری گەیشتە ئەدەرەجەیێك عەشرەتـی هەمەوەند ، کە حوکوومەتی تورکیـان تەضییق‌کـردبوو بە خراپەکـردن‌و جەردەیی ، حوکوومەتی تورك لە پاش ئینقیلابی سلانیك‌و مەشرووطییەت دوو ساڵ خەریکی تەدبیر بوو بۆ تەربییەی هەمەوەند ، میقدارێکـی زۆر عەسکەری پیادەو سوارە لە ژێر قوماندەی مەظهـەربەگـی میرئـالآداو عومووەمی عەشایرەکـانی لیوای کەرکـووك‌و لەشکـری جاف سەوقـی چەمچەماڵیان کرد • هەمەوەندەکان عومووەمی فیرقەکانیان لە چەمچەماڵ‌و بازیان دەرچوون‌و ، چوون بۆ جوانڕۆ لای مصطفەفاخـان ، ئـەویش بـە

بەگزادەو گەورەکانی هەمەوەندی وت : ئەگەر عوموم لای من دائەنیشن عوموومتان ئیدارە ئەدەم • ئەم هەزارو دووصەد سوارە بە تەواویی بوون بە تەبەعەی مصطەفاخان • لە عەینی وەقتدا عەلیئەکبەرخانی کوڕی شێرخانی کوڕی ئەسەدخانی حاکمی سنجاویی لە تەك سەردار موظەفەری حاکمی کەڵهوڕ ، کە داودخانە ، بەشەڕهاتن ، عەلیئەکبەرخان هاواری ناردە لای مصطەفاخان ، مصطەفاخانیش پەنای دا ، داودخان بە عوموومی سوارەی کەڵهوڕو هەمەوەندو بێتووییوە ، وە طەلەبی ئیمدادیشی لە والیی کوردستان کردبو ، ئەویش میقداریٚ لەشکری بۆ ئەنێریٚ ، عەلیئەکبەرخان کە ئەم هەشت نۆ هەزار سوارە دێت بۆ سەری خەبەر ئەدا بە مصطەفاخان • لە بێ بەختیی مصطەفا خان لەو رۆژەدا هەمەوەندەکان بەچوار تاقم بۆ دەوری کەرکووكو سلێمانیو چەمچەماڵ ئەڕۆن بۆ جەردەیی • صەد سوارێکیان لای مصطەفاخان ئەبێ •

مصطەفاخان ، لەشکری خۆیو هەمەوەند ، هەزارسواریٚ ئەبا بۆ یاریەدانی عەلیئەکبەرخان، ئەبێ بەشەڕیان، لەشکری داودخان ئەشکێنن • مصطەفاخان لە وەقتی شەڕدا لەسەر ماین ئەکەویٚ ملی ئەشکێ ، رەحیمی کاكئەوڵای عەزیزی خاڵەی هەمەوەندو زۆراو رانك هەمەوەند ئەکوژرێن • کە دوو پیاوی زۆر ئازاو گەورە بوون لە ناو هەمەوەندا •

لەشکری داودخان کە ئەزانن مصطەفاخان نەماوە ئەگەڕێنەوە دووبارە ئەبێ بەشەڕیان ، صەد کەس لە لەشکری داودخان ئەکوژریٚ •

بەفارسی ئەڵێن : صەدسەر بە توربەییو یەك سەر بە توربەیێ ! حسابی مصطەفاخانیش هەروەهایە • گومکردنی پیاوێکی وەکوو

مصطفاخان قووەتی مەعنەویی بۆ لەشکری جوانڕۆ نایێلێت ، هەردوو لەشکرەکە ئەگەڕێنەوە وە لەیەك جوێ ئەبنەوە •

لە دوای مصطفاخان گەورەیی عەشیرەتەکانیان کەوتە دەست محەمەدبەگ ، ئەو بە عەکسی مصطفاخانی برای فیتنەیی خستە ناو براکانی، وە پانزە برای لە ناو خۆیانا یەکتریان کوشت و ، محەمەدتەقی بەگی برای ، کە بۆ ئەوە ئەشیا ناوی بچێتە ناو لاپەڕەی تەئریخەوە ، بە دەستی خۆی ، بە تەحریکی سەردار رەشیدی حاکمی رەوانسەر کوشتی و ! لە تەك محەمەدصالح بەگی کوڕی مصطفا خانا ،کە ئەویش وەکوو باوکی پیاوێکی زۆر چاك بوو ، کردی بە شەڕ دوو برای محەمەدصالح بەگی بە ناحەق کوشت ! ئەمما بەسەر محەمەدصالح بەگا موەفەق نەبوو • محەمەدصالح بەگ ئێلی قوبادیی برد بۆ خۆی تاکو حەوت ساڵ لەمەوبەر بەدەستیوە بوو • محەمەدصالح بەگ مرد ئەحمەدبەگی برای زۆر پەلەپەلی کرد موقابەلەی محەمەدبەگ بکا نەیتوانی • محەمەدبەگ خۆی و کوڕەکەی ها بەسەر قوبادیی تاوگۆزیی و باقی دێهات و عەشیرەتەکەیەوە •

## فەصڵی چوارەم

ئەم عەشیرەتی جافە کە هان لە عێراقدا بۆچی پێیان ئەڵێن جافی مورادیی ؟ ئەمانە لە پێش ظاهیربەگدا لە زەمانی سەلطەنەتی صەفەوی یەکا ناو خەلافەتی سولطان مورادخانی رابیعدا هاتوونە کوردستانی بابان • موددەتێ لە خاکی بابان و شارەزووردا ئەمێننەوە و ،تیکرار ئەچنەوە بۆ جوانڕۆ و جێگەی خۆیان ، گەلاڵیی ، ئەمێننەوە لە شارەزوور ناگەڕێنەوە • جافەکانی جوانڕۆ و ئەیالەتی کرماشان بەمان ئەڵێن : جافی مورادیی • تیکرار لە پاش موددەیێکی زۆر کە تەصادوفی زەمانی ظاهیربەگ و طاهیربەگ ئەکا ، کە

ئەولادی یارئەحمەدبەگی کوڕی سەیفوڵلابەگی کوڕی سەیدئەحمەدبەگی رەئیسی ئێلی جافن • ظاهیربەگ‌و طاهیربەگ لە جوانڕۆ ، کە جاف زۆر ئەبن‌و زیادی نوفووسیان ئەبێ ، ظاهیربەگ بەخۆی‌و چوارصەد ماڵ لە تەك خانەبەگدا ، کە باوکی گەورەی بەگزادەی وەلەدبەگی‌یە . دێنە بانی‌خێلان •

لە تەئریخی هەزارو صەدو پەنجای هیجریداو هاتنی ئەوەلی جاف لە زەمانی سوڵطان‌موڕادی رابیعدا لە تەئریخی هەزارو چل‌و پێنجی هیجریدا بوە ، ئەمانە لە بانی‌خێلان ئەمێنن کە مەوقیعێکە لە لێواری سیرواندا لە بەینی ئەڵەبجەو پێبازدایەو ئەمڕۆ داخلی ناحیەی وارماوایەو ، لەوێ ئەمێننەوە •

شارەزوور کەلالیی‌و مەنمیی‌و کەلباغیی‌و کەلهوڕو تیلەکۆو بلباسی تێدا ئەبێ • نزیکی هەشت نۆ هەزار ماڵ زیاتر ئەبن ، وەکوو جاف ئیستە ئەچنە کوێستانی ئێران • ئەمانە ناتوانن بچنە ناویان لەوەڕخۆریی بکەن ، بەم وەضعییەتە هەشت نۆ ساڵ ئەمێنن ، ئەمما کەم‌کەم لە جافی جوانڕۆ دە ماڵ‌و پانزە ماڵ بۆیان دێ ئەبن بە هەزار ماڵ ، لەو وەقتەدا چل کەس جەردە لە حاکمی قەلاچوالان ، کە حاکمی بەبەیی ، یاخیی ئەبن ، حاکمی قەلاچوالان زۆر مەطلەب ئەبێ لە لای گرتن یا کوشتنی ئەم جەردانەو ، جەردەکانیش دێن بۆ دەوری دزیاش‌و بانی‌خێلان • لە طەرەفی حوکمداری بابانەوە مەئموور دێنە ئەسەر ظاهیربەگ : ئەبێ یا ئەم جەردانەم بۆ بگری یا بکوژی وە یا نایەڵم لە خاکما دانیشی ، ظاهیربەگیش ئەڵێ بە تاقمی خۆی : ئەمڕۆ لە خاکی بابانا زۆر کەمین لازمە خزمەتێ بە حوکمداری بەبە بکەین کە لێمان مەمنوون بێ ، ئەوانیش ئەچن بۆ شوێنی ئەو جەردانە ، لای دەربەندیخانا تووشیان ئەبن ، ئەبێ بەشەڕیان هەر چل جەردەکە ئەکوژن‌و سەرەکانیان ئەبەن بۆ حاکمی بەبە ! حاکمی بەبەش لە موکافاتی

ئەمەدا بانی خیلانو نۆ دێی دزیایشیان ئەداتێ بۆ خۆیان • لە پاش ئەمە چاو ئەکەنەوەو ئەچنە قەلاچوالانو ، ئەم دێهاتانە بەدەستیانەوە ئەبێو ، حاکمی بەبە زۆر حورمەتیان ئەگرێو ، لە جافی جوانرۆ مالی تریشیان بۆ دێ لەو دێهاتانەدا دایانئەنێن • دانیشتووی ئەو دێیانە لەو جافانەن کە لە زەمانی ظاهیربەگا هاتوونو ، زۆریان لە عەشرەتی شاترین •

بەو دەلیلە کە دانیشتووی ئەو دێیانە گشتی شاتری‌یەو شاتریش لەتەك ظاهیربەگدا لەو وەقتەدا زیاتر هاتوونەتە ئەمبەرەوە • لە زەمانی ظاهیربەگدا کەمێ قوەت ئەگرنو ، زۆر ئەبن، ئەمما ناتوانن لەبەر ئەو عەشیرەتانەی کە لە شارەزووردا بوون بچن بۆ کوێستانی ئێران • لەو زەمانەدا تاکو نانپارێزو تاری‌دەرو مەحالی سرۆچك هاوینان ئەڕۆیشتن • لە تەئریخی هەزارو صەدو شەصتو پێنجی هیجریدا ظاهیر بەگ بەڕەحمەت ئەچێو ، قەبری ها لە فەقێجنە ، کە یەکێکە لەو دێهاتانەی کە حاکمی بەبە دای بە ظاهیربەگو گومەزەکەشی ئیستە ماوە •

برای بچووکی ظاهیر بەگ ، کە طاهیربەگە ، وەقتێ کە لە تەك ظاهیر بەگدا دێنە بانیخێلانو خاکی بابان لە پاش دوو سال خۆی‌و عایلەیی‌و چەند کەسێکی تر لە ئەقاریبی ئەچنە شامو ، ئیستە لە محەللەی (صالحیە)ی شامدا ئەولادیان ماوەو ، هەموو وەقتێ کاغەذیان بۆ لای عوموومی بەگزادەکانی جاف نووسیوەو ، بۆ لای خۆشم هاتوە • سالی هەزارو سێصەدو چلو نۆ لە نیساندا عیزەدینبەگ ، بۆ صیلەی رەحم ، لە شامەوە هات بۆ لامان •

## فەصلی پێنجەم

بەحثی کوڕەکانی ظاهیربەگ کە لە پاش خۆی ماونەوە :

قادربەگو سلێمانبەگ ، هەردوانیان کوڕی ظاهیربەگن • سلێمان بەگیان برای گەورە بوە • قادربەگ کە برابچووکە پیاوێکی زۆر ئازاو

سەربەدەرەوە بوەو ، تەبیعەتی زور گەرم بوە • وەقتێ کە طاهیربەگ
ئەمرێ و جافەکانی ئەطراتیان ئەبێ بە هەزار مالر ، ئەبن بە صاحیبی سوارەو
تفەنگێکی زۆر لەم ـ لەم خەیاتی لویستانو چوونی ئێران ئەکەوینە
سەریان •• بە شوێنی ئیلی کەلالییو کەلباغییو کەهورو باقیی تردا تا
طەرەفی حودوودی ئێران ئەڕۆن • ئەمما ناتوانن بچنە ناو ئەو عەشایرانەوە •
رۆژێ لە وەقتی کۆچدا یەکێ لە بەگزادەی وەلەدبەگیی
خالیدبەگ ناوێکیان سەگێکی ئەکەوێتە ناو کۆچی کەلالییو ، سەگەکەی
ناوی شێرە ئەبێو ، لەو وەختەدا رەئیسی کەلالیی شێراغا ئەبێ • خالیدبەگ
بێغەرەض ، سەگەکەی خۆی بانگ ئەکا ، هەرچی لە کەلالیی وایە ئەم
پیاوە بە سووکیی ناوی رەئیسەکەیان ئەبا ، بە دەفعەیێ دووصەد سێصەد
کەس پەلاماری ئەدەنێ کلکی ئەسپەکەی ئەبڕنو ، نەختێکیشی لێ ئەدەن !
خالیدبەگ دێتەوە بەو نەوعە کە بەسەریا هاتوە ئەیگێڕێتەوە • قادربەگو
سلێمان بەگ ، کە رەئیسی ئەو هەزار ماڵە جافە ئەبن ، زۆر عاجز ئەبنو
غیرەتی عەشیرەتیی ئەیانگرێ قادربەگ لەشکر ئەکات ، نزیکی هەشتصەد
نۆصەد سوارو پیادەیێ گردئەبێ بۆی • سلێمانبەگی برای ئەڵێ بە
قادربەگ : ئەم عەشرەتانە زۆرنو نزیکی پێنجشەش هەزار سوارو
تفەنگچییان هەیە • ئێمە بەرو دوا ناگەینە هەزار کەس • رجا ئەکەم نە
خۆمانو نە عەشرەتەکەمان بەقڕ بدەین ! بوێستە تاکو پایز ئەچینەوە
شارەزوور ، خەبەر ئەنێرین بۆ جافی جوانڕۆ لەشکرێکی زۆرمان بۆ بێ ،
ئەم حەقەیان لێ ئەسێنینو ، ئەم بێشەرەفییە لەسەر خۆمان لائەبەین •
قادربەگ ئێژێ بە سلێمانبەگی برای : ئەمە نابێ ئێمە هەر تۆزێ گەرمیمان
بگاتێ خەبەر بنێرین بۆ جوانڕۆ بۆ لەشکر • ئیمڕۆ ئەم شەڕە ئەکەم ، ئەگەر
فایەق بووم هەم ناوێ بۆ خۆمانو ، هەم جێگەو رێگەیێکی زیاد بۆ ئەم
عەشیرەتە پەیدا ئەکەم • ئەگەر فایەق نەبووم جوانڕۆمان لە دەست

دەرنەچوە ، ئەچینەوە بۆ جێی خۆمان بۆ جوانڕۆ • ئەگەر صەد کەسیشمان بکوژرێو بڕۆینەوە ئێلی جوانڕۆ گەمەمان پێ ئالەن بڵێن : لای ئێمە رۆیین بە هەتککراویی هاتنەوە ! ئەڵێن : پەلەپەلیان کرد موەفەق نەبوون • نەك هەزار کەس ئەگەر صەد کەسم ببێ ئەچم بەگژیانا !

یەکێ لە کوێخاکانی جاف بە قەرەولیو جاسووسیی ئەچێتە ناو لەشکری گەلاڵیو کەلباغییو مەنمییو ، دێتەوە ئەڵێ بە قادربەگ : هیچ مەوەستە بچۆ بە گژیانا ، تەماشای ئەوانم کردوە ئەوەر چە زۆرن ئەمما وەکوو سەگ وانە ، هەمووڕەنگن ، رەشو سپیو بۆرو بازگن • لەشکرەکەی ئێمە یەك نەوعە ، وەکوو گورگ یەکڕەنگە ، بۆرو دەمڕەشن • ئینشائەڵلا موەفەق ئەبین • لە تەك قسەی ئەم کوێخایەدا لەشکر رائەکێشن بۆ سەریان ، ئەبێ بەشەڕیان ، چونکە دەوری تەرەقیو طاڵعی ئەمان بوو بەو کەمیەوە بە نەوعێ ئەیانشکێنن شەشصەد حەوتصەد کەسیان لێ ئەکوژن • گەلاڵیی نزیکی صەدکەس تەلەفیاتو خەسارەتیان ئەبێ • ئەمما گەڵباغییو مەنمییو کەڵهوڕ زۆریان لێ ئەکوژرێو ، زۆر موفەشەق ئەبن • مەنمیی بەشێکیان بە شپرزەیی ئەگەڕێنەوە بۆ ئەطرافی سلێمانی • مەنمیی ئەو باقیەکەی تریان لە تەك گەڵباغییو کەڵهوڕدا ئەچنە لای والیی سنە کە حاکمی ئەردەڵان بوە ، ئەویش لە بەینی گەڕووسو سنەدا جێگەیان ئەداتێ • کەڵهوڕو تیلەکۆ لە خوڕخوڕەو باشماخدا دائەمەزرێنێو ، گەڵباغیی لە سارالو هۆبەتوو و ، دیواندەرە دائەنێ گەلاڵیی چونکە لە رەگی جاف ئەبنو کەمیشیان لێ ئەکوژرێ •• دەخالەت بە قادربەگ ئەکەنو ئەبن بە عەلاوەجاتی طایفەکانی جاف •

ئەو شێراغا ، کە رەئیسی گەلاڵیی بوە لەو وەقتەدا ، باپیرە گەورەی حەمەئاغای رەضائاغایە کە ئیستە رەئیسی گەلاڵییە • رەضائاغا کوڕی عەباس ئاغایە ، ئەویش کوڕی ئەحمەدئاغایە ، ئەحمەدئاغا کوڕی بارامئاغایە •

بارام‌ئاغا کوڕی شێراغایەو، ئەو کوێخا جاسووسە جافە سوورەی نەوی‌جان بوە • کـە کەورەی طایفـەی وەلی بـوە • قادربەگ‌و سلێمان‌بەگ کـە ئەم فەتحەیان بۆ ئەکرێ زۆر تەرەقی ئەکەن‌و ، ئەو ساڵە ئەچنە کوێسان لە جێگەی ئەو عەشیرەتانەدا دائەمەزرێن • پایز کە دێن بۆ شارەزوور حاکمی بەبە زۆرزۆر حورمەتیان ئەگرێ‌و ، لە شارەزووردا ئەبن بە صاحێـــب جێگەو رێگە • بەڵێ ( بەراتی‌نەجات بە خوێن نووسراوە) •

جافەکانی جوانڕۆو ئەیالەتی کرماشان کە ئەمەیان دی‌و شارەزووریش جێگەیەکی صاحیب ئاوو خەلەهاوەرەو جۆگەی بێ‌تەکلیفی زۆرە •• بـــە عومووم حەرەکەتیان کرد هاتن بۆ لای سلێمان‌بەگ‌و قادر بەگ • ئـــەم پانزە هەزار ماڵە لە جـاف ، گـەڕیاوو دانیشـتوو ، کە ئیسـتە داخڵــی کوردستانی بابان‌و عێراقە ، ئەو سـاڵە تا بەهار عومووميـان هاتـن لــە مەنطیقەی شارەزوورو لیـوای کەرکـووك دامـەزران‌و ، جێگـەی ئـەو عەشیرەتانە ، کە ناومان‌بردن ئیشغالیان کردو کەوتەدەستیان •

کە وەقتێ ئەم عەشیرەتانە لە ئەطرافی سلێمان‌بەگ‌و قادربـەگ زۆر بوون‌و بوون بە صاحێبی پانزە شانزە هەزار ماڵ ، بـۆ ئیـدارەکردنیـان‌و تەکلیف‌لێ‌سەندنیـان ، کـە ئەمە رەسمێکی حـەوتصەد سالیـی بوە ، بـۆ رەئیسانی جاف‌و ، هیچ حوکوومەتێ لەو وەقتەدا ، نە لە ئێران‌و ، نـە لـە خاکی بابان‌و عێراق طەڵەبی قرانێ‌و مەڕێ‌و بزنێکی لە عەشیرەتـی ئـەوان نەکـردوە ، واریداتی ئەمانـە مەخصـووص بوە بۆ ئیـدارەو گوزەرانـی خۆیان •• قادربەگ ئەساسێکی عەسکەریی عەشایریی بۆ خـۆیان دانـا ، سێصەد ماڵی لە عومووومی طایفەکانی جاف هەڵبژارد ، ناوی نان : (پشتماڵە) ماین‌و تفەنگ‌و رم‌و دەمانچە ، کە ئەسبابی شەڕی ئەو وەقتە بوە ، تەسلیمی کردن‌و طایفەی عەمەڵە کە طایفەیەکە لە جاف‌و سێصەدو پەنجا ماڵ ئەبـێ ، ئەوانیشی لە تەکلیفی عەشیرەتی تەرخان‌کرد ، صەدو پەنجاسواری داخڵـی

دەفتەری سوارەی خۆی کرد ، طایفەی بەداخیی پەنجا سواریان مایـن‌و تفەنگ‌و رمی بۆ تەدارەك کردن • ئەوانیشی داخلی دەفتەری سوارە کرد • صەدانیی پەنجا سواری لـێ مەخصـوص کـردن • ئـەم صـەدسوارەی صەدانیی‌و بەداخیی‌یە ، هەر وەکـوو لـە تەکلیـف ئـازادبوون ، وەکـوو خزمەتکاری پشتماڵەو عەمەڵە ، بەرات‌و جیرەو مەعاشیان بوو ، باقیـــی سوارەکانی صەدانیی‌و بەداخیی ماین‌و تفەنگیان هی خۆیان بوو ، ئەمما لە وێرگوێ‌یی شەخصیی ، کە پێی‌ئەڵێن (خەرج) ، خاریج کرابوون‌و ، دایما بۆ هەموو خزمەتێکی مەجبووریی حازر بوون • لە زەمانی سلێمان‌بەگ‌و قادربەگ لە پشتماڵەو عەمەڵەو بەداخیی‌و صەدانیی پێنجصەدو پەنجا سوار سوارەی خزمەتکار دایما مەوجوود بوەو ، لە طایفەی صەدانیی‌و بەداخیی صەد سواری لە خەرج‌دەرکراویش حازر بوە• وەڵەدبەگ کە کوڕی خانەبەگ بوە ئەویش پشتماڵەیێکی بوەو دایما صەدو پەنجا سوار خزمەتکاری تێدا بوە ئەو صەدو پەنجا سوارەی وەڵەدبەگەش تابیعی فیکری قادربەگ‌و سلێمان بەگ بوە • ئەگەر طایفەیێ لە جاف سەرپێچیی بکردایە بەم قوەتانـە تەربیە ئەکراو ، جەزایەکـی زۆر سەختیشی لـێ ئـەسێنرا ،وە بەڵـکـو لێشیـان ئەکوشتن • ئەگەر چە عەشیرەتەکەیان ئیطاعەیێکی مەعنەویی‌و خالیصانەیان بوە بۆیان‌و ، خۆیان هەر تەکلیفێ کە دابێتیان زۆر لایان خـۆش بـوەو ، ئەساسێکی تر بۆ سەلامەتیی وەضعیەتی جاف‌و بەگزادە تیکرار قادربـەگ دایناوە • ئەو دوو طایفە ، کە صەدانیی‌و بەداخیی بێ ، لە وەقتی زوستانا لە گۆڕەشەلەو ، سەنگەرو ، قەڵاتەپە ، کە ئەمڕۆ داخلی ناحیەی قۆرەتوون‌و ئەوسا خاکی ئێران بوە ، بە زوستان دایناون • لەبەر ئەمە ئەگەر لە وەقتی زوستاندا لە حوکوومەتی بابان عاجز بێ کوتوپڕ بچێتە ناو ئەوان تاکـــو باقیی جاف بۆی ئەپەڕێتەوە لە ئاوی سیروان‌و ، جێگەی ئەو دوو طایفە لـە تەك جێی زوستانی قادربەگدا ، کە قەڵای کانـی‌چەقەڵـە وە ها بەســەر

سیروانەوە ، فاصیلە لە بەینیانا ئاوی سیروان بوەو ، ئەو دوو طایفە ئیستەیش جێی زوستانیان هەر ئەوێیە •• هەر وەکوو قادربەگ ئەم ئیحتیاطەی کردوە ، وەلەدبەگیش ، لە جێی زوستانی پێباز بوە ، طایفەیەکی لە مەیدانو کەوزەینالیی داناوە وەکو فیرقەی سەلیم لە هاروونیی، ئەمانە لە وەقتی بەهاردا لە شەکمەیدانەوە بە کەلەک ئەپەڕینەوە ئەشارەزوور • بۆ وەقتی هاوین موحتاج بەم ئیحتیاطە نەبوون ، چونکە بە عوموومی عەشایرەوە لە خاکی ئێران بوونو ، ئەم فیکرەیان بۆ ئیدارەی ئێلیو عەشیرەتیی خۆیان فیکرێکی زۆر بەرز بوە •

قادربەگ ئەولادی نەبوە ، بە بێ ئەولاد مردوە •

سلێمانبەگ دوو کوڕی بوە یەکێکیان ناوی قادربەگ بوە ، ئاوناوی مامەی خۆیو ، یەکێکیان ناوی کەیخوسرەوبەگ بوە •

## فەصڵی شەشەم

بەحثی کوڕەکانی سلێمانبەگە : هەردوانیان رەئیسی عومومی جاف بوون • ئەمانە لە پاش باوکو مامەیان مودەتی پانزە ساڵ لە کەماڵی دەسترۆیندا ئیدارەی ئەم عەشیرەتەیان کرد • بەهرامبەگی میرەبەگ ، کە میرەبەگ برای بچووکی ظاهیر بەگ بوەو ، وێنەی لە ناو تەئریخی حوکمدارانی بابان کە رێکخراوی سەییدحوسەینی رەواندزییە ، هەیە •• کەوتە ناو عەشیرەتی جاف بە فیتنەییو ، حاکمەکانی بەبەیش نەیانئەویست ، کە بەگزادەی جاف نوختەموقابیلیان لە خاکی بابانداد بوێستن ، کە هەم ئیقتیداری ماڵییان بوو هەم عەشیرەتێکی وەکوو جاف لە ئێرانو عێراقدا ، کە ئەوان دایما موراجەعەتیان پێئەکردن بە ئێرانو عێراقو ترسی سیاسەتیان لە ئێرانو عێراق بوو ، نەیانئەویست کە عەشیرەتی جاف تەوەسوع بکەن

له کەماڵی صولحو سەلامەتی‌دا بمێننەوەو شارەزایی لەگەڵ وەزارەتـی بەغداو حوکوومەتـی ئێرانداپەیدا بکـەن ٠٠ یاریدەی بەهرام‌بەگی میرەبەگیان ئەدا لەسـەر ئەو فیتنەیی‌یـەو ، بەهرام‌بەگیش هـەم ئامۆزای قادربەگ‌و کەیخوسرەو بەگ بوو ، هەم حیصصەیێکـی گەورەشـی لـە بەگزادەتی ئەبردو ، خۆشی پیاوێکی زۆر ئازاو عاقڵو دەولەمەنـد بـوە ، موەفەق‌هات بەسەر فیکری خۆی‌دا ، بوو بە رەئیسی عومووومی جـاف ٠ قادربەگ‌و کەیخوسرەوبەگ لە ناو جاف دەرچوون ، چوونە یەنگیجـەو بابۆلانو سێ ساڵ لەوێ‌دا مانەوە بە هەزار ماڵێ لە جـافو پشتمالـەوە ٠ وەزیری بەغدا زۆر حورمەتی ئەگرتن ٠ ئەمما دەستی بەسەر وڵاتی بابانو جاف‌دا نەبوو ، کە ئیشیان چاك بکاو ، بەهرام‌بەگی میرەبەگ زۆر تەرەقی کردو ئەساسی گەورەیی بۆی تەواو بوو ٠ لە پاش سێ ساڵ عومووومی جاف کوێخاکانیان لە عومووومی فیرقەکان گردئەبنەوە ، ئەڵێن : ئێمە بە چوارصەد ماڵ فەقیرو فوقەراوە لە جوانڕۆ هاتینە ئەوڵاتی بابان لە سایەی سەعـیو تەلاشی قادربەگ‌و سلێمان‌بەگی ظاهیربەگەوە ئـەم جێگـە زۆرە لـەتەك شارەزووردا ئەدەستی ئێمە کەوت ، ئیستە بۆچی بە فیتنەیی بابان ئێمـە وەلی‌نیعمەتزادەی خۆمان بفەوتێنین ؟ بە دەفعەیێ سێ هەزار سوارو سێ هەزار پیادە ئەبەنە ماڵی کەیخوسرەوبەگ‌و قادربەگ بێ‌پرس باریان ئەکەن ئەیاندێرنەوە ناو خۆیانو بە بەهرام بەگی میرەبەگ ئەڵێـن : ئێمـە بـە صوورەتی قەطعیی تۆ بە رەئیس نازانین ، رەئیسی ئێمە کەیخوسرەوبەگ‌و قادربەگە کە کوڕی سلێمان‌بەگن‌و ، ئەگەر حاکمی بەبەش دەست لـەم فیتنەیی‌یـە هەڵنـەگرێ ئیدارەی ئـەویش تێك‌ئـەدەین‌و ، ئاوەدانیـی لەحوکوومەتی بەبەدا نایەڵین !

وە حاکمی بەبە لەو وەقتەدا سلێمان‌پاشای باوکی ئەحمەدپاشا ئـەبێ ٠ کە ئەم خەبەرە وەرئەگرێ زۆر ئەکەوێتە پەلەپەل ، وەقتی بەهار کە عەشایر

عومووم ئەچنە شارەزوور ، خۆی بە عوموومی پیاوە گەورەکانی بەبەوە
بتە مالی کەیخوسرەوبەگ لەسەر ئاوی زەلم • زور دلخۆشییان ئەداتەوەو
،فەرمویّ : لەم مەسئەلەی ئێوەدا من قەباحەتم نەبوە • برای خۆتان لەتەك
ەشیرەتەکەدا ئەمەیان کرد • ئیستە مادام خۆتانو عەشیرەتتان موافیقن من
یچم ناویّو ، لە عومووومی شارەزوور من سیّ جۆگەم هەیە کە عیبارەتن
ە : دەلێنو ، موانو ، مالوان • باقیی دارو بەردی قەزای ئەلەبجەو
ـرۆچكو پێنجوێن عایدە بە ئێوە ، عەشرەتی خۆشتان هەچی تەکالیفی
مەیە هی خۆتانە ، بەخۆڕایی لە من عاجز مەبن لازمە منیشو ئێوە[١٢] بۆ
سەلامەتیی ئیستیقلالی خاکی بەبە پەلەپەل بکەین کە دوو دوشمنی وەکو
ئێرانو وەزیری بەغدا کە چاویان تیّبڕیوین بە عومووومی پیاوە گەورەکانی
بەبە وەکوو عەزیزئاغای مەصرەفو ، حاجیبەگ ، ئەحمەد بەگی
صاحێبقرانو ، عەبدوڕەحمان ئاغای بارچاوەش لە تەك کەیخوسرەو بەگو
قادربەگ ئیتتیحاد ئەکەن بۆ تەحکیمی مەوقیعی سلێمان پاشا، وە سلێمانپاشا
عەزیزئاغای مەصرەف ئەنێرێتە لای کەیخوسرەوبەگ ئەلیّ : من حەز ئەکەم
کە خزمایەتیەکی زیادە لە تەك ئەوانا بکەم کە دایما من لەوان ئەمین بمو
ئەوانیش لە من ئەمین بن ، داوای کچی کەیخوسرەوبەگ ئەکا ،
کەیخوسرەوبەگ ئەلیّ بە عەزیزئاغا : ئێمە ژن بە غەیری جینسی خۆمان
نادەینو ، ئەم قاعیدە وەصیەتی ئەجدادیمانە • ئەمما وەلەدبەگ ، کە یەکێکە
لە بەگزادانی جاف ، کچی هەیە بە ئەو ئەلێم بیداتیّو ، کچی وەلەدبەگ ،
پەریزادخانم ، ئەدەن بە سلێمانپاشا ، لەو کچە ئەحمەد پاشاو عەبدوللاپاشاو
محەمەدپاشای باوکی حەمدیبەگ لیی ئەبیّ •

ئەم قاعیدە ، کە ژن بە غەیر نەدریّ ، ئیستەش دەوام ئەکا ، ئەمما لە
جینسی ئێمە ، کە بەگزادەی کەیخوسرەوبەگین ، دوو ژنمان بە سەییدداوە،

(١٢) ئەگەر (ئێوەیش)بیّ رەوانترە •

یەکێکیان بە کـوڕی کـاك ئەحمـەد، کە شێخ سەعیـدی باوکـی شێ
مەحموودەو ، کچێکی قادربەگی کەیخوسرەوبەگ دراوە بە شێخ فەرە
بەرزنجەو ، لەم ئاخریشەدا کچێکـی سلێمانبـەگی محەمەدپاشایـان دا
بە جەمیلبەگی مەجیدپاشـای بابـانو ، ئەم قاعیـدەیە هـەروەك لە نـ
مـوتـەفیـكدا جاریی بوە ، لە ناو ئێمەشا جاریی بوە ، تا ئیمڕۆ دەوا
کردوە ، بزانین لەمەولا چـۆن ئـەبێ ؟

قادربەگ لە تەئریخی هەزارو دووصەدی هیجریدا بەڕەحمەت ئەچێ
ریاسەت بە عومومیی حەصر ئەبێتە سەر کەیخوسرەوبەگ • قادربـە
تەنها کوڕێکی ئەبێ کە باوکی گەورەی بەگزادەی بەهرامبەگییە ، مند
ئەبێ عومری لە دەوری دوانزەدا ئەبێو ، نـاوی محـەمەد بـەگ ئـەبێ
کەیخوسرەوبەگی مامەی زۆر غەدری لێئەکاو لە جافدا بەشی ناداو ، جا
عوموومی خەرجو پیتاكو تەکالیفی بۆ خۆی وەرئەگرێ(١٣) • دایکـ
محـەمەدبـەگ ، کە نـاوی زوبەیدەخـان بوەو کـچی میرەبـەگ بوە
محەمەدبەگی کوڕی ئەباتە سلێمانی لای حاکمی بەبە شکات ئەکـات لـ
کەیخوسرەوبەگ • حاکمی بەبەش بە لەشکرەوە دێتە شـارەزوور ، ل
ماڵی کەیخوسرەوبەگ دائەبەزێ • عومـوومی بەگـزادە گردئەکاتـەوە
عوموومی کوێخای جاف لە دانیشتووو گەڕیـاو حازرئەکـاتو ، ز
سەرزەنشتی کەیخوسرەوبەگ ئەکا ، پێیئەڵێ : ئەم کوڕە برازاتەو باوکیشـ
براگەورەت بوە ، لەسەر تۆ لازمە لەتەك کوڕی خۆتا فەرقی نەکەی •
مەجبوورم لە بەر خاتری قادربەگی سلێمانبەگ هەواخواهیی ئەم کو
بکەم • ئایا لە جافو ، ئایا لە دێهاتی شارەزوورو ئەطراف ئەبێ بەشی ب
دابنێم • کەیخوسرەوبەگ رازیی ئەبێ بە تەقسیمی دێهـاتو جـاف ل
عەشیرەتی جاف • لە طایفەی میکایەڵیی حەمەعەلی وەیسییو ئاڵیبەگـ

---

(١٣) لێرەدا هەندێك نارەسایی لە داڕشتندا هەیە •

شوبۆریی ، خاریجی شوانکاره ، به گەڕیاوو دانیشتوویانەوه ، عوموومی
ـرێ به محەمەدبەگ‌و، له عەشیرەتی شاتریی‌و وردەتاتریی ، به کەڕیاوو
نیشتوویانەوه ، ئەویشی ئەدرێتێ‌و ، فیرقەی نەژوینی ، که عەلاوەجاتی
تریەیه ، له تەك صۆفی‌وەنداو عوموومی نەورۆلیـی ، خاریجی فیرقەی
ـمە ، ئەویشی تەسلیم ئەکرێ‌و ، له دیهاتی فەرای تەلەبجەو شـارەزوور
ـنـدەو چروستـانه له تـەك قارەمـانیی‌و ، غولامـی‌دا ، دانیشـتوو و
ڕیاویانو ، لەتەك رەنگاڵ‌و ، کاکردەڵ‌و ، زەردیانو ، عوموومی وارماوا،
عیبارەته له سێداره (سیاره)و ، بیرکێ‌و ، چنـارەو ، ئەحمەدبرنـدەو ،
ـلاڵو ، وازۆڵو ، عازەبانو ، توەفوت‌و ، جەرداسـەو ، خەنەکـەو ،
ماش‌و ، سوەیلەمش‌و ، قاینەیجه ، له ناحیەی خورماڵ‌و ، دوو نەهر لـه
عیەی پێنجوێن‌داو ، له قەرەداغ سێوسێنانو ، کەلوەش‌و ، مەسۆدیی‌و ،
ـمەتەی ئەدەنێ • بـاقیی تری جـاف له تەك شـارەزووردا وه ناحیـەی
جوێن عوموومی بۆ کەیخوسرەوبەگ ئەمێنێتەوه •

محەمەد بەگ له پاش ئەم تەقسیمانه له پشتماڵەی کەیخوسرەوبـەگ
رئەچێ ، صەدوپەنجا ماڵ پشتماڵه بۆ خۆی دائەنێ‌و ، پیاوێکی زۆر ئازاو
ـکەر بوه • بەگزادەی بارامبەگیی هەموویان ئەولادی ئەونو ، شەش
ـوڕی بـوه : بارامبـەگ ، میرانبـەگ ، ئەمـینبەگ ، عەزیـزبەگ ،
حمەدبەگ ، فەتاحبەگ • بارامبەگ کوڕی گەورەی بوه ، لەم ئاخریەدا
گزادەی بارامبەگیی به ناوی ئەوەوه ناوئەبرێن • ئەمما له تەك بەگزادەی
یخوسرەوبەگی‌دا ، که ئێمەین‌و ، ئەحفادو کوڕەزای کەیخوسرەوبەگ‌و
ـەمەدپاشاین ، یەك رەگ‌و ، یەك خوێن‌و ، ئامۆزاین • ئەگەرچی ئەوانیش
احیب ئێل‌و جێگەو رێگـه بـوون وەکـوو ئێمـه ، ئەمـما له زەمانـی
یخوسرەوبەگـەوه ریـاسـەتی عوموومی جـاف‌و بـەگزاده به دەستـی
یخوسرەوبەگ‌و کوڕو کوڕەزایەوه بوەو ، وەقتێکیش که حوکوومەتی

تورك ولاتی بابانی گرتو ، ئینقیراضی حوكوومەتی بابان بوو ، لە تەئریخی هەزارو دووصەدو شەصتو شەشی هیجریدا ، لەو زەمانەشەوە ریاسەتی عوموومیی ، کە بە ئەمری حوکوومەتی عوثمانیی بوە بەدەست بەگزادەی کەیخوسرەوبەگیوە بوەو ، کەیخوسرەوبەگ لە پاش ئەو تەقسیماتە تا سالی هەزارو دووصەدو چلوچواری هیجریی ئیدارەی عوموومی جافو بەگزادەی کردو ، لەو تەئریخەدا بەرەحمەت چوو • پیاوێکی زۆر موسولمانو صاحێب ئیحسان بوە ، لە لیباسی حاکمیدا زۆر بێ نەفس بوەو ، دایما دوو دەواری گەورە ، ،کە هەر یەکێکیان دە دیرەگی بوە ، بۆ فەقیرو فوقەراو سەییاح مەخصووص بوە • عادەتا مالی وەکوو تەکیەیەکی بێ فێل بوە • لە تەك ئەمەشدا ئوصوولی عەشایری خۆی تێك نەداوە ، وە ئەوەی کە موحافەظەی سەطوەتی بکا لە دەستی بەرنەداوە لە لەشکرو سوارو کۆمەل • وە زۆر تەرویجی ئەهلی علمو تەدریسی کردوە • چەند مەدرەسەیەکی مەخصووصی لە دێهاتانا بوە ، بە واسیطەی ئەمەوە کە زستانان لە بەغدا نزیك ئەبوونەوەو هاوینان ئەچوونە ئێرانەوە طەرزی حەیاتێکی موتەمەددینانەیان وەرگرتبوو و ، زۆر بە ثەروەتو صاحێب پارە بوە ، بە دەرەجەیێکی وا کە سالی صەدکەسی فەقیری بە مەصرەفی خۆی ئەنارد بۆ حیجازو ، نەیهێشتوە لە پشتمالەی کەسی لە مالی خۆیدا نان بخوا ، ئیللا لە سەر سفرەی کەیخوسرەوبەگ نەبێو ، لە پاش خۆی پێنج کوڕی بوە : سلێمان بەگ ، قادربەگ ، عەبدوللابەگ • محەمەدبەگ ، عەبدوڕەحمان بەگ •

## فەصلی حەوتەم

بەحثی کوڕەکانی کەیخسرەوبەگە لە تەئریخی هەزارو دووصەدو چلو چواری هیجریدا ، سلێمان بەگ ، کە ئەرشەدی ئەولادی بوە ، ئەبێ بە رەئیسو لەجێی کەیخوسرەوبەگ دائەنیشێو ، لە تەئریخی هەزارو

دووصەدو چل‌و پێنجی هیجریی‌دا لەشکری والیی سنە ، کە حوکوومەتی ئەردەڵانە ، دێن بۆ سەر سلێمانی ، حاکمی بەبە طەلەبی یاریدە لە سلێمان‌بەگی کەیخوسرەوبەگ ئەکا ، سلێمان‌بەگ عەبدوڵلابەگی برای بە دوو هەزار سواری خوصووصیی خۆیان‌و جافەوە ئەنێرێ بۆ سلێمانی ، لە گردە گرۆێ ، کە نزیکی سلێمانی‌یەو کەوتۆتە شیمالی سلێمانی ، لە تەك لەشکری بەبەدا لەو مەوقیعە لە تەك لەشکری ئێراندا ئەبێ بە شەڕیان ، لەشکرەکەی ئێران لە پاش هەشت نۆ سەعات مودافەعە ئەشکێنن ، روو بە شارباژێڕ تەعقیبیان ئەکەن ، زۆریان لێ ئەکوژن ، لە ئاخری شەڕدا گوللەیێ تەصادوفی قاچی عەبدوڵلابەگ ئەکا ، زۆر کەم زامار ئەبێ ، لە تەك ئەوەش‌دا کە زامەکەی زۆر بێ‌ئەهمییەت ئەبێ پێی ئەمرێ‌و ، ئیستە قەبری عەبدوڵلابەگ لە مەقبەرەی حاکمانی بەبە لە گردی سەیوانی سلێمانیدایە .

**بۆ موحافەظەی تێکنەچوونی ئیستیقلالی بابان زۆر بەگزادە لە بەگزادەکانی جاف‌و پیاوی چاکی جاف کوژراون‌و ، بەم رەنگە رۆیون‌و خۆیان فیدای وەطەنی کورد کردوەو ، ناویشیان نیە . ئەمەش بە واسیطەی ئەمەوەیە کە ئومەراو پاشاکانی کورد موبالاتیان بە تەئریخی کورد نەکردوەو ، تیکرار ئەینووسم‌و بەیانی دلگیریی ئەکەم کە رابوردووی هەموو میللەتێ ئەچێتە غەوری تەئریخەوە ، ئەمما رابوردووی کوردی بێ‌چارە چۆتە ژێر خاك‌و خۆڵی بێ‌تەئریخیەوە ! ئەگەنا ئەتوانم بنووسم بۆ موحافەظەکردنی ئەم خاکە کەمەی بابانە نیوەی میللەتەکەی خوێنی خۆی وژاندوە ، وە ناویشیان نیە .**

وە ئەم عەبدوڵلابەگە عومری بیست‌و دوو ساڵ بوە کوڕێکی زۆر لاوچاك‌و جوان بوە ، جوانیی‌و شەوکەتی ئەو لە کوردستانی بابان‌و ئەردەڵانا مەشهوور بوەو ، لەو زەمانەدا کە جاف‌و بەگزادەی جاف داخلی خاکی ئێران بوون رەسمی حوکوومەتی قاجاریی

ئەمە بوە کە طەلەبی گرەویان کردوە لە بەگزادەی جاف بـۆ موحافـەظەی خاکی ئێران لە تەعەڕوضی جاف • ئەم عەبـدوڵلا بەکە چوار ساڵ هـەموو هاوینێ بە پەنجا سوارەوە چوەتە خزمەت شا لە طـەهران زۆر حورمەتـی گرتوەو ، زۆریشی خۆش گەرەك بوە ، حەتتا لە پاش کوژیانی کە بەگزادەی تر لـە جێی ئـەو ئەچێتە طەهران زۆر ئەسـەفی بـۆ ئەخـواو کاغـەزی تەعزیەی[١٤] بۆ سلێمان بەگی برای ئەنووسێ‌و ، ئـەو کاغەزە ئێستـەیش ماوەو ، عەبدوڵلا بەگ پیاوێکی زۆر موتەمەددین‌و ، تەحصیلی جاریی ئەو وەقتەی زۆر تەواو بوەو ، دوو ساڵ یا سێ سـاڵ لە پێش کـوژیانیا لـە کوێستانی ئێران دووچاری نەخۆشمیەکی زۆر خراپ ئەبێ • کەیخوسرەو بەگی باوکی کاغەز ئەنووسێ بۆ خزمەت شای ئێران حەکیمێکی خوصووصـی خۆی بۆ ئەنێرێ تەداوییەکی زۆر چاکی ئەکاو ، لەو نەخۆشیـە نەجاتـی ئەبێ‌و ، هەموو ساڵێ شای ئێران خەڵاتی ئەکا • یەکێ لەو خەڵاتانە ساڵێ کتێبێکی شاهنامەی خەطخۆشی صوورەتداری ئـەداتێ ، تا ئەم بەینـە مابوو ، لەم نزیکانەدا حەسەن بەگی عەلی بەگ لـە بەغـدا بە عەنتیکەیـی فرۆشـتی •

لە تەئریخی هەزارو دووصەدو چل‌و هـەشتی هیجریـدا لە وەقتـی زوستاندا کە عەشایری جاف دێنە جێی زوستـانە عـەشیرەتی صەدانیـی‌و بەداخیی لە خاکی ئێران ئەبن ، لە ئەیالەتی کرماشانەوە عەسکەرێکی زۆری ئێران بۆ سەر قادرمیروەیسیی‌و طایشەیی حەواڵە ئەکرێ ، ئەوانیش بـە حەسبەی جافێتیی‌و هاوجینسێتی وە صەدانیی‌و بەداخیی کە درواسێیـان ئەبن دێن بۆ ناو ئەوان ، وە کوێخاکانی صەدانیی‌و بەداخیی خەبەر ئەنێرن بۆ سلێمان بەگ ئەویش قادربەگی برای بە پێنجصەد سواری خوصووصیی خۆیەوە ئەنێرێتە ئەوبەر سیروان کـە بەداخیی‌و صەدانیـی بـار بکـات

(١٤) (تەعزیە) راستترە .

بیانهێنێ بۆ ناو جاف ، کە لە تەعەرڕوضی عەسکەری ئێران مەحفووظ بن•
گەیشتنی قادربەگ ئەناو صەدایی‌و بەداخیی تەصادوفی لەشکری
عەسکەری ئێران ئەکا کە لەتەك طایشەیی‌و قادرمیروەیسی‌دا شەڕیان ئەبێ ••
ئەکا ، گوللەیێ تەصادوفی قادربەگ ئەکا بە لەشکرەکەی خۆی نالێ
زامارم ! ئەمما تەحریکیان لەسەر شەڕ ئەکا ، لەشکرەکەی ئێران ئەشکێنن‌و
صەدانیی‌و بەداخیی بار ئەکات ، ئەیانهێنێتە ئەمبەری سیروانەوەو ،
خۆشی کە ئەگاتە ماڵ لە پاش دوو سەعات بەو زامە ئەمرێ • سلێمان‌بەگی
برای لە ئەسەفی ئەودا کوتوپڕ نەخۆش ئەکەوێ ، لە پاش دوو رۆژ
ئەویش بەڕەحمەت ئەچێ •

ئەم قادربەگە ئەگەر چە سلێمان‌بەگ براگەورەی بوەو وەظیفەی
گەورەیی تەواو بەدەست ئەوەوە بوە ، ئەمما هەر ئیشێ کە رووی کردبێتە
جاف ، چە لە طەرەفی بابانەوەو ، چە لە طەرەفی ئەردەڵانەوە ، عومومی
جێبەجێکردنی لە عۆدەی قادربەگا بوە ، وە لە داخلی جافیش‌دا کەم‌و زۆر
ئیش‌و کارو تەکلیف‌سەندن‌و ئومووراتی سوارەی خوصووصیی خۆیان لە
پشتماڵەو طایفەکانی جاف‌دا ئەو جێبەجێی کردوە ، سلێمان‌بەگ هەر
ئیسمی گەورەیی بوەو ، رەواجیشی بە عیلم‌و عیرفان لە مەحاڵی خۆیاندا
زۆرداوە • ئیستەش سێ مزگەوت لە ئەطرافی ئەڵەبجە ، کە بینای ئەوە ،
ماوە ، یەکێکیان لە هانەسوورەیە دایما لە صەدوپەنجا طەلەبەی عیلم زیاتر
لەو مەدرەسانەدا بە خۆیان‌و مەلایانەوە ئیدارەی تەواوی لە طەرەفی
قادربەگەوە تەئمین‌کراوە • لە پاش مردنی ئەهلی عیلم‌و مەعاریف لە وڵاتی
خۆی‌دا زۆر موتەئەثیر بوون بۆی‌و ، نزیکی بیست (مرثیە) زیاتر بۆیان
هەڵبەستوە ، خوصووصەن شاعیری مەشهووری کورد جەنابی مەولەوی
چەند مەرثیەیەکی بۆ وتوە ، بۆ دواکەوتوانی ئەو زۆر عاجزیی ئەداو ، ئەم
دوو سێ شیعرە لە مەرثیەکانی مەولەوی‌یە :

تـــارەزوور ماتــەن پــەی نەدینــی تــۆ
رەوان لــەرد ئــەسرین زەلمو تانجــەرۆ
عەمەلــە ماتــەم ، پشتمالــە بــێ رەنــگ
سەرکۆمار بێزەوق ، مەدرەسە بێ دەنــگ
شێروانــە جە فکــر شکاربــازیی تــۆن
ئینتیظــار وە دەنگ زەنگی تازیی تــۆن

ئەم قادربەگە هەرچلۆنێ قادربەگی ظاهیربەگ جێی جافی لە ئێـران ویسعەت پێدا وە داگیری کرد ، ئەمیش ویسعەتی بە جێی زوستانی داون • عەشیرەتــی دەلۆو ، گێــژو ، پــالانیــیو ، رۆژبەیانیـــیو ، وەنـــاییو ، هۆمەراغاجانیی ••• ئەمانەی بارێ کردوونو خستوونیە خوار کفریوەو جافی تێدا دامەزرانوە • خزمەتی زۆری بۆ جافو بەگزادە بوەو ، قــەبری ئەوو سلێمان بەگی برای هان لە مەقبەرەی (سەیدخەلیل) سەعاتو نیوێ لە شیمالی شێروانەو ، گومەزێکی گەورە کە وان تێیــدا ئیستــەش مــاوەو ، تەئریخی مردنیان لە بەردی قەبرەکانیان نووسراوەو ، قادربەگو سلێمــان بەگ کوڕیان نەبوە • قادربەگ دوو کچو ، سلێمانبەگ یەك کچــی بــوە کە ئەم سێ[۱٥]کــوڕەی کەیخوســرەوبەگە لــە موددەتێکــی زۆر نزیکــا ئەمرن محەمەد پاشا ، کە برایان بوەو مندالٚ بوە ، بە عومری شانزەساڵیوە ئەمێنێتــەوە لــە دوایــان •

محەمەدبەگی قادربەگی سلێمانبەگ ، کە ئامۆزابان ئــەبێو ، لــەو وەقتەدا زۆر صاحێب دەست ئەبێ هەر وەکوو کەیخوسرەوبەگ لە پــاش مردنی سلێمانبەگ تەعەڕوض بە حوقووقی ئەو محەمەدبەگە ئەکا • ئەویش تەماع ئەکاتە ئێلو پشتماڵەی محەمەدپاشا • لە وەقتی تەعزیەی سلێمــان

(١٥) ئەم جێگەم باش بۆ ساغنەکرایەوە •

بەگ‌و قادربەگی کەیخوسرەوبەگ‌دا حوکم ئەکا لە پشتماڵەی محەمەدپاشا یاریان بکا بیان‌باتە پشتماڵەی خۆی پیاوە گەورەکانی پشتماڵەی محەمەدپاشا لەتەك گەورەی عەمەڵەو شاتری‌دا تەدبیر ئەکەن بۆ مەنعی ئەمە • ئەچنە لای محەمەدبەگی قادربەگ ، ئەڵێن : ئێمەبە هیچ نەوعێ ئەمە قوبووڵ ناکەین‌و محەمەدپاشا ، با منداڵیش بێ ، نایدەین بە دەست تۆوە ، هەرچی تەکلیفی ئێلی‌و عەشیرەتیی هەیە خۆمان گردی ئەکەینەوە ئەیدەین بۆ ئیدارەی خۆی‌و پشتماڵەو عەمەڵەو لەشکری‌و ، لە عەینی وەقت‌دا کچی محەمەدی برایم ، کە رەئیسی فیرقەی برایمیی ئەبێ لە شاتری ، بۆی مارە ئەکەن • مەحموودپاشاو عوثمان‌پاشا ، کە کوڕی محەمەدپاشان ، لەو ژنەن •

## فەصڵی هەشتەم

بەحثی زەمانی ریاسەتی محەمەدپاشایە :

لە تەئریخی هەزارو دووصەدو چل‌و هەشتی هیجری‌دا محەمەدپاشا بە عومری شانزە ساڵیوە ئەبێ بە رەئیسی عموومی جاف‌و بەگزادە ، کە وەقتێ ئەبێ بە رەئیس ئەوقاتی خۆی بۆ زیادیی سوارەی پشتماڵەو عەمەڵە حەصر ئەکا ، طایفەی ئەلك‌پیروەیس لە تەرخانی‌دا پەنجا سواریان مەخصووص ئەکا بە سوارەی خصووصی خۆیەوەو ، لە تاقمی وردەبەگزادە ، کە پێیان ئەڵێن : بەگزادەی حەسەن‌بەگی ئالی‌بەگ ، چل‌سواریان ماین‌و تفەنگ ئەداتێ ، ئەوانیش عەلاوەی سوارەی خۆی ئەکاو بەعزێ ماڵی تر لە جاف هەڵئەبژێرێ ئەیان‌هێنێتە پشتماڵە ، پشتماڵەکەی ئەکا بە چوارصەد ماڵ‌و،هەر سوارەیێ،کە لە پشتماڵەی خۆی‌دا ئەبێ حوکمیان لێ ئەکا نابێ لە وەقتی بەهارو هاوین‌دا سواری ئەسپ بن • کوللی سوارێکی ماینێکی بەرگردیان ئەداتێ • ئەسپ بۆ سوارە مەخصووصی

پایزو زستان بوەو ، سوارەی خوصووصیی خۆی ئەگەیەنێتە شەشصەد سوار . تا دە ساڵ لە کەماڵی دەستو تەرەقیدا ئیدارەی جاف ئەکا .

ئەحمەدبەگی وەڵەدبەگ ، کە رەئیسی فیرقەی وەڵەدبەگیو خاڵۆی ئەحمەد پاشای حاکمی بەبە بوەو ، پیاوێکی زۆر ئازاو صاحێبدەست بوە لە ناو جافدا .. ئەحمەدپاشا گەرەکی ئەبێ بیکا بە رەئیسی عموومی جافو ، ئەحمەدبەگیش زۆر فیتنەیی ئەکا لای ئەحمەدپاشاو محەمەدپاشا لە ناو حاکمەکانی بەبەدا هەواخوای عەبدوڵلاپاشا ئەبێو ، دوشمنیی عەبدوڵلا پاشاو ئەحمەدپاشای بەبەش تەئریخەن مەعلوومە . کە وەقتێ عەبدوڵلاپاشا لە سلێمانی نامێنێو ، ئەحمەدپاشا ئەبێ بە حاکمی سلێمانی نیەتی ئەمە ئەکا کە محەمەد پاشاو محەمەد بەگی قادربەگ لە تەك کوڕەکانیدا ، بە هەر فێڵێ بێ بیانگرێ !

لە وەقتی بەهاردا ، کە ئەچنە شارەزوور ، کاغەز ئەنووسێ بۆ شوێن محەمەدبەگی قادربەگو کوڕەکانیو ، بۆ شوێن محەمەدپاشاش . محەمەد پاشا ناچێ بۆ سلێمانی ، ئەڵێ : مـن نەخۆشـم . محەمەدبـەگ خـۆیو بارامبەگو ئەمینبەگو میرانبەگو عەزیزبەگی کوڕانی ئەچنە سلێمانی لای ئەحمەدپاشا ، لەوێ هەر پێنجیان ئەگرێ ، ئەیانێرێ بۆ کۆیە حەبسیان ئەکا ، محەمەدپاشا ، بە قاعیدەی هەمووساڵە ، لە تەك عەشـایری جـافدا ئەچێتە کوێستان ، لە وەقتی پایزدا کە دێنە خوارەوە بۆ طەرەفی مەریوان شەو پیاوەگەورەکانی پشتماڵەی لە تەك پیاوموناسبانی جافدا ئەچنە لای پێی ئەڵێن : ئەحمەدپاشا خەریکە تۆ بفەوتێنێ . ئامۆزاکانی تۆ ، کە وەکو محەمەدبەگی قادربەگو کوڕانی بێ ، گرتوونی .تۆ بە تەنها مـاوی ، وە دوشمنێکی وەکو ئەحمەدبەگی وەڵەدبەگ کە چاوی وا لە جێگەو رێگەی تـۆو باقیوە ، وە خاڵـۆی ئەحمەدپاشاشـە وا لـە نـاو جـافدا ، وە زۆر صاحێبدەستیشە وا لە بەرامبەرتەوە ، بۆ تۆ مومکیـن نابێ هـەم شـەڕی

خاریجو هەم شەڕی داحل بکەی ، لازمە تۆ فکرێ بە حالی خۆتدا بکەی !

محەمەدپاشا پێیان یێژێ : ئەگەر خوا منی گەرەك بێ بەمانە نافەوتێم.
لە پاش دوو ڕۆژ ئەحمەدبەگی وەلەدبەگ بە حوێر عوموومی بەگزادەی وەلەدبەگیوە نزیکی دووسەد سوار ، لایێ بۆ دێیەیو ، لە لایەکی کەوە بۆ خۆنوانن و شادنامی ، دینە مالی محەمەدپاشا .
محەمەدپاشاش نایخاتە ئەڕووی شەو . لە پاش نانحواردن خەبەر ئەدا بە سوارەی پشتمالەو ، زۆریش سوارەی عەمەلە لای محەمەدپاشا حازر ئەبن ، عوموومیان بە کۆمەڵێ دینە دیواخان ، ئەمر ئەکا پێیان ئەحمەدبەگی وەلەدبەگ لە تەك عەزیزبەگی حەبیببەگو ، عەزیزبەگی حسەینبەگو محەمەدئەمینبەگو ، سەلیمبەگی باوکی یارئەحمەدبەگی مەشهووردا ..
ئەگرنو باڵیان ئەبەستنو ، ئەو سوارانەی ئەحمەدبەگە کە لە پشتماڵەی محەمەدپاشادا ئەبن ، ئەمر ئەکا بە کوللی ماڵێ سوارەی خۆی بگرێو ، هەر ئەو شەوە بە حەوتصەد سوارەوە ئەچێتە سەر مالی ئەحمەد بەگی وەلەدبەگ ، لە بەردەمی هۆمەرەسێنانی پێنجوێنا ، ماڵی خۆیو بەگزادەکانی وەلەدبەگیی لەتەك پشتماڵەکەیا تالان ئەکاو ، هەرچە ماڵیان ئەبێ ئەیدا بە خزمەتکارو ، ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی . هەر ئەو ڕۆژە خەبەر ئەدا بە عوموومی عەشایری جاف ، خاریجی ئێلی ئەحمەد بەگی وەلەدبەگ ، کە هەزار ماڵێ ئەبێ ، ئەڵێ : من ئەگەڕێمەوە بۆ خاکی ئێران ، ئەبێ عوموومتان بچنە شارەزوور ، عوموومتان لە تەکما بێنەوە بۆ ئێران .

عوموومیجاف بە یەك دەفعە ڕوو بە ئێران ئەگەڕێنەوە ، بە ماڵەوە ئەچێتە سێسەعاتیی ئەجەنووبی سنە ، خۆیو هەشتصەد سوار لەتەك ئەو بەگزادە حەبسەکانی وەلەدبەگیدا ، کە ئەیانبا ، ئەچێتە سنە . ئەحمەبەگی وەلەدبەگ هەرچلۆنێ ئەحمەدپاشاو عەبدوڵلاپاشای بەبە خوشکەزای ئەبن ،

والیی سنه ، که حاکمی ئەردەڵان ئەبێ ، ئەویش خوشکەزای ئەبێ ، چونکە کچێکی وەڵەدبەگی باولی ئەحمەدبەگ ، که پیرۆزە خانمی ناو ئەبێ ، دایکی حاکمی ئەردەلان ئەبێو ، محەمەدپاشا بە فکری خۆی وا ئەزانێ حاکمی ئەردەڵان تەماشای ئەمە ناکا کە ئەحمەد بەگ خالۆیەتی ، چونکە محەمەدپاشا تەشەبوثی پێکردوەو ، جاف ئەکا بە تەبەعەی • لە تەك ئەم فکری محەمەدپاشادا نیەتی والیی موافیق نەهات • وەقتێ لە سنە لە ماڵی میرزامحەمەد ڕەزای وەزیری ئەردەڵان دائەبەزێو ، لە بەیانیدا ئەچێتە لای والیی ، تێئەفکرێ والیی موعامەلەی ساردە لە مەجلیسدا • والیی تەذکەرەیێ ئەیا بە میرزا محەمەدڕەزا • ئەنووسێ بۆی : محەمەدپاشا بە چە مەعنا خاڵۆکانی من حەبس ئەکا وە بە حەبسیی ئەیانهێرێتە لای منو ، لەتەك ئەمەشدا ئومێدی موعاوەنەتی لە من هەیە ؟ میرزا محەمەدڕەزا ئاپا خۆیو ، ئاپا باوکی ، لە تەك محەمەدپاشاو کەیخوسرەو بەگی باوکیدا حوقووقێکی صەداقەت لە بەینیانا ئەبێ ، لەم تەذکەرەی والیە زۆر عاجز ئەبێ ، ئەمما لە مەجلیسدا بۆی مومکین نابێ بە محەمەدپاشا بڵێ والیی فکری خراپە • تەذکەرەکەی والیی لە بەردەمی خۆیدا دائەنێو ، والیی لە مەجلیسەکە لەگەڵ میرزامحەمەدڕەزا ئەچێتەدەشتەوەو ، میرزامحەمەدڕەزا تەذکەرەکە بەجێ‌یێڵێ بۆ خاتری ئەمە کە محەمەدپاشا بیخوێنێتەوە •

محەمەدپاشا ئەیخوێنێتەوەو کوتوپڕ لە فکری والیی تێئەگاو دێتە ئەدەرەوە بە سواریی ئەچێتەوە بۆ ماڵی میرزامحەمەدڕەزاو خەبەر ئەدا بە عوموومی لەشکرەکەی لە کاروانسەرا ئەبێ • سوارئەبن ، لە شار ئەچنەدەرەوە • والیی کە دێتەوە ئۆدەی مەجلیس خەبەری محەمەدپاشا ئەپرسێ ، ئەڵێن : چوە بۆ ماڵی میرزامحەمەدڕەزا ، پیاو ئەنێرێ بۆ تەحقیقاتی ، خەبەری ئەدەنێ کە محەمەدپاشا بە خۆیو لەشکریوە ڕۆیی • عیتاب لە میرزامحەمەدڕەزا ئەکا ، ئەڵێ : تۆ خەبەرت داوەتێ ! ئەڵێ :

خەبەرم نەداوەتێ ، ئەمما لەو وەقتەدا کە بانگت کردم تەذکەرەکە لە خەیاڵم چوو • ئەشێ خوێندبێتیوەو ، حوکم ئەکا لە عەسکەری خۆی کە بچن بە شوێن محەمەدپاشادا •

میرزامحەمەدڕەزا یێژێ بە والیی : لەم خوصووصەوە حەقت نیــە • ئەوەڵەن ئەم پیاوە پەنـای ئەخاکـی تۆ هـاورد ، تـۆ کە موعـاوەنەتـت نەکرد حەقی تەعەڕوضی ئەوت نیە • گوێ لە من بکە بە دەستکەوتنەوەی خاڵۆکانت رازیبە ، ئەم لەشکری محەمەدپاشایە کە دوێنی من دیومــە لەوانە نین بە فەوجی ئاغامووساو ئاغانەصری تۆ دەردەست بکرێنو ، هەم ئیطاعەیێکی واشیان هەیە بە ئامیری خۆیان هەر وەکوو بوت بۆ بوتپەرست واتەو ! لەتەك ئەمەشدا ئەم پیاوە دە هەزار ماڵ عەشیرەتی خـۆی وا لــە تەکیا ، ظەریف فکربکەرەوە ،ئەمانە بە چەندێ قووەت تەربییە ئەکرێــن ؟ والییبە قسەی میرزامحەمەدڕەزا دەست لە تەعقیب هەڵئەگرێو بە ئەدەبی خۆیەوە دائەنیشێ •

محەمەدپاشا کە لە ئەردەڵاندا مەئیووسبوو بە رێی کولیاییدا خۆیو عومومی عەشیرەتی دێن بۆ جەبەڵی قزراباطو شارەبانو ، محەمەدپاشـا خـۆی ئەچێتــە بەغـدا لای وەزیـر ، ئـەویش بۆ زوستـانو مەحەللــی عەشایرەکەی جـەبەڵی شـارەبانو بـەینی خانەقـیو قزرابـاط لـە تـەك جەبەڵی باخچەدا ، کە ها لە پشت خانەقیوە تا حـودوودی مەندەلیـی •• ئەیداتێو ، لە تەك حاکمی کرماشانا بۆ جێی هاوینەیان طەرەفی دالاهــۆو ئەطرافی سەرمیلو کرنو سوورەدزە ، بۆیان رێئەخـاو ، موددەتـی سێ ساڵ محەمەدپاشا بە خۆیو جافەوە لە ژێر ئیـدارەی وەزیـری بەغـدادا بوون ، لە بەینی ئەم موددەتەدا ئەطرافی سلێمانیو شارەزوور ، بە واسیطەی تەعەڕوضی جافەوە ، لە زەحمەتێکی زۆرا ئەبن • ئەحمەدپاشا ئەکەوێتــە پەلەپەل بە خۆیو هەیئەتی حوکوومەتەکەی لە تەك دووهەزار سواردا دێتە

گردی شێروانە • عەزیزئاغای • مەصرەف ئەنێرێتە ماڵی محەمەدپاشا لە جەبەلی شارەبانو محەمەدبەگی قادربەگ لە تەك كوڕەكانیا ئەوانیش لەتەكخۆیدا ئەهێرێت بۆ شێروانە •

عەزیزئاغا كە ئەچێتە مالی محەمەدپاشا زۆر پەلەپەل ئەكا لەتەك محەمەداپاشادا ئیقناع نابێ كە بێتە لای ئەحمەدپاشاو ، جوابی كاغەزی ئەحمەدپاشا ئەنووسێتەوە : « من دەستم لە خاكی بابانو شارەزوور هەلگرتوە بۆ خۆتو خالۆت » !

ئەحمەدپاشا دووبارە عەزیزئاغا لە تەك عەزیزبەگی مامیو محەمەدبەگی قادربەگو ، هەر چوار كوڕەكەی بە كاغەزی دڵخۆشییو تەئمینەوە ئەنێرێتەوە لای محەمەدپاشا ، ئەنووسێ :

« من ئەگەر خراپەیەكم كردبێ بەم خراپەی خۆمە ئیقرار ئەكەم • بە هەرچە تۆ تەئمین ئەبی ئەمین بە من لە خاكی بابان هەرچە تۆ گەرەكت بێ من نامەوێ • ئەوا محەمەدبەگو ئامۆزاكانتم ناردەوە ، ئەگەر خۆشت نایەی با ئەوانیش لەوێ بن » •

عەزیزئاغا ، كە پیاوێكی زۆر زیرەكو عاقڵ بوە ، بە هەر نەوعێ ئەبێ محەمەدپاشا ئیقناع ئەكا دێتە لای ئەحمەدپاشا ، ئەمما لەشكرێكی زۆر گەورە موقابیل بە لەشكرەكەی ئەحمەدپاشا لە تەك خۆیدا دێنێ • وەقتێ كە لەتەك ئەحمەد پاشادا یەك ئەبینن ، ئەحمەدپاشا پێی ئەڵێ : من زۆرم پەلەپەل كرد كە تۆ بفەوتێنم ، ئەمما جیلوەی طالیعێ لە ناوچاوی تۆدایە ، نەك بە من ، لە منیش گەورەتر نایكوژێنێتەوە ! ئەمما شەرت بێ تا من بمێنم هەرچە تۆ پێت خۆش بێ من ئەوە بكەمو ، تۆش لەمەولا بە خیلافی رابوردووەوە موعامەلە بكە •

لەیەك رازیی ئەبن ، ماڵی محەمەدپاشا لە تەك عوموومی جافدا ئەپەڕنەوە بۆ جێی خۆیانو ، عەزیزئاغاش هەر لەم سەفەرەدا كچی

عەبدوڕەحمان ئاغای بارچاوەش ، کە برازای ئەبێ بۆ محەمەدپاشای مارە ئەکاو ، لەو لچە سیمانبەگو محەمەدعەلی بەگ ئەبێ • ( بەحتیان لە وەقتی خۆی دائەگرێو) محەمەدپاشا لە پاش ئەم سەفەرە لە هاتەوە حراپەیێکی لەناو جافو شارەرووردا بوو ، نەماو ئەچێتە مالی ئەحمەدبەگی وەلەدبەگ دلخۆشیی ئەداتەوە ، هەم خزمی ئەبێو ، لە لایەکیشەوە زاوای ئەبێ ، وە خوشکێکی محەمەدپاشا ژنی ئەبێ • ئەو گرتنی محەمەدپاشایە لە دڵ دەرئەکا ، وە ئەڵێ بە محەمەدپاشا : من بەمە ئیفتیخار ئەکەم کە لە بەگزادەی جافدا پیاوی وەکوو تۆی وا تێدا ، ئەگەرنە خۆت ئەزانی من بۆ هیچ کەسێکی تر سەرم دانەنەوانوە • (في الواقع) ئەحمەدبەگ ئازاترینی زەمانی خۆی بوە • محەمەد پاشا تاکو ئینقیراضی پاشاکانی بەبە ، کە ساڵی هەزارو دووصەدو حەفتاو چواری هیجریی بوە •• ئیدارەی عەشیرەتی جافو شارەزووری کرد •

حوکوومەتی تورك کە سلێمانی گرت ، وە وڵاتی بابان کەوتە ژێر ئیستیلای تورکەوە ، ئەوانیش ئیدارەی محەمەدپاشایان تێك نەداو هیچ تەکلیفێکیان لە جاف داوا نەکرد • تاکوو زەمانی عومەرپاشای سەردار ، کە دەستووری موکەڕەم بوە لە طەرەفی خەلیفەی عوثمانیوە ، بە لەشکرێکی زۆرەوە دێتە شارەزوور ، محەمەدپاشا بانگ ئەکاتە مووان ، ئەچێتە ئەلای، بە محەمەدپاشا ئەڵێ : من هاتووم بۆ تەشکیلاتی شارەزوورو سلێمانیو خاکی بابان • لازمە جاف کە داخڵی ئەم خاکەیە رەسمێکی بۆ دابنێین •

محەمەدپاشا ئەڵێ : ئێمە خۆمان سی ماڵ بەگزادەینو هەزار سوار خزمەتکارو تەبەعەمان هەیەو ، ئەم عەشیرەتە ، کەپێیئەڵێن جاف بۆ خۆمان لە خاکی ئێران هاوردوومانەتە خاکی بابانەوەو ، ئێمە ئیدارەمان وا بەسەر ئەمانەوە ، کە تۆ داخڵی رەسمت کردن بۆ حوکوومەتی عوثمانیی ، ئێمە بە چی ئیدارە بکەین ؟ ئاباءو ئەجدادی ئێمە ، کە لە ئێران بووین ، چە لە

زەمانی صەفەویداو ، چە لە زەمانی حوکوومەتەکانی پێشووی ئێراندا تەکلیفی هیچیان لە ئێمە نەکردوە • عومەرپاشا بە توندیوە ئەڵێ بە محەمەدپاشا : بە خوا جاف ئەخەمە ژێر تەکلیفەوە ، وە چاوت دەرێنم !
محەمەدپاشاش بە توندیوە موقابەلەی ئەکا ، ئەڵێ : بەخوا چاویشت دەرێنمو تەکلیفیشت نادەمێ !

کوتوپڕ لە ئۆردوودا سوار ئەبێ بە هەزارو پێنجسەد سوارەوە ئەگەڕێتەوە بۆ ماڵی خۆی •

مەحموودپاشای کوڕی لە عەینی ئەم گفتوگۆی عومەرپاشاو محەمەد پاشادا مەوجوود ئەبێ ، ئەمما منداڵ ئەبێو ، عەینی ئەم گفتوگۆیە خۆم لە مەحموودپاشام بیستوە • هەر ئەو رۆژە کە لە ئۆردوو دێتەدەرەوە بۆ ماڵ ، سوار تەعیین ئەکا بۆ ناو عوموومی جاف : ئەبێ ئیمشەو تا صبحەی ئێوارە عومومی جاف لەسەر سیروان حازربن ئەپەڕەوە بۆ خاکی ئێران •

میکایەلیی ، کە لە شارەزووردا کەوتوونەتە طەرەفی سلێمانیوە ، ئەوانیش وەکوو جافەکانی داخلی قەزای ئەڵەبجە لە عەینی وەقتدا ئەگەنە سەر سیروان • عومەرپاشا پیاوە گەورەکانی بەبە ، کە لە پاش پاشاکانی بەبە مابوونەوە ، وەکوو عەزیزئاغای مەصرەفو ، حاجی بەگی مەصرەفو باقیی تر لە تەك عومەرپاشادا ئەبن لە مووانداا ، پێیئەڵێن : تۆ موعامەلەیەکی زۆر خراپتکرد لە تەك محەمەدپاشادا • ئەم پیاوە زۆر بە نوفووذەو ، خۆیو عەشایرەکەی دایما هان لە حودوودی ئێرانداو ، ساڵی چوار مانگیش بە تەواویی لەسەر خاکی ئێران دادەنیشێو رابیطەی سیاسەتی لەتەك حوکوومەتی ئەردەڵانو شاهی ئێراندا هەیەو ، حوکوومەتی ئێران بە عومومی مەوجوودییەتیوە پەلەپەل ئەکا بۆ ئەم تەبەعەی قەدیمی خۆیە

که بیکاتەوە بە تەبەعەی خۆی • موحەققەق سلێمانی دانامەزرێ محەمەدپاشا لە خاکی ئێراندا بێ‌و ، سلێمانی ئەبێتەوە بە عەلاوەجاتی ئێران •

عومەرپاشا زۆر پەشیمان ئەبێتەوە لەو موعامەلەیە ، یەکێ لە پیاوە گەورەکانی خۆی لە تەك عەزیزاغادا ئەنێرێ بە شوێن محەمەدپاشادا . زۆر تەئمینات ئەدەن بە محەمەدپاشاو ، محەمەدپاشا دووبارە ئەبەنەوە لای عومەر پاشا ئەمووان • ئەم دەفعەیە زۆر حورمەتی ئەگرێ‌و روتبەی میری میرانی بۆ جەلب ئەکاو ، تەشکیلاتی قەزای ئەڵەبجەی بە قایمەقامیی بۆ ئەکا • بە صوورەتی مەحەببەت ئەڵێ : ئێوە ئیسلامن‌و حوکوومەتی عوثمانیش خەلیفەی ئیسلامە • ئیمڕۆ جافیش ئەگەر بە ئیسم ، بۆ چاوی خەڵق‌و عەشیرەتەکانی تر ، لە ویلایەتی موصڵدا ئەگەر جوزئیی رەسمێکی بەسەرەوە بێ زۆر چاکە • محەمەدپاشا کە رازیی ئەبێ لە عومەرپاشا پێی‌ئەڵێ : جاف لە کوردستانداو ، شامار لە قیطعەی عەرەبستاندا هاوموقابیلی یەکن • ئەوان چە تەکلیفێ ئەدەن بە حوکوومەتی عوثمانیی ئەمانیش ئەیدەن • عومەرپاشا ئەڵێ : شامار چڵ‌یەك لە مەڕو وشتر ئەدەن ، محەمەدپاشاش ئەڵێ : جافیش چڵ‌یەکی مەڕو بزن ئەدەن • رەسمی چڵ‌یەکی مەڕو بزنیان لەسەر دائەنێن ، ئەم رەسمە لەناو جافدا دەوامی کرد تا ئینقیلابی عوثمانیی‌و هاتنی ناظم‌پاشا ، محەمەدپاشا بە قایمەقامیی ئەڵەبجەو ریاسەتی جاف ماوە تا هەزارو دوو صەدو نەوەدی هیجریی • لەو تەئریخەدا والیی بەغدا مەحموودپاشای کوڕی ، کە بەسەر جافەوە گەرمیان‌و کوێستان ئەکا وە ئەگەڕێ‌و ماڵی لە قەڵای شێروانەدا ئەبێ ، لە وەقتی زوستاندا تەلغراف ئەنووسێتە شوێنی بۆ بەغدا •

مەحموودپاشا ئەچێتە لای بۆ بەغداو یەك دوو کوێخایەکی شاتریی ، کە خزمەتکاری ئەبن لە تەکیا ئەبن‌و ، یەکێ لەو کوێخایانە تورکیی زۆر چاك ئەزانێ•مەحموودپاشا کە ئەچێتە لای والیی، والیی پێی‌ئەڵێ : ئەم عەشیرەتی

جافه ، قیسمی گەڕیاویان ، حوکوومەت دانیشتنیانی زۆر مەطلەبەو ، ئەراضیشیان ئەداتێ بە طاپۆ بە شەرتی دانیشتن . مەحموودپاشا ئەڵێ‌پێی : من صوورەتی راستیی بە تۆ ئەڵێم : ئەم عەشیرەتە دانانیشن‌و ، مەحموود پاشا حەقانییەتەکەشی ئەڵێ . ئەو کوێخا شاتری‌یە لە بەردەمی قاپیی ئۆدەی والیدا ئەبێ ، لە دەرەوە لە گفتوگۆی والیی‌و مەحموودپاشا حاڵیی ئەبێ .

وەقتێ کە مەحموودپاشا ئەگەڕێتەوە بۆ شێروانە ئەویش ئەچێتەوە ناو طایفەی خۆی دە دوانزە کوێخایەکی شاتریی ئیقناع ئەکاو ، ئەچنە خانەقی لای قایم‌مەقامی خانەقی ، کە ئەحمەدبەگی قادرپاشای بەبە ئەبێ‌و ، ئەحمەدبەگیش بە حەسەبەی بابانیوە کە حوکوومەتی عوثمانیی حوکمداریی بابانی تێکدابوو ، محەمەد پاشاش لە خاکی باباندا لە پاش بابان مەوقیعێکی زیاتر لە پێشووی خۆی دەستکەوتبوو ، لە محەمەدپاشاو کوڕی محەمەدپاشا عاجز بوون ، ئەگەرچە ناحەقیشیان بوو ، حوکوومەتێکی وەکو خەلافەتی ئیسلامیی بە محەمەدپاشا مەنع نەئەکرا ، هەر ئەوەی پێ‌ئەکرا کە مەوقیعی عەشیرەتەکەی خۆی موحافەظە بکا دەستخۆشی رۆزگار نەبێ .. ئەحمەدبەگ ئیشیان بۆ رێك ئەخاو تەلغرافیان بۆ ئەنووسێ بۆ والیی بەغدا ، ئەمانە ئەڵێن : ئەگەر حوکوومەت ئەراضیی بدا بە ئێمە دائەنیشین . حوکوومەت بەعزێ ئەراضیی بۆ ئەوان مەخصووص ئەکا .

مەحموودپاشا لەم موعامەلە دڵگیر ئەبێ ، کاغەز ئەنووسێ بۆ محەمەدپاشای باوکی لە ئەڵەبجە . ئەویش جوابی ئەداتەوە ئەڵێ : هیچ موعامەلەیێ لەتەك جافەکانا مەکە تا وەقتی بەهار ئەگەڕێتەوە بۆ هەڵەبجە وەضعییەتی جاف کەمێ تێك ئەچێ ، لە وەقتی بەهاردا کە ئەچنەوە شارەزوور لە شەك‌مەیدانی بەرامبەر شەمێران ، کە ها بەسەر سیروانەوە ، پشتماڵە لەوێ ئەبەزێ . محەمەدپاشا لە ئەڵەبجەوە دێتە ئەناو پشتماڵە . ماڵی مەحموودپاشاو کوڕەکانی بەگزادەی بارام‌بەگی وەلەد بەگیی گشتی دێنە

لای ، پێیان‌ئەڵێ : حوکوومەتی تورك فکری تێکچوە لە تەك ئێمەداو .
ئێمە لە کوردستان‌دا بەم نەوعە ئیدارە ناکەین ، وە بۆشمان مومکین نابێ
بچین بە گژ حوکوومەتی عوثمانی‌دا وە لە خاکیدا بین . لازمە ئێمە بچینەوە
خاکی ئێران . ئەم خزمەتە کە بە حوکوومەتی تورکی بکەین بە حوکوومەتی
قاجاری بکەین چیمان لێرە ببێ لەوێ زیاترمان ئەداتێ .

مەحموودبەگی عەبدوڵلائاغا ، کە لە تاقمی مەحموودبەگی صاحیبقەرانە
دایکی ئەوو دایکی محەمەدپاشا ، کە کەنیشکی محەبەدگی مووسابەگـــی
خورماڵ ، کە بەگزادەی تەقی بەگین ئەبن (١٦) .. خوشك‌ئەبن . لە پاش
ئینقیراضـی بەبە بـە حەسـەبەی خزمایەتیـوە دێتـە لای محەمەدپاشـاو ،
محەمەدپاشاش وەکوو کوڕەکانی خۆی لە پشتماڵەیا ماڵو جێگەو ڕێگەی
بۆ دائەنێ . ئـەڵێ بە محەمەدپاشـا : رجا ئەکـەم تۆ ئـەمڕۆ ئەووەڵـەن
قایم‌مەقامی لە ئەڵەبجەو ، دوەم صاحێبی شەصت حەفتا هەزار تەغار گەندمو
جـۆو چەڵتووکـی لە شارەزووردا . ئەم عەمارانە کە قیمەتی سی‌هـەزار
لیرەی عوثمانی‌یە .. ئەمانە بکە بە پارە ، ئـەو وەقتە ئەگەر حوکوومەتـی
عوثمانیی موعامەلەیان چاك نەبوو ئێرانمان لە دەست دەرناچێ محەمەدپاشا
پێی‌ئەڵێ : ئەگەر عەمارەکانم گشتی پڕ بێ لە ئاڵتوون رۆژێ بە ئەسارەتەوە
قەبووڵ ناکەم ! حوکوومەتی تورك قسەی چوار ژێردەستەی خۆم بخاتـە
ئەسەر قسەی من !؟

هەر ئەو رۆژە ئەمر ئەدا بە پشتماڵەکان : هەر کەس چەند زەخیـرەی
بۆ هەڵئەگیرێ بچن بی‌هێنن بـۆ خۆتانو ، صەدانییو بەداخیش ، کە لـە
خاکی ئێران‌دا ئەبن ، کاغەزیان بۆ ئەنووسێ لە جێی خۆتان بمێننەوە تاکوو
من خەبەرتان لێ‌ئەگێرمەوە مەپەڕنەوە بۆ ئەمبەر .

---

(١٦) ئەم (ئەبن)ە زیادە .

له پاش حەوت ڕۆژ پشتماڵەکـان ئەچنە شـەمێران ئەسـەر کـەژی زمناکۆو • محەمەدپاشاش لە ئەڵەبجەوە ئەچێتە ناو پشتماڵە • مەحموودپاشا ئەڵێ بە محەمەدپاشا : من ئەچمە بەغدا ئەمڕۆ حوکوومەتی تورك ئەمـری تەشکیلاتی طاپۆی داوە • هەم ئەراضیی ئەسێنـم‌و هەم خزمـەت بـە حوکوومەتی عوثمانیی ئەکەم • مەحموودپاشا ئەگەڕێتەوە بـۆ بەغـداو ، محەمەدپاشا ئەچێتە زمناکۆو ، لەوێوە خۆی‌و قادربەگی ڕۆستەم‌بەگ ، کە لەو وەقتەدا ڕەئیسی فیرقەی وەڵەدبەگیی ئەو ئەبێ ، بە صـەد سـوارەوە ئەچێتە کرماشان لای شاهزادە (عماد الدولە) حاکمی کرماشان • تەلغـراف ئەنووسن بۆ خزمەت شاهی ئێران (ناصرالدین) شاهو شاه جواب‌ئەداتەوە :

ئەووەڵەن : چی لازمـە بۆ محەمـەدپاشا ، بۆ خـۆی‌و عەشـرەت‌و تەبەعەی لە ویلایەتی کرماشان‌و سنەدا بۆی جێ‌بەجێ بکـەن‌و ، محـەمەد پاشا خۆشی لە پاش دامەزرانی ئەبێ بێ بۆ طەهران • هەر لە کرماشانەوە ئەمری عومومی جوانڕۆ لەتەك عەشایری جافی جوانڕۆدا بۆ ئەنووسێ ، ماڵیان ئەچێتە جوانڕۆو ، ئەچنە کوێستانی شاهۆو بەنی‌گەزو کڕێوە •

له پاش دامەزرانن ئەو قیسمە عەشایرەی کە لە تەکیا ئەبێ محەمەدپاشا بە پەنجا سوارەوە ئەچێتە خزمەت شـــا بۆ طەهران • لە طـەرەفی شـاوە ئیستیقبالی ئەکەن‌و ، لە ماڵی وەزیر یەحیاخان‌دا میوانیی ئەکا ، بە لوطف‌و گەورەیی خۆی مەرحەمـەتێکی مولووکانـەی لە تەکا ئەکـاو ، زۆر زۆر ئیحتیرامی ئەگرێ‌و ، گەلێ شەو لە سەر سفرەی خۆی حازری ئەکا •

فرمانی ریاسەتی عومومی عەشیرەتی جافی ئێران لەتەك عومومی جوانڕۆداو قەصری شیرین‌و زەهاب‌و هۆرێن‌و شێخـان تاکو حـودوودی عوثمانیی کە سیروان بوە ، وە لە تەك مانگی حەوت‌هەزار تمانا بۆ خۆی‌و شەش کوڕی‌و بـەگزادەی بارام‌بـەگیی‌و وەڵـەدبەگیی •• ئەنووسـێ‌و ، سی‌وهـەشت قیطعە فرمانی پادشـاهی لـە لای خـۆم مەوجـوودە ، وە

خەنجەرێکی مورەصەع لە تەك عەبایێکی شاڵتورمە کە یەخەکەی جەواهیربەند ئەبێو ، کتێبێکی خەطی صوورەتداری عەجایبی کۆنی ئەداتێ • وە ئەو کتێبە لە تەئریخی نۆصەدوبیستو حەوتی میلادیی دا لە ماڵی خۆما بوو ، محەمەدبەگی برام بردیە بەغدا فرۆشتی بە شەش‌هەزار روپیە •

وە محەمەدپاشا زۆر بە مەسروورییی ئەگەڕێتەوە ئەماڵی خۆی ئەجوانڕۆ • محەمەدئەمین بەگی یەعقووب‌بەگ کە ئامۆزازای ئەبێ ، لە وەکالەتی خۆیەوە لە قەصری شیریندا دایئەنێ • رێگەی قەصر تا حودوودی خانەقی موحافەظەی لە عۆدەی ئەودا ئەبێ •

عەشایەری جاف ، کە لە سلێمانیو ئەمبەرەوە بەجێ ئەمێنن ، کۆمەڵ‌ـکۆمەڵ ئەپەڕنەوە بۆ لای محەمەدپاشا ، لە پاش دووساڵ مانەوەی محەمەدپاشا لە جوانڕۆ عەشیرەتی تەرخانیی کاغەز ئەنووسن بۆ محەمەدپاشا کە : ئێمە بە عوموم لە کوێستانەوە تێین بۆ لای تۆ ، دووسێ بەگزادەو میقدارێ سوارمان بۆ بنێرە • محەمەدپاشاش عوثمان‌پاشاو حەسەن‌بەگو سلێمان‌بەگ ، کە کوڕی ئەبنو ، قادربەگی بارام‌بەگ ، کە ئامۆزای ئەبێو ، رۆستەم‌بەگی سەعیدبەگ ، کە رەئیسی بەگزادەی وەڵەدبەگی جوانڕۆ بوەو مامەی بەهرام‌بەگی فەتاح‌بەگ بوە ، کە ئەمڕۆ رەئیسی وەڵەد بەگی جوانڕۆیە ، ئەویش بە سی سوارەوە ئەخاتە تەکیان ئەیان‌نێرێ بە شوێن تەرخانیدا •

محەمەدبەگی قادرپاشا ، کە لە دوای محەمەدپاشا قایم‌مەقامی ئەڵەبجە ئەبێ ، ئەم خەبەرە ئەزانێ ، ئەچێتە پێنجوێنو حوکم ئەکا لەو جافانەی کە لەمبەرەوە ماونەوە : ئەبێ نەیەڵن ئێلی تەرخانیی لە تەك ئەم بەگزادانەدا بڕواو ، بچن بە گژیانا • بەگزادەکان بە لەشکرەوە ئەگەنە خوسرەوخان ، کە کەژێکە لە خوڕخوڕەی ئێراندا ، لەشکرێکی زۆر گەورە ، کە دە

ئەوەندەی ئەوان زیاتر ئەبن ، لە ناوەقتدا ئەچنە سەریان ، بەگزادەکـان
لونوپر ، لە تەك ئەو لەشکرە ئەمەدا ، بۆیان سوار ئەبن ، ئەبێ بەشەڕیان
لەشکەرەکەی جاف ئەشکێنن • ئەوڕەحمان خوسرەو ، لە رەئیسی فیرقەی
رۆغزاد لە رۆغزادیی ئەبێ ، ئەیکوژن و ، ئاکەخان سمایل رەئیسی فیرقەی
سمایلیی لە رۆغزادیی رانی ئەشکێ و ، نزیکی چل کەس زیاتر لێیان ئەکوژن •
بە راستیی لەو شەڕەدا حەسەن بەگی محەمەدپاشا لەتەك ئەو تاقمە کەمەی
پشتمالەو عەمەلەدا ئازادیی ئەگەیەنێتە دەرەجەی نیهایەت ، عومومی ئێلی
تەرخانیی بار ئەکەن ئەیبەنە شاهۆ لای محەمەدپاشا •

دوای ئەم شەڕە لە سالی هەزارو دووصەدو نەوەدو چواری هیجریدا
جافی ئەمبـەر زۆر کەمیـان ماوە ، هەموو چوونـە لای محەمەدپاشـاو •
محەمەدپاشا بە یەك دەفعە صەرفی نەظەری لە هاتنەوەی خاکی عوثمانیـی
کرد • لە سالی هەزارو دووصەدو نەوەدو پێنجی هیجریدا مەحموودپاشا
کە بە مالەوە لە بەغدا ئەبێ و ، محەمەد پاشاش کۆمەل ـ کۆمەل لـەوبەرەوە
پارەی بۆ ئەنێرێ و قزراباط و زەهاوییەو دەککە لـە قـەزای خانـەقیدا •
سەرقەلاو کۆکس لە قەزای کفریدا ، ئاوبارەش لە لیوای سلێمانی •• ئەم
موقاطەعە گەورانە ئەسێنێ • محەمەدپاشا فکری وا ئەبێ سیان لە کوڕەکانی
تری بنێرێتە لای مەحموودپاشاو ، چەند موقاطەعەیەکی تر بسێنێ ، خۆی و
سێ کوڕی لە ئێراندا بن و چوار کوڕی لە خاکی عوثمانیدا بن •

والیی بەغدا ، کە تەحسین پاشا ئەبێ ، کە تێ ئەفکرێتە وەضعیەتـی
لیوای سلێمانی و کەرکـووك کـەوا یـەك دەفعە لـە جـاف خالیی بووەو ،
سیاسەتی ئێران رووی تێکردوە •• خەبەر ئەدا بە ئەستەموول لەوێوە لـە
طەرەفی صەدارەتی عوظماوە جوابی ئەدەنەوە کە : بە هەر نەوعێ ئەبـێ
محەمەدپاشا رازیی بکەو بیهێنەرەوە • ئەویش مەحموودپاشا لە بەغـدادا
ئەبێ ، بانگی ئەکا پێی ئەلێ : بەهەر نەوعێ کە بۆت ئەکرێ محەمەدپاشای

باوکت ئیقناع بکه که بێتەوە خاکی عوثمانیی • مەحموودپاشا ئەڵێ : من ناتوانم قەول بدەم بە تۆ کە من بۆم ئیقناع ئەکرێ •

والیی زۆر پەلەپەل لە تەك مەحموودپاشـادا ئەکـاو مەحمـوودپاشا مەجبوور ئەکا ئەچێتە ماڵی محەمەدپاشا لە دەشتی دوورِوو ، کە ئەچێتـــە ئەوێ زۆر لە تەك محەمەدپاشادا تەلاش ئەکا رازیـی نابێ بەهاتنـەوەو ، ئەڵێ بە مەحموودپاشا : من تۆم بە کورِێکی صاحیب غیرەت ئەزانی ! لـە پاش چل ساڵ خزمەت بە مەئموورینی تورك جەزایان بۆ ئێمە ئەمە بوو بە قسەی چوار پیاوی درۆزنی بێ‌ئەهەمییەت حوقووقی ئێمـەیان فـەرامۆش کرد ! ئیستە من لە خاکی ئێراندا دە هەزار ماڵی جافی ئێران بە ئەمرو فرمانی پادشایی تەسلیمم کراوەو ، لە جافی موورادیی ، کە لە خاکی عوثمانیدا بوون، دە هەزار ماڵیان گەرِیاوو دانیشتوو لـە تەك قەصـری شیـرین‌و زەهـاوو جوانرِۆ ، کە بە قەد لیوای سلێمانی بەزیادەوە ئەبێ‌و جێگەی ئاباٸو ئەجدادی خۆمانەو ، لەتەك مانگی حەوت‌هەزار تمانا •• ئەمیانە داومێ • پادشایەکی وەکوو (ناصرالدین‌شا)بەم هەموو لوطف‌و مەرحەمەتەوە کە لە تەك مـــندا هەسی هیچ وەقتێ من پشت ناکەمە ئەم وەلی نیعمـــەتی بێ‌منەتـە • تاکـو ئەمرِۆ سی هەزار لیرەم بۆ تۆ ناردوە داوتە بە مولك بۆ خۆت ، بیست‌هەزار لیرەی تریش بۆت ئەنێرم[17] ، دوان لە کورِەکانی ترم ئەنێرمە لات ، تۆش کە ئەم لوطفە لە حوکوومەتی عوثمانیی ئەگێرِیتەوە ، ئەگەر راستە ئـەوە مۆلکی زۆر بۆت پەیدا کراوە خزمەتیان بکەو ، ئەو جێگـەو رێگـە کـە بەدەست منەوە بوە لە تەك ئەو باقیی عەشایرەدا ماوەتەوە لە خاکی عوثمانیی بیدەن بە تۆ من نامەوێ •

مەحموودپاشـا بە مەئیـووسیی ئەرِواتـەوە بۆ بەغـدا ، قسـەکانی محەمەدپاشا ئەڵێ بە والیـی • والیـی دووبـارە لە تـەك مەحموودپـاشادا

---

(١٧) (لیرەی تریشت بۆ ئەنێرم) کوردانەترە •

دەستئەکا بە گفتوگۆو ، ئەمری صەدارەت کە دێت بۆی ئەخوێنێتەوە •
ئەڵێ : مەقصەدی گەورەی حوکوومەت ئەمەیە کە ئەم میللەتە
نەبێ بە تەبەعەی ئێران • هەرچی محەمەدپاشا لە حوکوومەتی عوثمانیی
طەڵەب ئەکا من تەعەهود ئەکەم کە بۆی جێبەجێ بکەم •

دووبارە مەحموودپاشا ئەنێرێتەوە بۆ لای محەمەدپاشا • مەحموود
پاشا لە تەك محەمەدپاشادا ئەم دەفعەی دوەمە زۆر پەلەپەل ئەکا • دووبارە
ئیقناع نابێ • دووبارە ئەگەڕێتەوە بەغدا • دەفعەی سێیەم والیی بەغدا
لە تەك والیی کەرکووكداو مەظهەرپاشای موتەصەڕیفی سلێمانیی دێنە
کانیچەقەڵو ، مەحموودپاشا ئەنێرنە گۆڕەشەلە ، کە ماڵی محەمەدپاشا
لەوێ ئەبێ ، مەحموودپاشا بە محەمەدپاشا ئەڵێ : چیت مەطڵەبە بیخەرە سەر
کاغەز ئەگەر دروستیانکرد باشە ، نەیانکرد دانیشە بۆ خۆت • محەمەد
پاشا ئەڵێ بە مەحموود پاشا : من هیچ طەڵەبێکم لە حوکوومەتی عوثمانیی
نیەو ، خاکی ئێرانم پێخۆشە ، نایەمەوە • مەحموودپاشا سوێن ئەخوا
ئەگەر بێتو ئەم دەفعە من بە مەئیووسیی بنێرێتەوە خۆم ئەکوژم ! ئەم
هەموو پیاوە گەورانەی عوثمانییە بە واسیطەی منەوە هاتوونو ، من رووم
نیە بچمەوە ئەلایان •

بە عەبدوولاپاشاو بەعزێکی تر لە بەگزادە محەمەدپاشا ئیقناع ئەکەن :
قایمەقامیی هەڵەبجە وەکوو سابیق لە تەك ریاسەتی جافداو ، ئەو
ئەراضییانە کە بە شەرتی دانیشتن درابوون بە بەعزێ لە جاف ••
ئەوراقی ئەمانە تەسلیمکردنی بە محەمەدپاشا ئەخاتە سەر کاغەز ئەیدا بە
مەحموودپاشاو ، مەحموودپاشایش ئەیبا بۆ والیی بەغدا ، ئەویش
(ارادەی سنیە)و ئەمری (صەدارەت) بۆ جێبەجێکردنی ئەم طەلەبانە جەلب
ئەکاو ، لە موددەتی حەوت رۆژدا ئەیدەن بە دەست مەحموودپاشاوە ،
ئەویش ئەیبا بۆ محەمەد پاشا ، محەمەدپاشاش یەتەوە خاکی عوثمانیی ،

ئەگەر چی زۆریشی پێناخۆش ئەبێ • تاکوو تەئریخی هەزارو دووصەدو نەوەدو نۆ ئیدارەی جافی ئەلەبجەی کرد •

قیسمێ لەو جافانە کە خیانەتیان کردبوو بە ئەو گرتنی ، دووسێیەکیان لە حەبسی خۆیدا مردن • ئەوانیش لەم مەسئەلە موتەئەثیر بوون ، بە فیتنەی بەعزێ ئەشخاصی تریش تەحریکاتی لەناوداکردن‌و ، ئەتوانم بنووسم عوموومی جاف – قیسمێکی کەمی نەبێ – لە تەکیانا قسەی بوو • لە عەینی تەئریخدا ، لە وەقتی بەهار محەمەدپاشا بە میقدارێکی کەم سوارەوەو فەتاح‌بەگی کوڕی لە تەکیا ئەبێ ، ئەچێتە چیمەنی برایمسەمین • ئەو فیرقەی جافە لە شاتریی ، کە پیاوەکانیان لە حەبس‌دا ئەمرێ ، مالیان لە چیمەن ئەبێ‌و نیەتیان خراب ئەبێ • بە محەمەدپاشا ئەم خەبەرە ئەدەن[18] • محەمەدپاشا ئەهمیەتی ناداتێ • ئەلێ : جاف خیانەتی وا لەتەك منا ناکەن‌و ، ناتوانن جەسارەتی وا بکەن !

گەورەی ئەو فیرقە لە تەك سەد سوارا دێت بۆ لای محەمەدپاشا بەم فکرە ئەگەر بتوانن دەست‌بوەشێنن • وەقتێ کە تێن ئەڕوانن فەتاح‌بەگی کوڕی بە هەشتا سواری محەمەد پاشاوە وا لە لای ، کە ئەمە ئەبینن قورئانێ ئەبەنە لای محەمەدپاشا دایئەنێن ، عوموومیان دەسی پیائەدەن ئەلێن : ئەمە فیتنەی جافە ، وە ئێمە لەمە بەرین‌و خەبەرمان نیە ، ئێمە عەبدی تۆین‌و عەبدیش لە تەك صاحێبی خۆیدا ناتوانێ خیانەت‌بکا • بە عوموووم دەست‌و پێی ماچ ئەکەن کە ئەم بوختانە بۆیان کردەوین لە دڵ دەربکە • محەمەد پاشایش پێیان‌ئەلێ : من هیچ وەقت خەیالی وا لە ئێوە ناکەم • ئەڕۆنەوە بۆ مالی خۆیان •

---

(١٨) (ئەم خەبەرە بە محەمەدپاشا ئەدەن) رەوانترە .

محەمەدپاشا هەر ئەو رۆژە فەتاح بەگ لە تەك حەفتا سوار لە سوارەکان ئەنێرێتەوە بۆ پشتماڵە ، ئەڵێ : خۆیشم بەیانیی ئەچمە کفریی ، والیی کەرکووك بۆی نووسیوم چاوم پێ بکەوێ • هەرچەند فەتاح بەگ تەلاش ئەکا با ئیمشەو بمێنمەوە بەیانیی لەتەکدا یێم تا کفریی ، من نایێمە شار ، چونکە ئەجەلی پێوە ئەبێ فەتاح بەگ بەزۆر ئەنێرێتەوە دە سواری خدمەتچیی‌و قۆشچیی لای ئەمێنێتەوەو ، فیرقەکە چوارصەد ماڵ ئەبن‌و پێیان ئەوتن : کەرەم‌وەیسیی • ماڵیان عوموووم نیوسەعات لە خێوەتی محەمەدپاشاوە دوور ئەبێ ، چاویان بە لەشکرەکەی فەتاح بەگ ئەکەوێ کە ئەڕواتەوە بۆ پشتماڵەو ، پشتماڵەیش لە ژاڵەی سەفەر ، کە مەوقیعێکە لە کانیی چەقەڵ ، کە نۆ سەعات لە چیمەنەوە دوورە •• بەفرصەتی ئەزانن ئەچنە ئەسەر محەمەدپاشا هەر ئەو شەوە ئەیکوژن ، لە کوڕەکانی مەحموودپاشاو عوثمان‌پاشا لە سلێمانی ئەبن‌و ، حەسەن‌بەگی کوڕیشی لە ئەڵەبجە ئەبێ • سلێمان‌بەگ‌و ، محەمەد عەلی‌بەگ‌و ، قادربەگ‌و فەتاح بەگ ، ئەم چوار کوڕەی لە پشتماڵە حازر ئەبن • بەیانیی لە سەعات سێدا خەبەری کوشتنی محەمەدپاشا ئەزانن • بە لەشکری پشتماڵەو ، عەمەڵەو ، لەشکری پشتماڵە عەبدوڵڵاپاشا رووبەچیمەن ئەڕۆن‌و ، لێشیان مەعلووم نابێ ئەمە عومووومی جاف داخڵە یا داخڵ نیە • شەشصەد سواریان لە تەکدا ئەبێ• وەقتێ کە ئەگەنە جەبەڵی شاکەل لەشکری تەرخانیی‌و رۆغزادی‌یان چاو پێ ئەکەوێ ، خۆیان حازر ئەکەن بۆ شەڕ لەتەکیانا ، کە تێ ئەفکرێن ئەوان لەمان زووتر خەبەریان وەرگرتووەو ، چوون جەنازەی محەمەدپاشایان هاوردوە •

هەر لەوێدا عوموومیان دائەبەزن‌و تەلاق ئەخۆن ئەڵێن : ئێوە لەم ئیقدامە دەستهەڵگرن ئێمە هەڵی‌ناگرین • جەنازەکە بە چەند سوارێکەو ئەنێرێتەوە بۆ پشتماڵە ، خۆیان ئەڕۆن بۆ سەر ئەو فیرقە • ئەوانیش کە

ئەم موعامەلە ئەکەن ئەچنە ناو گەلالیی ، بە ئزادەی گەلالیی ئەیاندەنە بەر تفەنگ دەریان ئەکەن • روو بە رۆغزادیی بار ئەکەن کە بچنە ناو ئەوانەوە ، ئەوانیش بەخۆیانەوە پیس بەکەن • حەبەریان نابێ لە ئەمە لە رۆغزادیی وان لە ناو لەشکری بەگزادەدا ، بە یەك دەفعە لەشکری پشتمالەو تەرخانیی‌و رۆغزادیی ئەرژێنە ناو کۆچ‌و ماڵیان ، بە تەواویی تالان‌ئەکرێن • خۆیان‌و ژنیان خەلاص ئەبن ، بەسەڵتەسوارە ئەچنە چەمچەماڵ ئەلای بەگزادەی هەمەوەند • تاقمی فەقێ‌قادر جوابیان ئەدەن ، لەوێ ئەچنە داری‌کەلیی ئەماڵی جوامێر •

جوامێر پێیان ئەڵێ : لە ناو عوموومی هەمەوەندو عەشایرەکانی خاریجی جاف خۆم بە جانفیدای محەمەدپاشا زانیوە ، ئێستە کە پەناتان هاوردوە من دەرتان ناکەم‌و ، نایشتوانم موقابەلەی کوڕی محەمەدپاشاو جاف بکەم ، هەر وەکوو ئێوە فیرار بوون منیش لە تەکتانا فیرار ئەبم ، ئێوەش بۆیە هاتن منیش دووچاری نارەحەتیی بکەن‌و ، ئەم خەبەرە سەید ئەحمەدئاغای کفریی بە تەلغراف ئەیدا بە مەحموود پاشا لە سلێمانی •

مەحموود پاشایش لە تەك عوثمان پاشادا لە سلێمانی خەبەر ئەنێرن بۆ حەسەن‌بەگ لە ئەڵەبجە ئەویش لەشکری نەورۆلیی‌و شارەزوور هەر ئەو رۆژە سێسەد سواری لەتەك خۆی‌دا ئەبا بۆ لای مەحموود پاشاو، عوثمان‌پاشا ، لە قڕگەی سلێمانی ئەگاتە مەحموودپاشا ، عوثمان پاشا وەقتێ کە تەلغرافەکە ئەبینێ ئەوەندە ئەسەف ئەخواو ئەم موعامەلەی لە لا ناخۆش ئەبێ ئەکەوێ‌و دووچاری عیللەتی (تیفۆ) ئەبێ ، کە ئێمە پێی‌ئەڵێین (گرانەتێ)و • ئەنێرنە ئەڵەبجە بەو لەشکرەوە دێنە طەرەفی نەمەڵ‌و سێ‌تەلان • هەرچە سواری بنەی رۆغزادیی‌و تەرخانیی ئەبێ ئەوانیش عەلاوەیان ئەبن‌و لەوێوە بەسەنگاودا مەحموود پاشا دێت بۆ قولیجانی سەرحەد ، حەوتسەد سواری رۆغزادیی‌و تەرخانیی عەلاوەی لەشکرەکەی

ئەکات • بەهەزارو دووصەد سوارەوە ئەچێتە کەرکووك موخابەرە لەتەك ئەستەموولدا ئەکا ، ئەمری ریاسەتو قایمەقامیی بۆ مەحموودپاشا ئەدەنو هەزار نەفەر عەسکەر بۆ ناو جاف رەوانە ئەکەن •

مەحموودپاشا لە کەرکووکەوە دێتە پێباز بۆ ناو پشتماڵەی محەمەد پاشا • مەنعی تەعزیە ئەکات • ئەڵێت : تەعزیە بۆ مردنە بۆ کوشتن نیيە • تەعزیەی کوژراو ئیقدامکردن بۆ حەقیەتیو ، پشتماڵە بارئەکەن ئەیبەنە عەنەبی پشتی ئەڵەبجەو ، لەشکرێکی زۆر گەورە لە عومومی جاف ئەخەنە رێ بۆ سەر جوامێر بۆ داری کەلییو بارۆیی ، بە سێهەزارو پێنجصەد سوارەوە ئەچنە سەری • جوامێر کە ئەم خەبەرە وەرئەگرێ لە تەك ئەو فیرقەی شاتری‌یەدا فیرار ئەکەن روو بە کەرکووك ، ئەمانیش تەعقیب ئەکەن لە طاووغەوە بە شوێنیانا ئەڕۆن بۆ دەشتی قورفە ، تووشیان نابن !

هەمەوەندو شاتریی لای قەرەخانەوە ئەپەڕنەوە ، لەشکری بەگزادەی جاف لای‌توویل کە نوقطەی کۆردەرەیە ئەپەڕنەوە ، لەشکری بەگزادە کە دێنە قزراباط حسابی لەشکری خۆیان ئەکەن هەزار سواری ئەمێنێ ، باقیی تر لەم تەعقیبەدا یا ولاخی لەکار ئەکەوێ ، وە یا ئەگەڕێتەوە • سێ شەو لە قزراباط ئەمێنن ، بۆ ئیستراحەتی لەشکرەکە • لەوێوە بە خانەقی‌دا دێنە بنکوورەو ، ئەچن بە شوێن هەمەوەندو شاتری‌دا بۆ قەصری شیرین • لای قەصردا نزیکی پەنجا سواری لەشکری رۆغزادیی چاویان بە قیسمێ لە سوارەیان ئەکەوێ ، پەلاماریان ئەدەنێ • مەحموودپاشا دەست‌ئەکا بە توندیی بەسەر ئەوانا ، ئەڵێ : ئێوە خەیاڵتان ئەمەیە قەصر تالان بکەن ، خەیاڵتان شەڕ نیە !

هەرچەند هاوار ئەکەن مەحموودپاشا بەری لەشکرەکە ئەگرێ نایەڵێ سوارێکی بڕواتو ، ئەگەڕێنەوە سەوزبولاقی بنکوورە ، کە تەحقیقات

ئەکەن ئەو سوارانە لەشکری هەمەوەندو شاتریی بوە ، بەگزادەکان زۆر لە مەحموودپاشا عاجزئەبن • هەر ئەو شەوە دوو پیاو بە قەراولیی ئەنێرنە سەریان لە زەهاو تووشیان ئەبن‌و ، ئەگەڕێنەوە بۆ ناو لەشکر • شەو لەشکر سوارئەبێ ئەچنە سەریان ، لە تەك بەیانی‌دا لە زەهاو ئەچنە جێگەی ئەوان ، کە تازە باریان‌کردوە ، بە شوێنیانا ئەڕۆن ، لە پاش نیو ساعەت تووشیان ئەبن ، شەڕیان ئەبێ‌و ئەیان‌شکێنن ، روو بە دالەهۆ فیرار ئەکەن، لە دالاهۆدا دەوریان‌ئەگرن • برای جوامێر ، دەروێش ئاغا ، ئەکوژرێ‌و ، قادرحەمەڕەشی ئامۆزاشی ئەکوژرێ • تالانیان ئەکەن‌و چل‌کەسیان لێ ئەکوژن‌و ، سەری ئەو چل‌کەسە ئەبڕن‌و ئەیهێرن لە ئۆردوودا تەسلیمی میرئالا ئەحمەدشەمسی‌بەگی ئەکەن لە شێروانە •

ئەم شەڕە ناوئەبرێ لە ناو جافدا بە شەڕی دالاهۆ • لە پاش یەك‌مانگ تەعقیب تووشیان ئەبن‌و ئەم‌شەڕە ئەبێ • مەحموودپاشاو بەگزادەکان لە شێروانەوە ئەگەڕێنەوە بۆ پشتماڵە لە عەنەب •

لە لەشکری بەگزادە حاجی قادری ئەحمەدشاسوار ، کە گەورەی فیرقەی محەمەدعەلی‌وەیسی میکایەلی‌یەو باوکی حەسەنی حاجی قادر بوە •• زامدار ئەبێ ، ئیتر کەسیان ناکوژرێ ، ئەمما بیست ماین‌و ئەسپیان لێ‌ئەکوژرێ‌و ، بە گەیشتنی پشتماڵە ـ پشتماڵە بار ئەکەن ئەیبەنە بەردەمی پێنجوێن ، جێی پێشووی خۆیان •

محەمەدپاشا حەوت کوڕی بوە : مەحموودپاشاو ، عوثمان‌پاشاو ، حەسەن بەگ‌و ، سلێمان‌بەگ‌و ، محەمەدعەلی‌بەگ‌و ، قادربەگ‌و ، فەتاح‌بەگ • لە عوموومیان گەورەتر مەحموودپاشا ئەبێ‌و ، باقیی گەورەیی عومریان بە تەرتیبی ئەم نووسینەیە •

محەمەدپاشا لە رەئیسە پێشووەکانی جاف لە هەموویان زیاتر دەستی رۆییوەو ، زۆریش دەولەمەند بوەو ، تیجارەتێکی زۆر موهیممی کردوە ،

ئەغلەبی صەرفیاتی لە تیجارەتی خۆی بوە • دایما بیستهەزار سەر مەڕی بوەو ، هەشتصەد مانیی یەلخیی لە صەحرادا بوە • هەر ولاخێ کە دابیتی بە سوارەی خۆی لەو یەلخیانە پەیدا بوە پارەی پێ نەداوە • هەموو ساڵێ دوانزە هەزار تەغار گەندم لە دێهاتی ئێران بە پارەیەکی جوزئیی سەندوویەتی ، جاف موکەللەف بوون بە ولاخی خۆیان بێرنیە گەرمیانو ، صەدوپەنجا جووت لە قەزای ئەڵەبجەو ناحیەی وارماواو ناحیەی شێروانەدا بوویەتی ، قانزاجی ئەمانەی ئەدا بە ئەسلیحەی ئەو وەقتە بۆ دەستی سواری خوصووصیی خۆیو ، لە ئەطرافی خۆیدا نە عەشیرەتی خۆیو نە غەیری تریش کەس نەبوە بەرامبەریی بکا • ئەگەر کەسێ بیکردایە قابیل نەبوە صەرفی نەظەری لێ بکاو حەقی لێ نەسێنێ •

خضرئاغای هەمەوەند ، کە باوکی مەحموودخضری صەفەروەند بوە لە هەمەوەند ، لە حوکوومەتی تورك عاصیی بووبوو ، ئەچێتە خاکی ئێران ، لە ماڵی خۆیەوە بەعزێ تەعەڕوضی زوبانیی بە محەمەدپاشا ئەکا • لە کوێستانی ئێران خەبەری ئەم قسانە ئەدەن بە محەمەدپاشا • کە ئەو خەبەرە وەرئەگرێ بە هەزارو حەوتصەد سوارەوە لە سانئەحمەد ، کە مەوقیعێکە چواردە سەعات لە سنەوە دوورە ، دێت بۆ سەر خضرئاغا لە مەیدان ناحیەی هۆرێنو شێخانو ، ئەو وەقتە ئەو مەوقیعە داخلی خاکی ئێران بوەو ، دووصەد سواری هەمەوەندی لەلا ئەبێ • خۆیو سیوپێنج کەسیان ئەکوژێ •

لەم نەوعە موعامەلەیانەی زۆر بوە ، ئەگەر هەمووی بنووسم زۆر طوولانیی ئەبێ • بەم کەمە نیهایەتم هێنا • پێنجوێنو ئەڵەبجە ، کە ئێستە دوو قەصەبەن ، لە پێش محەمەدپاشادا دوو دێی بچووك بوون ئەو کردنی بە شار • قەیصەرییو ، حەمامو ، چایخانەی تێداکردنو ، بوون بە شارو ، لە ناحیەی قەرەداغا قیسمێکی گەورە دووکانو چایخانەی لە دێی زەردیئاوا

دروستکرد • قەلای شێروانەو ، لە تەك قیسمێ لە قـەلای کانیچـەقەلا بینای ئەونو ، خانوویەکی زۆر گەورەشی لەسەر گردی بەکراوا بوو ، بە واسیطەی ئەمە کە خاکی شارەزوور کەمدەوامە زۆر دەوامی نەکردو ، دوو مزگەوتیشی هەیە ، یەکێ لە ئەڵەبجەو ، یەکێ لە پێنجوێن • مزگەوتـــی ئەڵەبجـەی ئیستـەش دەوام ئـەکاو ،ئەسـاسی طاپـۆی ئەراضیی‌و ئـاو ئەو بۆ بەگزادەی داناوەو ، هەرچە بەگزادەی کەیخوسرەوبەگیی ، ئیسـتـە کە مەوجوودە ، ئەولادی ئەون ، خاریجی یەك دوو کوڕەزای ئەوڕەحمان بەگ نەبێ کە کوڕی کەیخوسرەوبەگ بـوە •

# فەصڵی نۆهەم

بەحثی ریاسەتی کوڕەکانی محەمەدپاشایە •

لە تەئریخی هەزارو دووصەدو نەوەدو نۆی هیجری‌دا مەحموود پاشا بوو بە رەئیسی عوموومی جاف‌و بەگزادەو قایم‌مەقامی ئەڵەبجە • خـۆی‌و براکانی لە پێش هەموو شتێکا عوموومی هیممەتی خۆیان صەرفی ئیقدامی حەقی محەمەد پاشا لە کەرەم‌وەیسیی ، کە فیرقەیێ بوون لە شاتریی‌و ئەو موعامەلەیان کرد •• کردیان • ئەو فیرقە ، کە چوارصەد ماڵ بوون ، یەك دەفعە مەحوویان کردنەوە ، نە لە خاکی بابان‌و ، نە لـە ئێران‌دا ماڵێکیـــان نەماوەو نەیان‌هێشتن • بە قەرارێ وەکوو بیستوومە یێژن : دوو پیاویان کە کوڕەزایانن لە کرماشان ماون ، ئەوانیش بوون بە شیعەو ، ئیسمیان لە ناوجافی موراد‌ی‌دا مەگەر بە ناوی وارگەکان‌و جێگەخێڵەکانیانەوە مابـێ ئەگەنا نەماوە •

مەحموودپاشـا لە سـاڵی هـەزارو سێصـەدو یەکـــدا لە طـەرەفی سوڵتان‌حەمیدەوە روتبەی میری‌میرانی بۆ هات‌و ، مەحموودپاشا ، کە لـە

ئەڵەبجە قایمەقام بوو ، عوثمانپاشا بەسەر پشتماڵەوە بوو ، ئیدارەی عومومی جافی ئەکرد ، تا سالی هەزارو سێصەدو حەوت مەحموودپاشا زۆر بە تەرەقیو دەستڕۆین لە ئەڵەبجەدا بوو ، لە عەینی ساڵدا ، لە وەقتی بەهاردا نامیقبەگی میرئالآ بۆ تەشکیلاتی (اراضیسنیە) هاتە شارەزوور ماڵی عوثمان پاشا ، لەسەر ئاوی زەلم لە ناو پشتمالەدا ئەبێ ، خزمەتێکی زۆری پێکردو میواندارییەکی زۆر چاك کراو ، زۆر لە عوثمانپاشاو هەیئەتی ماڵی رازیی ئەبێو ، عوثمانپاشاش ئەم خزمەتە کە پێیئەکا هیچ مەتڵەبێکی پێی نابێو ، قاعیدەی ماڵی عوثمانپاشا ، چە لە عەشایریداو ، چە لە دانیشتندا زۆر میوانپەروەر بوە • وەقتێ کە ئەچێتە ئەڵەبجە مەحموودپاشا موبالاتی پێناکا ، ئەڵێ بە مەحموودپاشا : من هاتووم ئەم ئەنهارانە کە داخلی طاپۆ نەبوون بۆ سوڵتان عەبدولحەمید خەریطەی بگرمو طاپۆی ئەکا • مەحموودپاشا ئەڵێ : موڵکی میللەت عومومی موڵکی پادشایەو ، پادشا لە ناو موڵکی میللەتدا موڵکبوونی باعیثی مەغدووریەتی میللەتە •

خۆلاصە بە عاجزیی ئەگەڕێتەوە سلێمانی ، تەلغرافێ بۆ سوڵتان عەبدولحەمید ئەنووسێ تاکوو مەحموودپاشا لە ئەڵەبجە قایمەقام بێ ئەراضیی (سنیە) بۆ تۆ سەرناگرێو ، بەڵکو تەئثیر ئەکاتە لیواکانی تری عێراقەوەو ، عوثمانپاشا ، کە ئێستە وا لە ناو جافدا ، بۆ قایمەقامیی ئەڵەبجە چاکترە •

طەبیعیی مەسئەلەیەکی وا موهیمم سوڵتان عەبدولحەمید عاجز ئەکا ، لە پاش پێنجمانگ تەلغرافێ لە ئەستەموولەوە ، وەقتێ پایز کە عەشایر بۆ گەرمیان ئەهاتین ، وە ماڵمان لە گەورەقەڵا بوو •• هات بۆ عوثمانپاشا نووسرابوو: عوثمانپاشا قایمەقامی ئەڵەبجەو، مەحموودپاشا موتەصەڕیفی ئۆرفە • کوڕی گەورەی محەمەدپاشا لە پاش عوثمانپاشا رەئیسی جاف ئایا

عوثمان‌پاشاو باقیی کوڕەکانی محەمەدپاشا هەم لەبەر ئەمە کە عوثمان‌پاشا ئەچێتە ئەڵەبجەو لێیان دوور ئەکەوێتەوەو ، هەم لەبەر مەحموودپاشا کە ئەرشەدی ئەولادی محەمەدپاشا بوەو ، لەجێی باوکیان دانیشتبوو •• عادەتەن بوو بە تەعزیەیەکی گەورەو ، ئەمیشیانە لێ‌مەعلووم بوو کە مەحموودپاشا موتەصەڕیفیی ئۆرفە قەبووڵ ناکاو ئەبێتە باعیثی تەفریقی بەگزادە لە یەك‌و ، هەم کوڕەکانی محەمەدپاشا نەیانئەتوانی بڵێن بە عوثمان پاشا : کە ئەم قایم‌مەقامی‌یە قوبووڵ بکە • لەبەر موحافەظەی جێگەو ڕێگەکەیان مەجبوور بوون بۆ ناردنی عوثمان پاشا ئە ئەڵەبجە •

مەحموودپاشا چوارمانگ لە ئەڵەبجە ماوەو عوثمان‌پاشا لەو چوار مانگەدا کەمتر موداخەلەی ئوموووری قەزای ئەکرد • مەحموود پاشا لە بەهاری ئەو ساڵەدا خۆی‌و محەمەدعەلی بەگی برای ڕۆیین بۆ ئەستەمووڵ بۆ لای سوڵتان عەبدولحەمیدو ، سوڵتانیش کە مەحموودپاشای لە ئەستەمووڵ دەستکەوت بە سەهلیی ئیذنی نەدا ، دوو ساڵ لە ئەستەمووڵدا ماوەو بیست هەزار لیرە لە تەك سی ئەسپی زۆر چاك‌و بەعزێ ئەشیای بەقیمەت لە تەك خۆیدا بردبووی ، ئەسپ‌و ئەشیاکان بۆ پێشکەشی سوڵتان‌وپارەکەش بۆ بەعزێ لە هەیئەتی وزەراو مەصرەفی خۆی •

لە پاش ساڵێ محەمەدعەلی‌بەگ هاتەوە بۆ ناو جاف • ئەمما بە محەمەدعەلی‌بەگدا کاغەزێکی نووسیبو بۆ لای براکانی : هەر وەقتێ کە نووسیم بۆ دوو صەد قەران‌و لیرەیەك بە تەلغراف کە حەواڵەی بکەنە لای حەمەقەدۆ لە موصڵ ئەو بۆم بنێرێ •• ئەمە لاتان مەعلووم بێ کە من لە ئەستەمووڵ بە ڕێی بادکوبەی ڕووسدا فیرارم‌کردوە ، فەتاح‌بەگی برام لە تەك دووصەد سواردا بێت بۆ ڕەشت ، لەوێ لە ماڵی ڕۆستەم‌بەگ ناوێ ، کە ئەصڵەن خەڵقی سلێمانی بوەو ، لە طایفەی مەحموودبەگی صاحیبقەرانە،

خەبەری من ئەزانن‌و ، من تا ساڵێکی تریش بەهەر نەوعێ بێ تەحەمـــول ئەکەم ، بەڵکە لە طەرەفی پادشاوە ئیعادەی لوطفێ بێ •

ئەم کاغەزە لە بەینی مەحموودپاشاو براکانیا وەکوو (شفرە) وابوو ، ئەمما عوثمان‌پاشایان حالیی نەکرد ، نەوەکوو عوثمان‌پاشا لەبەر مەحەببەتی جێگەو رێگەو نوفووذی خۆی ئەم خەبەرە بڵاوبکاتەوەو ، مەحموودپاشـا لە ئەستەمووڵ دووچار بێ ، ئەگەر چە مەحەببەتی برایەتییان زیاتر بوو ، وە هەم دایکیشیان یەك بوو ، ئەمما براکانی ئیحتیاطیان ئەکرد ، چونکـــە مەحموودپاشایان زۆر خۆش ئەویست •

مەحموودپاشا لە پاش ئەو ساڵە کە سوڵتان مورەخەصی ناکـات لـە تەك شێخ قادری شێخ‌عوبەیدیللا ، وە کوڕی بەدرخان‌پاشا لە ئەستەمووڵا یەك ئەگرن‌و ، ئیتتیحادێکی قەومییەت ئەکەن‌و ، هەرسێکیان فیرابکـەن هەرکەس بۆ مەوقیعی خۆی • جوابی مەئموورینی تورك بدەن •

رۆژی وەعدەی راکردن مەحموودپاشا موەفەق‌ئەبێ ، ئەوان ئەکەونە دواو ، خەفیە خەبەریان لێ ئـەدا ، وە ئـەگیرێن • شـێخ قـادری شێـخ عوبەیدیللا ئەنێرنە مەککەی موکەرەمــە ، وە کوڕی بەدرخـان پاشـا بـۆ قەطعەیێکی تر نەفی ئەکەن •

مەحموودپاشا رۆژی راکردنی تەلغرافێکی نووسیبو بۆ براکانـــی لەسەر ئەو قەرارە کە دایتابوو ، خۆم لە فکرم دێ‌و لەو وەقتەدا عومـــرم نۆ ساڵ بوو ، تەلغرافەکەیان هاورد ، بەگزادەکان لە ماڵی سلێمان‌بەگـــی مامەم گردبوونەوە ، نەیان‌هێشت کەس لە پشتماڵەو جاف بچێتە ناویـان ، سێ سەعات زیاتر موذاکەرەیان دەوامی کرد • من هەر ئەوەندەم لێ حاڵیی بوو فەتاح‌بەگی باوکم ئەو رۆژە سوار بوو ، رۆیی ، نەمئەزانی بۆ کـوێ ئەچێ ، حەتتا لە ماڵیشەوە ئەهلی ماڵ نەیان‌ئەزانی بۆ کوێ چوە !

بەلەشکرەوە ئەچێتە بیجاڕ ماڵی عەلیڕەزاخانی حاکمی بیجاڕو . عەلیڕەزاخان دۆستیو یەکجیهەتیی لە تەك تایفەی ئێمەدا زۆری[١٦] بوو . فەتاح بەگ قسەکەی لە تەکدا ئەداتەوە ، وە عەلی ڕەزاخان ئەڵێ بە فەتاح بەگ هەرچلۆن تۆ برابچووکی مەحموودپاشای منیش هەروامە . ئەمما بەم لەشکرەوە ڕۆیینی تۆ بۆ رەشت کە سەرحەدی ئێرانو حودوودی رووسە ، ئەمە زۆر بێموناسەبەتە . من تەدبیرێکی چاکترت بۆ ئەکەم . تۆ لازمە تەبدیلی قیافەت بکەی ، سوارێکی منو سوارێکی خۆت ، ئەوانیش بە تەبدیلی قیافەت لە تەك تۆدا بێن ، سوارەکەی من بۆ شارەزایی ڕێگەو . سوارەکەی خۆشت بۆ خزمەتی خۆتو ، قیسمێ لە لەشکرەکە بگەڕێتەوە . پەنجا سوارێکی لێرە بمێنن تا مەحموودپاشا (ان شاء الله) ئەگاتە ئێرە . دەستێ لیباسی (میرپنجی) خۆی بۆ فەتاح بەگو دوو دەست لیباسی سەربازی ئێران بۆ پیاوەکان ئەیانداتێ . لە بیجاڕەوە بە ڕێگەی طارمو خاڵخاڵدا ئەچن بۆ رەشت .

کە وەقتێ فەتاح بەگ ئەگاتە رەشت ئەچێتە ماڵی ئەو رۆستەم بەگە . لەوێ خەبەری لێ ئەپرسێ ، ناوی مەحموودپاشا نابا ، ناوی ئەو پیاوە ئەبا کە لە تەك مەحموودپاشادا ئەبێ ، وەکوو مەلا محەمەدی سنەیی بێ ، چونکە ئەو مەلامحەمەدە سنەیی‌یە ئەبێ بە واسیطەی دۆزینەوەی ئەو رۆستەم بەگە بۆ مەحموودپاشا . رۆستەم بەگ ئەڵێ : ئەم بەیانیە سەعات چوار مەلامحەمەد خۆیو پیاوێك لێرە حەرەکەتیان کرد بۆ طەرەفی سنە ، ئێمشەو هان لە چوارشەمەبازاڕ ، کە پێنج ساعات لێرەوە دوورە . هەر ئەو شەوە فەتاح بەگ دێتەوە چوارشەمە بازاڕ ، ئەمما ناچێتە ئەو کاروانسەرایە کە مەحموودپاشای تێدا ئەبێ ، نەوەك مەحموودپاشا لە خەو هەڵبسێو بکەوێتە غایلەوە ، ئەچێ لە کاروانسەرایەکی ترا دائەبەزێ ، بەیانیی زوو

---

(١٩) ئەمەیش ئەگەر (ئێمەدا زۆر بوو) بێ باشترە .

ئەچێ بۆ لای مەحموودپاشا ، مەحموودپاشا سەعاتێ لەشەو ئەمێنێ سوار ئەبێ ئەڕوات • فەتاح بەگ خۆیو رەفیقەکانی بە غار ئەڕۆن بەشوینیدا ، لە رێگە ئەیگەنێ •

وەقتێ تووشی ئەبن مەحموودپاشا دائەبەزێ خەبەری براکانیو باقیی بەگزادە ئەپرسێ ، بۆ مردنی حەسەن بەگو قادربەگی برای زۆر موتەئەثیر ئەبێ ، چونکە لە تەئریخی هەزارو سێصەدو هەشتی هیجریدا ئەو دوو کوڕەی محەمەدپاشا ، لە بەینی پانزە شەوا ، بە عیللەتی چاوەقوولە مردن • لەو تەئریخەدا مەحموودپاشا لە ئەستەموول ئەبێ • ئەگەر چی زۆر تەلغرافیان بۆ نووسیبو ، کە چاوی ئەکەوێ بە فەتاح بەگی برای طەبیعیی بە تازەیی موتەئەثیر ئەبێ • فەتاح بەگ زۆر دڵخۆشیی ئەداتەوەو ، هەر لەو جێگادا مەحموودپاشا تەبدیلی قیافەتی خۆی ئەکا ، لەبەر ئەمە کە لە خاکی رووسەوە هاتبوو لیباسی ئەهلی رووسی لەبەردا ئەبێ ، لیباسیان بۆ بردبوو ، هەم ماینو تفەنگیشی بۆ ئەبەن •

سوڵتان عەبدولحەمید کە خەبەر وەرئەگرێ تەلغراف بۆ (ناصرالدین) شا ئەنووسێ : مەحموودپاشا بەسەرخاکی رووسدا روو بە ئێران هاتوە،ئەبێ دەردەستی بکەی ، بۆم بنێری ، وە ئەو سوارانە کە لە تەك فەتاح بەگدا ئەچنە بیجاڕ• ئەم خەبەرە لە ئێرانا بڵاوئەبێتەوە شاە ئەمر ئەدا بە عەلیڕەزاخانی حاکمی بیجاڕ لە باتیی ئەوە بیگرێ ئەڵێ : ئیحتیرامی بگرەو ئیستیقبالی بکە بەعەسکەرەوە • وەقتێ کە مەحموودپاشا ئەگاتە بیجاڕ عەلیڕەزاخان بەو فەوجە عەسکەرەوە کە لە بیجاڕا ئەبێ ئەچێ بە ئیستیقبالیەوە زۆر خدمەتی ئەکاو ، چوارشەو لە ماڵی عەلیڕەزاخان ئەمێنێ • وە لە بیجاڕەوە دوو سواریان ناردەوە بۆ ئەم خەبەرە •

لە شارەزوورەوە عومەومی بەگزادەو عومەومی لەشکری جاف لە تەك بەگزادەی هەورامیی لهۆندا نزیکی چوار هەزار سوار چوون بۆ

ئیستیقبالی ، له پردی گاران لەشکرەکه به عوموومی گەیشتێ • پشتماڵەو جاف له شارەزوور بوو • هاتنەوە •

حوکوومەتی تورك کەوتە پەلەپەل بۆ مەحموودپاشا • چوار رۆژ دوای هاتنی مەحموودپاشا دووهەزار عەسکەری پیادە هات بۆ ئەڵەبجە • ئەو رۆژە عوموومی لەشکری جاف لە پشتماڵەدا بوو • عەبدوللاپاشا کە رەئیسی فیرقەی بارام‌بەگیی بوو لە بەگزادە ، سوار بوو بۆ سەر رێی عەسکەرەکە • مەحموودپاشایش حەزی ئەکرد بەو شەڕە • محەمەدعەلی‌بەگی برای مەحموودپاشا زۆر پەلەپەلی کرد بۆ مەنعی شەڕو باقیی براکانی تری ، وەکوو سلێمان‌بەگ‌و ، فەتاح‌بەگ طالیب بوون بۆ کردنی • محەمەدعەلی بەگ به هەر نەوعێ بوو پەکی ئەو شەڕەی خست لەو رۆژەداو حەقانیەت ئیصابەتی کرد فیکرەکەی •

عەسکەرەکه بە سەلامەت چوونە ئەڵەبجە لای عوثمان‌پاشا ، لە پاش سێ‌وچوار رۆژ پشتماڵەو جاف باریان‌کردبۆ قەزای کفریی • وەقتێ کە ماڵ گەیشتە کانی‌چەقەڵ ، جێی زووسانەی بەگزادە ، سەیید عەبدولحەمید ناوێ لە طەرەفی پادشاوە هات بۆ لای مەحموود پاشا ئیقناعی بکا بچێ بۆ ئەستەمووڵ • مەحموودپاشا ئیمراری وەقتی ئەکرد تاکو محەمەدعەلی بەگی برای چوە بەغدا لای نەصرەت‌پاشا موشیر،کە نەصرەت‌پاشا شتێکی وا بکا کە مەحموودپاشا نەچێتەوە بۆ ئەستەمووڵ‌و پادشا عەفوی بکا • نەصرەت‌پاشا ئەڵێ بە محەمەدعەلی‌بەگ : لازمە مەحموودپاشا بێت بۆ لای من ئە بەغدا •

محەمەدعەلی‌بەگ لە بەغدا هاتەوە لە تەك مەحموودپاشادا موذاکەرەی کرد بۆ رۆیینی بەغدا • مەحموود پاشا لەسەر قەول‌و نەئمینی نەصرەت‌پاشا کە بە محەمەد عەلی‌بەگی برای دابوو چوو بۆ بەغدا ، لە ماڵی نەصرەت‌پاشای

موشیر دائەبەزێ • نەصرەتپاشا تەلغراف ئەنووسێ بۆ ذاتی شاهانە ، جوابی تەلغرافەکە ئەداتـەوە : لازمـە مەحموودپاشـا بێتـەوە بـۆ ئەستـەمـوولْ نەصرەتپاشا دووبارە تەلغرافێکی زۆر باش بۆ نەچـوونی ئەنووسـێ • دووبارە جوابئەداتەوە : قابیل نیە ئەبێ بێ بـۆ ئەستەموولْ • سولْتـان عەبدولحەمید لەو راکردنی مەحموودپاشایە لە ئەستەموولْ زۆر عاجز ئەبێ •

مەحموودپاشا ئەلْێ : ئەڕۆمەوە بۆ ئەستەموولْ ئـەمما بـە رێگـەی موصڵدا ئەڕۆمو ، لە کفریوە ، چونکە پارەو ئەسبابم وا لە ماڵدا ، لەوێوە ئەنێرم بۆم بێتەکفریی • طابوورئاغاسییەك لە تەكْ پانزە سوار ژانـدرمەدا بۆ رێك ئەخـەن لە تەکیا بن تـا موصڵ •

محەمەدعەلی بەگی برای سێ رۆژ بەر لە حەرەکەتی ئەو لە بەغدا روو بە پشت حەرەکەتی کرد • بە گەیشتنی ئەو ئەپشتماڵە عوموومی بەگزادە لە تەكْ لەشکری عەمەڵەو پشتماڵـەو شاتریـیداو لەشکـری گەلاڵـیی بـە عوموومیی هەزارو پێنجصەد سوار لە رۆژی گەیشتنـی مەحمـوودپاشا ئەقەرەتەپە بەم لەشکرە گەورەوە داخڵی قەرەتەپە ئەبن • نییەتی تالانکردنی قەرەتەپە ئەکەن ، مەحموودپاشا نایەڵێو طابوورئاغـاسیی ، کـە لە تـەكْ مەحموودپاشادا ئەبێ ، ئەچێتە لای مەحموودپاشـا ئـەڵێ : موحافەظـەی ناموسم بکە • مەحموودپاشا ئەو شەوە زۆر حورمەتی ئەگرێو ئینعامیشی لەگەلا ئەکا •

بەیانیی لە قەرەتەپە بـەو لەشکـرەوە بەسـەر زەنگابـادو پـالانیدا بەڕاوکردن هاتەوە بۆ کانییچەقەڵ • لە ناو پشتماڵەدا تاکو بەهار دانیشت• لە وەقتی بەهاردا کە عەشایر ئەگەڕاوە بۆ شارەزوورو کوێستان ، وە جاف لە دەوری سیارەو پشتماڵەکانیش لە زەماوەنگە بوون لە سلێمانیوە شێخ مارفی قازانقایە کاغەزێکی بە خەفیە بۆ مەحموودپاشا نـارد : کـە وا دوو

هەزار سوارەو چوار هەزار عەسکەری پیادە بۆت حەرەکەتی کرد •
مەحموودپاشا کە ئەم خەبەرەی وەرگرد لە تەك فەتاحبەگدا لە ئاوی
سیروان پەڕیوە ، چوە کەژی زمناکۆو عەشیرەتی یەزدان بەخشیی لە
شەمیراندا لە تەك عەشرەتی تاوگۆزیدا بە عوموموم چوونە ئەلای •
فەتاحبەگ گەڕایەوە بۆ پشتماڵە • لەو عەسکەرە کە بە عومووم گەیشتن ،
عوثمان پاشا کە لە ئەڵەبجە بوو بە عەجەلە کاغەزی بۆ براکانی نووسی کە :
بە هیچ نەوعێ شەڕ لە تەك ئەم عەسکەرەدا نەکرێو نە خۆتانو نە بێڵن
جاف تەعەڕوض بەم عەسکەرە نەکەن • ئیشی مەحموودپاشایش چاك ئەبێو،
ئەم عەسکەریشە لە مەحموودپاشا زیاتر حەقی بەسەر کەسەوە نیە هەموو
بەگزادە کەسی لە ماڵ دەرنەچوو ، عەسکەرەکە تا ئەلای پشتماڵە خەبەری
مەحموودپاشایان پرسیی وتیان : چوە بۆ شارەزوور لە پاش شەوێ
عوموومی روو بە شارەزوور گەڕاوە • وەقتێ کە ئەگەنە سەر سیروان لە
طەرەفی شەمێراندا خەبەری مەحموودپاشا ئەزانن کە وا لە زمناکۆ نزیکی
چل پەنجا کەڵەك ئەبەستن کە بپەڕنەوە • مەحموود پاشا کە ئەم خەبەرە
ئەزانێ • لەبەر سەلامەتیی عەشیرەتی یەزدانبەخشیی بەخۆیو سی سوارۆ
لە خواری عەسکەرەکەوە ، لە کۆتەرەڕەش لە سیروان ئەپەڕێتەوە •
تەسکەرەیێ ئەنووسێ بۆ کەریمبەگی قایمەقام : ئەگەر ئێوە مەقصەدتان
منە لەم پەڕینەوە من لە زمناکۆ نیم •

کەریمبەگی قایمەقام خەطەکەی مەحموودپاشا ئەناسێو بە دووربین،
هەم فەرقی سوارەکان ئەکا بە خۆیو عوموومی ئێسرسوارەکەیەوە
ئەکەوێتە شوێن مەحموودپاشا روو بە دەشتی شارەزوور مەحموودپاشا
بەڵەدیی ئەبێ لە دەشتەکەداو ئەوان نابەڵەد ئەبن • عەسکەرەسوارەکە
ئەخاتە چەمی ساردکەوە ، بە سێ سەعات لە قوڕ نەجاتیان نابێ ! تا ئەوان لە
قوڕ نەجاتیان ئەبێ مەحموودپاشا ئەچێتە بانیبنۆك سەر کەژی هەورامان •

برزوبەگ رەئیسی هەورامانی تەخت بەچوارصەد تفەنگەوە ئەچێتە ئەلای عەسکەری تورك • مەعلوومە تەجاوزی حودوودی نەئەکرد ، شەش حەوت رۆژ لە شارەزووردا عەسکەرەکە ماوە • عومووی چوونە ئەڵەبجە •

مەحموودپاشا دووبارە گەڕاوە بۆ زمناکۆ • تا ئەمانە کرا عومووی جافو بەگزادە گەیشتنە شارەزوور ، مەحموودپاشا لە زمناکۆوە تەلغرافێکی نارد بۆ سلێمانی نووسییان بۆ سولتانحەمید کە : من بە عەسکەر ناگیرێم • بەم شەرتە مەئمووری حوکوومەت لە تەکما نەبێو ، لە هەموو شارێ بەسەربەستیی تیابم خۆم یەمەوە بۆ خدمەتتو ، سولتان عەبدولحەمید خان دووبارە مەرحەمەتی کردو تەلغرافەکەی قوبوول کردو ، ئەمری دا بەهاتنەوەی بەو نەوعە کە خۆی طەڵەبی کردبوو • عەسکەرەکەی ئەڵەبجە رۆییەوە بۆ سلێمانیو کەرکووك •

مەحموودپاشا هاتەوە ئەپشتماڵە ، خۆیو عەلیبەگی کوڕی ، ، کە لەو وەقتەدا عومری سێنگزەساڵ بوو ، چوو بۆ ئەستەمووڵ • سولتان عەبدولحەمید ئەم موعامەلەیەیی نەخستە ئەڕووی • لە پاش ساڵێ مانەوەی لە ئەستەمووڵ ئیعادە مەرحەمەتێکی زۆری لە تەكدا کرد ، مەعاشی بۆ بڕیوەو ، پانگزە موقاطەعەی گەورەی لە قەزای کفرییو ، قەزای ئەڵەبجەو ، سلێمانیدا دایە بە پێنج هەزار لیرەو ، پارەکەیشی بە پێنج ساڵ بیداو ، لە پاش سێ ساڵ روخصەتیداو ناردیەوە ئەناو جافو شارەزوورو کردی بە رەئیسی جاف •

لە ساڵی هەزارو سێصەدو دوانگزەی هیجریدا هاتەوە ئەشارەزوور ، تاکوو ساڵی هەزارو سێصەدو بیستو شەشی هیجریی لە کەماڵی تەرەقییو دەستڕۆییینو نوفووزێکی زۆر لە ناو عەشایرا دەوامی کرد ، بە نەوعێکی وا لە ویلایەتی سنەو کرماشاندا زیاتر دەستی ئەڕۆیی تاکوو لە ناو جافدا ! براکانی لەم بەینەدا هەموویان مردنو ، مەحموود

پاشا خۆیشی پیر بووبوو و ، تاقەتی بەعزێ موعامەلەی دنیـایی نەمابـووو ، حوکوومەتی تورکیش لە پاش ئیعلانی مەشـرووطییەت فکریـان گـۆڕا ، مەحموودپاشا دەرکەنارییو بێدەغلیی لە هەموو شت پێخۆشتر بوو •

لە سالی هەزارو نۆصەدو هەژدەی میلادیدا کە ئینگـلیس هاتــە کفرییو ، لیوای کەرکووكو ، سلێمانی سوقووطیکرد لەدەست تورك •• مەحموودپاشا بە خۆیو پشتمالەکەیەوە لە قەزای ئەلەبجە مانەوە • ئـەو سالە لە هاوینـدا نەچوونە قزلجەو ، خۆی بە زوستان ئەچوە نەرگسەجاڕو، بە هاوین لە شەمێران ئەما ، تا لە تەئریخی ١٢٣٩ی هیجریدا لە ١٥ی مانگی شەعباندا ، لە رۆژی چوارشەمەدا بە عومری حەفتاوهەشتەوە بەڕەحمەت چوو • لە سەر چەمی سیروان لە شەكمەیدانو لە جامیعی قزراباط ، کــە بناگە راوی خۆیەتیو ، مەوقووفەیەکی زۆری لە خانەقییو قـزراباط بـۆ داناوە کە سالی هــەزار لیرە واریـداتی ئـەبێ •• مەدفوونـە لە تــەك کەیخوسرەوبەگو ئەحمەد بەگ ، کە کوڕینیو ، محەمەدئەمینبەگ کـە کوڕی کەیخوسرەو بەگەو ، محەمەدبەگ ، کە کوڕی محەمەدعەلیبەگـی برایـەتـی •

مەحموودپاشا پیاوێکی زۆر صاحێب ئیحسان بوو ، ئەگەر چی بـۆ حسابی دنیایی قوصووری نەئەکرد ، طەرەفی خودایـی زۆر موحافەظـــە ئەکردو ، زۆر صاحێبی نەقد بوو ، کوللی سالێ زەکاتی شەرعیی لەو پارە نەقدییەی دەرکردوە • وە کوللی سالێ فەرزی کردبوو لە سەر خۆی کە چل کەس بە پارەی خۆی بنێرێتە حیجازو ، ئەم موعامەلەی تا چوار سال بەر لە مردنی دەوامی کرد • هەروەکـوو مزگـەوتی قزرابـاطی دروستکردوە مزگەوتی دەککەو مەدرەسەی خانەقیی ئەوانیش لە بینای ئەون • وە لـە کانییچەقەلیشا زیاد لە بیناکانی محەمەدپاشای باوکی بینایـەکی گـەورەی کردوە •

# فەصڵی دەهەم

بەحثی ریاسەتی عوثمانپاشایە :

لە پاش محەمەدپاشای باوکیان کە مەحموودپاشا لە ئەڵەبجە قایمەقام بوو ، عوثمان پاشا رەئیسی جاف بوو ئیدارەی بەدەست ئـەوەوە بـوو ، عوثمانپاشا زووتریش بەحثی کراوە لە وەضعییەتی مەحموودپاشادا •

لەعومری شانزەوە تا عومری گەیشتە شەصتو هەشتو بە ڕەحمەت چوو لە قایمەقامیی ئەڵەبجەو ریاسەتی جاف رۆژێ خاریج نەبوە ، مەگـەر ئەو چوار ساڵە نەبێ کە محەمەدپاشا لە خاکی ئێران بوە ، لەو وەقتەشدا لە ئێران حاکمی جوانڕۆ بوەو ، پیاوێکی زۆر مـەسعوودو صاحێـب نان بوەو ، زۆر صاحێبی نەقد بـوو ، ئاثارەکـانی کە ئیستـە لـە ئەڵەبجـەو پێنجوێندا ماون شاهیدن لە سەر پیاوەتیو ئیقتیداری •

# فەصڵی یانزەهەم

بەحثی کوڕەزاکانی محەمەدپاشایە •

محەمەدپاشا ، وەکوو نووسیومانە ، حەوت کوڕی بوە : مەحموود پاشاو ، عوثمانپاشاو ، حەسەنبەگو ، سلێمانبەگو ، محەمەدعەلیبەگو ، قادربەگو ، فەتاحبەگ •

قادربەگ ئەولادی نەبوە •

مەحموودپاشا چوار کوڕی بوە : کەیخوسرەوبەگ • عـەلیبەگ • حسەینبەگ ، ئەحمەدبەگ • کەیخوسرەوبەگ ئیمڕۆ کوڕێکی لەحەیاتدایە کە ناوی عەبدوڵلابەگەو ، دوو کوڕی چاکی بوو لە حەیاتی خۆیدا مردنو، عەلی بەگ تەنها کوڕێکی هەیە حەسەن بەگی ناوە ، خۆی وەفاتیکردوەو ، حسەینبەگ بەرحەیاتە، سێ کوڕی هەیە، گەورەیان ناوی عەبدوڵلابەگە(*)

(*) خوالێخۆشبوو عەبدوڵلابەگ ئەم کوڕانەی لێ بـەجێماوە : سیروان ، کیسرا ، سالار ، فریا ، کچێکیش بە ناوی ئاواز •

ئەحمەدبەگ وەفاتی کردوە ، کوڕێکی هەیە عومری دەساڵانە ، ناوی شەوکەت بەگەو(*) ، کەیخوسرەوبەگیش بەڕەحمەتچوە .

عوثمانپاشا پێنج کوڕی بوە : مەجیدبەگ ، طاهیربەگ ، محەمەدسەعیدبەگ ، عیزەتبەگ . ئەحمەدبەگ . مەجید بەگو ، طاهیربەگو ، محەمەدسەعیدبەگ بەڕەحمەتچوون . مەجیدبەگ تەنها کوڕێکی هەیە کە ناوی حەمیدبەگەو ، ئیستە قائیمەقامی چەمچەماڵەو ، حەمیدبەگ شەش کوڕی هەیە ، گەورەیان ناوی بورهانبەگە . طاهیربەگ تەنها کوڕێکی هەیە . ناوی مەسعوودبەگە . وەمحەمەدسەعیدبەگ تەنها کوڕێکی هەیە ناوی داودبەگە ، داودبەگیش کوڕێکی هەیە ناوی کەریمبەگە .

وە عیزەتبەگ بەرحەیاتە ، کوڕێکی هەیە ناوی عەلیبەگە ، ئەحمەدبەگیش،کە لە حەیاتدایە ، کوڕێکی هەیە ناوی ئەفراسیاوبەگە .

حەسەنبەگ ، کە بەڕەحمەتی خودا چوە ، کوڕێکی لە دوا بەجێماوەو ،ئیستە مودیری وارماوایە ، ناوی حسەینبەگە ، چوار کوڕی هەیە گەورەیان محەمەدبەگی ناوە .

سلێمانبەگ ، کە ئەویش بەڕەحمەتی خودا چوە ،پێنج کوڕی بوە : محەمەدڕەشیدبەگ . حەسەنبەگ ، حاجی ئیبراهیمبەگ عەبدولقادربەگو ،محەمەدبەگ ، محەمەدڕەشیدبەگ بەڕەحمەتی خوداچوە.یەك کوڕی هەیە ناوی عەلیبەگەو ، ئیستە لەسەر کۆکس دانیشتوە بەسەر مۆڵکی خۆیەوە . حەسەنبەگیش بەڕەحمەتی خودا چوە . دوو کوڕی هەیە . محەمەدبەگو محەمەدڕەشیدبەگ ، هەردوکیان لە کۆکس بەسەر موڵکی خۆیانەوە دانیشتوون .

---

(*) نەوەی شەوکەتبەگیش ئەمانەن : ئەندازیار سەرتیپ . دوو کچیش : پرشنگو ، شیرین .

حاجی ئیبراهیم‌بەگ بەرحەیاتە لە دەککە دانیشتوە ، کوڕێکی بچووکی هەیە ناوی عەبدولقادربەگەو ،ئیمڕۆ لە عومومی بەگزادەی کەیخوسرەوبەگی بەسال گەورەترەو ، پیاویکی زۆر چاکو موەففەق لەسەر طاعەتە • عەبدولقادربەگیش بەرحەیاتە ، ئەویش لە دەککە بەسەر مۆلکی خۆیەوە دانیشتوەو ، محەمەدبەگ لە پێش ژنهێنان‌دا بەڕەحمەت‌چوە •

محەمەدعەلی‌بەگ ، کە خۆی بەڕەحمەت چوە سێ کوڕی زۆر چاکی بوو لە پاش‌خۆی ،لە ظەرفی سالێک‌دا لە تەئریخی هەزارو نۆصەدو هەژدەی میلادی‌دا، جەمیل‌بەگ‌و ئەدهەم بەگ‌و محەمەدبەگ لە بەینی سێ‌مانگ‌دا ئەم سێ‌کوڕەی مردن •

جەمیل‌بەگ دوو کوڕی لە دوا بەجێ‌ماوە : جەمال‌بەگ‌و ، ئەنوەربەگ •

ئەدهەم‌بەگ ئەولادی نەبوو •

محەمەدبەگ بەر لە ژنهێنان مردوەو ، ثەروەتێکی زۆر لە دوای محەمەدعەلی‌بەگ مایەوە • دووبەشی جەمال‌بەگ لەناوی داو ، بەشێکی بۆ ئەنوەربەگ ماوەتەوەو ، قادربەگ ـذاتاـ نووسیومانە بەبێ ئەولاد مردوە •

فەتاح‌بەگ کە بەڕەحمەت چوە لە تەئریخی هەزارو سێصەدو بیست‌وپێنجی هیجری‌دا شەش کوڕی لەدوا بەجێ‌ماوە : کەریم‌بەگ ، ڕەزابەگ ، محەمەدبەگ ، عەبدوڕەحمان بەگ(*)، ئەحمەدبەگ ، داود بەگ‌و ، هەرشەشیان هان لە حەیات‌دا • کەریم‌بەگ دوو کوڕی هەیە : محەمەدئەمین‌بەگ‌و ، مصطەفابەگ • وە ڕەزابەگ چوار کوڕی هەیە : خالیدو ، مەحموودو ، عەلی‌و ، جەمیل •

وە محەمەدبەگ کوڕێکی هەیە ناوی سەعیدبەگە •

---

(*) عەبدوڕەحمان‌بەگ ئەم کوڕانەی لێ بەجێ‌ماوە : خوالێخۆشبوو صەلاح ، د . عەلی جاف ، عوسمان ، حەسەن . سێ کچیش : پەریخان ، نازەنین، ئەختەر .

عەبدوڕەحمان بەگ‌و ئەحمەدبەگ ژنیان هاوردوە ئەمما کوڕیان نیەو، داودبەگ ژنی نەهاوردوە .

بەگزادەی کەیخوسرەوبەگیی ، کە کوڕەزاو کوڕەزازای محەمەدپاشان ، ئەوانەیان کە ئیمڕۆ مەوجوودو بەرحەیاتن‌و لە قەضای ئەڵەبجەو ، لیـوای سلێمانی‌و ، لیوای کەرکووک‌و ، قەزای خانەقین دانیشتوون .. عیبارەتـــن لەمە کە لەسەرەوە نووسراوەو ، بەگزادەی بارام بەگیی پیاوی مەعلوومیان مصطەفابەگی عەبدوڵڵاپاشاو ئەحمدبەگی محەمەدصاڵح بەگ ، کە ئیمڕۆ مەبعووثەو ، برایەکی هەیە ناوی عیززەت بەگەو ، عەلی بەگی رۆستەم بەگ‌و، تۆفیق بەگی قادربـەگ لە تـەك ئەمین بـەگی برایـا ... ئەمـانە پیـاوە مەعلوومەکانی بەگزادەی بارام بەگین .

وە بەگزادەی وەڵەدبەگیی مەعلوومەکانیان ، محەمەدسەعیدبـەگ ، حەسەن بەگ ، عەلی بەگ ، ئەحمەدبەگی محەمەدبەگ‌و ، حسەین بەگی برای عـەلی بەگـە . وە نزیکـی چـل کەسێکـی تر وەکـوو کـوڕو کـوڕەزای یارئەحمەدبەگ‌و ، کوڕو کوڕەزای عەزیزبەگ ، حسـەین بەگ‌و عەزیـز بەگی حەبیب بەگ ، ئەمانە مەوجوودن ، هـان لە نـاو جـاف‌و شارەزووردا لە قەزای ئەڵەبجە .

## فەصڵی دوانزەهەم

بەحثی ئادابی جاف بۆ بەگزادەو رەئیسیان‌و ، ئەمانە بە چەند تەکلیف موکەللەف بوون ، کەبیدەن بە رەئیسی خۆیان :

تەکلیفی ئەووەڵ :(خەرج) بوە . ئەم خەرجە عیبارەت بوە لەمە کوللی ماڵێ لە عەشیرەتی جاف ـ دانیشتوو و گەڕیاو ـ موکەللەف بوە لە بیست قرانەوە تا هەزار قران ، لە بیست قران کەمترو لە هەزار قران زیاتر نەبوە . ئەمە لە دەفتەرێکی ئەساسیی رەئیسانی جاف‌دا قەیدبوەو ، ئەمەیان داوە بە رەئیسی جاف . ئەم خەرجە بە صوورەتی قەطعیی نەفـەوتاوە . ئەگـــەر

ماڵێکی جافی مورادیی چوویێتە خاکی ئێران ، چە لە قەصری شیرین‌و ، چە زەهاوو ، چە هۆرێن‌و شێخان ، مەئموور چوە لێی‌سەندوەو ، لە هەر جێگەیەك لە لیوای سلێمانی‌و لیوای کەرکووك ناو هەر عەشیرەتێ چووبن لێیان سەندوون • ئەگەر صاحێب‌ماڵێ بمردایە بە ئیرثیی ئەو خەرجە ئەهاتە سەر کوڕی بۆ گم‌نەبوونی ماڵی جاف‌و تەحصیلکردنی ئەم خەرجە ، چە بۆ گەڕیاو وە چە بۆ دانیشتوو ، نزیکی سی‌کەس مەعلووم کرابوو پێیان‌ئەوت: (سوریاش) ئەمانە خۆیان‌و باوك‌و باپیریان وەظیفەیان بوو ماڵیان لە ناو جاف‌دا بوو ، لە وەقتی پایز ، کە خەرج ئەسێنرا ، حازرئەبوون‌و لە تەك کوڕەبەگزادەی جاف‌و سوارەی پشتماڵەدا تاقم‌ـتاقم ئەچوون بۆ خەرج‌سەندن •

لە فیرقەکانی جاف نزیکی هەشت نۆ کەس نەبێ ، کە محەمەد پاشا لەخەرج عەفووی کردبوو ، ئەوانیش موکەللەف بوون بەو خەرجە بیدەن ، سوارەی خوصووصیی عەمەڵەو ، پشتماڵەو ، صەدانیی‌و ، بەداخیی ، ئەمانە خاریج بوون لە خەرج • جاف مەگەر رەئیسی فیرقەی صەداقەت وە خزمەتێکی زۆر چە لە قەدیم کرابێ یا تازە ، ئەو رەئیسی فیرقە کردبێتی بە رەئیسی عوموومیی ئەو رەئیسی فیرقە لە خەرج عەفوکراوە • ئەم خەرجە بۆ رەئیس‌و بەگزادە ، لە گەڕیاوو دانیشتوو ، عوموومی ساڵی دوانزە هەزار لیرەی عوثمانیی زیاتر بوو •

تەکلیفی دوەم : ئەمە بوە پێیان وتوە (سوورانە) ئەمە رەئیسی عوموومی نەی‌سەندوە ، حەواڵەی سوارەی پشتماڵە بوە ، هەرکەس لە گەڕیاوو دانیشتوو ، ژنێکی لە ناو خۆی‌دا یا بە غەیری جاف بەشوو درابێ ، ئەگەر دەوڵەمەند بوایە ماینێ یا هێسرێ یا تفەنگێ ، لە تفەنگی ئەو وەقتەو ، ئەگەر وەسەط بوایە گایەکی چاك‌و ، ئەگەر فەقیر بوایە بیست قرانی داوە • وە

ئەگەر پیاوێ لە جاف ژنێکی لە غەیری جاف بخواستایە سوورانەیان لێ نەئەسەندن •

تەکلیفی سێیەم : ئەمە بوە ئەگەر پیاوێکی جاف بکوژرایە لە ناو خۆیدا هەزار قران ، کە خوێنی جاری‌یەی عەشایرە ، سێصەد قران لەو پارەیە عایدی رەئیس بوە • ئەمما رەئیس نەیخواردوە عایدی سوارەی خوصووصیی بوە • ئەم خوێنە خوێنی پیاوی وەسەطی جاف بوە • ئەگەر رەئیسی فیرقەیێ خۆی یا کوڕی یا برای بکوژرایە تا صەد لیرەو ماین‌و تفەنگیش لەگەڵ ژنێکا کە بۆ واریثی کوژراو مارە بکرێ •• لە طەرەفی قاتیلەوە دراوە • ئەمما بە ئەغلەب لەبەینا لەسەر ئەو خوێنە شەڕ واقیع بوە • رەئیس بە تەلاشێکی زۆر موصالەحەی پێ‌کردوون •

تەکلیفی سێیەم : پێنجیەکی حوقووق بوە ، یەعنی ئەگەر کەسێ لە جاف شکاتی بکردایە لە یەکێکی تر بۆ صەد قران یا هەزار قران ، تا هەرچەند سوارەی خوصووصیی رەئیس ئەڕۆیی ، ئەوپارەیەی لە داوالێکراو ئەسەند بۆ داواکەر ،پێنجیەکی ئەو پارەیە حەقی سوارە بوەو ، ئەم پارەیە بێ‌سوئال‌و جواب نەئەسێنرا • قازیی لای رەئیس بوە ، موافیقی شەرع تەحصیل‌کراوە • ئەم هەموو سوارەی خوصووصی‌یە دایما خاڵیی نەبوە ، هیچ وەقتێ نەبوە دووصەد کەس شکاتکەر نەبێ ، دایما لە هاتوچۆدا بوون‌و ،کوللی ساڵێ حەوت هەزار لباد لە جاف سەنراوە ، وە هەشت هەزار حۆقەی سلێمانیی رۆن دراوە بە رەئیسی عموومو ئەو بەگزادانەی کە صاحێب ئێل بوون • تەکلیفی رۆنانەو لبادانە تا تەئریخی هەزارو دووصەدو نەوەدو پێنجی هیجریی دەوامی‌کرد •

وە رەسمی جەزاش بۆ رەئیس بوە • حەتتا خۆم لە فکرم دێ ، وە گەورە بووم ، عەشیرەتی تەرخانیی لە تەك روغزانی‌دا شەڕیان بوو ،

چوارپێنج کەس لە بەینا کوژرابوو ، بێ‌خەبەری مەحموودپاشا موصالەحەیان کرد • مەحموودپاشا لەمە عاجز بوو • تەرخانیی جەریمە کرد ، سیصەد تاجووت‌و ، پەنجا ماین‌و ، پەنجا تفەنگی جەزا لێ‌سەندن لە تەئریخی هەزارو دووصەدو پێنجی هیجری‌دا ، وەکوو نووسراوە ، بەگزادەکان ، چونکە بە عومووم بوون بە صاحێبی مولك‌و طاپۆیەکی زۆر ، رەسمی رۆنانەو لبادیان لەسەر عەشرەتەکە لابرد • ئەمما خەرج‌و سوورانەو جەزاو پێنجیەکی حوقووق تا تەئریخی هەزارو سێصەدو بیست‌وشەشی هیجریی دەوامی‌کرد •

لە دوای ئینقیلابی عوثمانیی خەرج نەما ، جاف موکەللەف بوون بە ئەغنامی نەقدیی‌و ، رەسمی پێنجیەکی حوقووقی شەخصیی لە زەمانی ریاسەتی منیش‌دا بۆ سوارە مابوو •

ئادابی جاف بۆ گەورەی خۆی لە گەلێ عەشیرەت چاکترە • ئەدەبیان دەرحەق بە گەورە زۆرە ، لە عومووومی جاف بیست‌و پێنج کەس حەقی دانیشتنی مەجلیسی رەئیس‌و بەعزێ لە بەگزادەی هەیە و ، عەشیرەتی تر بۆ گەورەیان وا نین • عومووومیان وەکوو یەك فەرقیان نیە •

رەئیسی ئاخریان کە خۆم بووم‌و لە تەئریخی نۆصەدو نۆزدەی میلادی‌دا بە ئەمرو تەشکیلاتی حوکوومەتی ئینگلیس بووم بە رەئیسی عومووومی جاف ، وە ئەو تەشکیلاتە تا هەزارو نۆصەدو بیست‌و پێنجی میلادیی دەوامی کردو ئیدارەم کردن‌و لەو تەئریخەوە تەشکیلاتەکە نەما • ئومێد ئەکەم کە دواکەوتوانم تەرزی ئیدارەم داخلی صەحیفەی ئەم تەئریخە بکەن‌و ، ئومێدەکەم لە حەق لانەدەن ، چونکە زەمانی من زەمانی محەمەد پاشاو مەحموودپاشا نەبوو •

# فەصڵی سیانزەهەم

بەحثی ئەو شەڕانەی جافەیە کە لەناو خۆیداو لە تەك غەیری جافا بوویانە :

لە تەئریخی هەزارو سێصەدو یەکی هیجری‌دا عەشیرەتی شاتریی‌و هاروونیی‌و کەماڵەیی‌و صەدانیی بە عومووم دەرحەقی رۆغزادیی‌و تەرخانیی لە مەریوان‌دا ئیتتیفاقیان‌کرد لە ناحیەی پێنجوین ، وەقتی پاییز کە بۆ شارەزوور ئەهاتن ، چوون بە گژ تەرخانیی‌و رۆغزادی‌یا لە قەڵای خاو ، کە سێ سەعات لە پێنجوێنەوە دوورەو خاکی ئێرانە ، شەڕێکی زۆر خراپ‌و گەورەیان بوو ، لەو شەڕەدا صەدو پەنجا کەس لە شاتریی‌و باقیی فیرقەکانی تر کوژران ، رۆغزادیی‌و تەرخانیی مووەفەق هاتن نزیکی پانزە کەسیان لێ کوژرا • ئەم شەڕە لە ناو جاف مەشهوورە بە ( شەڕی‌قەڵای خاو ) •
ئەم شەڕو دوشمنایەتی‌یە دەوامی کرد تاکوو هەزارو سێصەدو دووی هیجریی ،لە وەقتی زوستان‌دا ،لە قەزای کفریی ئەم دەفعەیە غەیرەز میکایەڵیی‌و عەمەڵەو پشتماڵە باقیی تری جافی قەزای کفریی لە تەك شاتریی‌دا لەشکریان راکێشا بۆ سەر رۆغزادیی‌و تەرخانیی لە گامەخەڵا ، کە مەوقیعێکە لە کەوەڕێ ، بوو بە شەڕیان • چل کەسی تر لە لەشکری باقیی جاف کوژرا ، وە ئەم دەفعەیەش مووەفەقی لە طەرەفی رۆغزادیی‌و تەرخانیوە بوو ، وە لە رۆغزادیی دە کەس کوژرا ، ئەمما پیاوی گەورەو ناوداریان • ئەم شەڕی دوەمە پێی ئەڵێن ( شەڕی گامەخەڵ ) •

شەڕی سێیەمیان لە شارەزوور بوو ، لە تەئریخی هەزارو سێصەدو نۆی هیجری‌دا لە پاش ئەم دوو شەڕە مەحموودپاشا موصالەحەی کردن‌و لە عەینی تەئریخی هەزارو سێصەدو نۆی هیجریدا تەرخانیی لە تەك رۆغزادی‌دا شەڕێکیان بوو پێنج شەش

کەس لە بەینیانا کوژرا • تەرخانیی لە رۆغزادیی جیابوونـەوە ، لـە تـەك شاتریی‌و باقیی جافدا بوون بەیەك ، وە چوونە سەر رۆغزادیی رۆغزادی‌یان تالانکرد • ئەمما کوژراو لە طەرەفەین سێ چوار کەس بوو • ئەم شەڕیشە پێی‌ئەڵێن (شەڕی داری‌قەلان) • لە پاش ئەم شەڕە شەڕی ناودارو مەعلووم نەبوە • تەرخانیی‌و رۆغزادیی بـوونەوە بەیـەك‌و موصالەحـەیان کـردو، شەڕنەمان تاکوو ئیمڕۆ دەوام ئەکات •

وە تەرخانیی‌و رۆغزادیی هەم لە تەك داودەدا حەوت شەڕیان بـوە ئەووەڵ‌و ئاخر لە داودە صەدوپەنجا کەس کوژراو لە روغزادیی‌و تەرخانیی سی کەس کوژرا ، تا تەئریخی هەزارو سێصەدو سی هیجریی دوشمنایەتی‌یان دەوامی کرد ، ئیستە دۆستن • لە حەق لانادەم داودە عەشیـرەتێکـی زۆر ئازاو بە ئیقدامن‌و ، لەشـەڕدا کـوڵ نـادەن‌و موقابەلـەی رۆغـزادیـی‌و تەرخانی‌یان ئەکرد •

وە لە زەمانی ریاسەتی محەمەدپاشا لە تەك هەورامانی تەختدا جاف شەڕی بوە • مەنشەئی ئەم شەڕە ئەمە بوە : بەگزادەیەکی وەڵەدبەگیی لـە طەرەفی حەیدەربەگی باپیری مەحموودخانی مـەریوانـەوە ئەکـوژرێ • حەیدەربەگ رائەکا بۆ ناو هەورامیی • عومووەمی جاف لەشکر ئەبەنە سەر هەورامان‌و نزیکی صەد کەس لە هـەورامیی ئەکـوژن‌و ئەحمـەد بـەگی باسام‌بەگ کە رەئیسی هەورامی ئەبێ ئەکوژرێ • وە ئەم شەڕە مەشهوورە بە (شەڕی چەمی شامیان)و ، لە تەئریخی هەورامی‌دا موفەصەلەن ئەم شەڕە نووسراوە ، چونکە لە حەوتصەدسـاڵ لەمـەوبـەرەوە هـەورامـی‌یەکـان تەئرێخێکی خوصووصیی خۆیان هەیەو ، ئیمڕۆش باقییە ، وە لە هەورامانی تەختە کە پێی ئەڵێن (پیرڕۆستەم) •

لەم نەوعانە زۆرە بینووسم لەبەر توولپێدان صەرفی نەظەرم لێ‌کردن‌و خاتیمەم بەم تەئریخەدا •

وصلی الله علی سیدنا محمد واله وصحبه وسلم تسلیما کثیرا

ئەگەرچی خاتیمەم بە تەئریخەکە داوە ئەمما کە بیرم کردەوە لە جافی ئیرانو جافی داخلی عیراق پێنج طایفەم داخل نەکردوەو ، چوار طایفەیان داخلی خاکی ئێرانەو ، یەکێکیان داخلی عێراقەو لە ژێرەوە عەدەدی ماڵ . عەدەدی سوارەو پیادەیان لەگەڵ ئیسمی گەورەی طیفەکەیانو ، جێگەی زووسانو هاوینیان موافیقی ئەم جەدوەلە یە[٢٠] .

| جێگەی هاوین | جێگەی زستان | ئیسمی گەورە | عەدەدی پیادە | عەدەدی سوارە | عەدەدی ماڵ | ئیسمی طایفە |
|---|---|---|---|---|---|---|
| نیشوو دەشتی کرن | زەهاو | وەیس مراد | ١٠٠ | ١٠٠ | ٤٠٠ | گرگ کوڕلی و وردە گرگ کوڕلی |
| نەی لەك | زەهاو | سامراد سرلك | ١٥٠ | ٦٠ | ٣٠٠ | قەڵمانچەك |
| هەفتکانی و گلەزەرد | تەنگی حمام | کریمی مرادخان | ٤٠ | ٩٠ | ١٠٠ | نەی لەکی لە جافی عێراق دانیشتوون |
| | | کوێخا حەمە ئەمین و کوێخا سعیدی و جاسم و سایرە | ٨٠٠ | ٣٠٠ | ٢٠٠٠ | جافی ڕەشکە لە سەروو طاش و سیدەر و شارستێن و ئەو ناوە دانیشتوون |

(٢٠) بە داخەوە ئەم لا پەڕەی دوایی‌یە دڕاوە و بەشێکی لیستەکە تێدا چوە ، بۆیە وەك سەرەوە پە نیوەچڵیی نووسرا .

## پاشبەند

بەشی زۆری فۆرمەکانی ئەم کتێبە چاپ بووبوو ئەم هەواڵەم لە ژمارە (٣٣٧)ی (١٠)ی مانگی سەفەری ١٢٩٠ی‌ك [٩/٤/١٨٧٣ی‌ز]ی ڕۆژ نامەی (زەورا)دا دی دەربارەی کۆچی حەمەپاشای جاف بۆ ئێرانو ، دەستێوەردانی حوکوومەتی عوثمانیی لە کاروباری تیرەکانی جافدا بۆ قازانجی خۆی ، جێگەی سوودو بایەخە، بۆیە لێرەدا بەکوردیی دەیخەینە روو .

ح ، ج

بەرگوێمان کەوتووە کەوا سەرەکەکانی هەردوو تیرەی ( شاتری)و (هاروونی) لە هۆزی جاف هاتوون بۆ مەڵبەندەکانی حوکوومەت بۆ سوپاسگوزاریی تایبەتی بەرانبەر بەو یارمەتیو هەڵوێردنەی لە چاکەی شاهانەوە پێیان گەیشتووەو ، بینا لەسەر ئەوەی کە داوایان کردووە کە لەمەولا ڕاستەوخۆ موراجەعەت بە حوکوومەت ئەکەنو با لەمەولا مامەڵە لەگەڵ ئەوانیش وەك مامەڵەی هەموو ڕەعیەتی‌تر بێ ، ئەم داوایەیان لەم‌بارەوە پەسەند کراوە . جا بۆئەوەی کاروباری ئەم دوو تیرەیەو دەربڕینی خوسووسیەتی خۆیانو کۆکردنەوەی زەکاتی ئاژەڵیان بەئاگاداریی موتەسەڕیفو قایمقامەکانی ئەو شوێنانە بێ کە ئەمانەیان لێن ، فەرمانی پێویست نووسراوە بۆ موتەسەڕیفیەتی شارەزوورو سلێمانیو ، فەرمانیش درا بە سەرەکەکانی هەردوو تیرەو زانی‌یان کە شاهی مەزن چ یارمەتیو چاودێری‌یەکی کردوونو سوپاسی ئەم مامەڵەو بانگ‌کرانەیان کرد کە ڕاستەوخۆ موراجەعەتی حوکوومەت بکەنو مامەڵەیان وەك خەڵکی‌تر لەگەڵ بکرێ . لەکاتێکدا کە زەوی‌وزار بۆ نیشتەجێکردنی جاف بەخۆڕایی دەدرا ، سەرەکەکانی ئەم دوو تیرەیە گفتیان‌دا کە لە بەرانبەری ئەو زەوی‌وزارەدا پێیان ئەسپێررێ ، شتێ بە گەنجینەی دەوڵەت پێشکەش بکەن . ئەم حاڵەتانە بەشێکن لە نیشانەی دیارو ئاشکرای دادپەروەریی پیرۆزی شاهانە کە هەموو رەعیەتو خەڵکی خوای گرتۆتەوە . کاربەدەستی تایبەتی‌یش دانرا بۆ پێشاندانی ئەو شوێنانەی پێویستن بۆ کشتوکاڵ تێدا کردنی ئەم ناوبراوانەو لە چوارچێوی دانی سەنەدی تاپۆدا بە هەرکەس بە ناوی خۆیەوە .

# ناوەرۆك

| بابەت | لاپەڕە |
|---|---|


رقم الإيداع في دار الكتب والوثائق

ببغـداد ٢٩٤ لسنــة ١٩٩٥